# رۆڵی عەلمانیەت لەدروست بوونی

# مەینەتی کورد

مەسعود عبدالخالق





دووەم چاپ
هەولێر ٢٠١٢

## ناسنامەی کتێب


| | |
|---|---|
| ناو : | رۆڵی عەلمانیەت لەدروست بونی مەینەتی کورد. |
| بابەت | لێکۆلینەوە. |
| نووسەر: | مسعود عبدالخالق. |
| وەرگێر : | |
| پێداچوونەوە : | د.عیمان علی |
| کاری کۆمپیوتەر: | نووسینگەی MOM - ٢٦٤٨٩٠٧ /٠٦٦ N. |
| پاك نوسکردن : | نوسەر. |
| چاپخانە : | رۆژ هەلات. |
| چاپ: | دووەم/ ٢٠١٢. |
| تیراژ: | ٢٠٠٠ دانە. |
| بەرهەم | ﴿١١٣﴾. |
| نرخ : | ٤٠٠٠ دینار. |
| بۆ: فرۆشتن و بلاوکردنەوە : | M / ٠٧٥٠٤٦٧١٣٩٤. |
| بۆ: هونەرکاری وچاپکردن : | M / ٠٧٥٠١١٨١٩١٩. |
| مافی چاپ: | یاسایی هەموو شێوازێکی پارێزراوە. |

لە بەرێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی ( ٧٦٨ )ی سالی ( ٢٠١١ )ی پێدراوە.




# رۆڵی عەلمانیەت لەدروست بونی

# مەینەتی کورد

نوسینی :مسعودعبدالخالق          پێداچونەوە: د.عثمان علی

ئیمێل و ژمارەی مۆبایل: abdkaliq@yahoo.com ،٠٧٥٠٤٤٩٩٠٤٢

دووەم چاپ

هەولێر ٢٠١٢

# پێشەکی سەنتەر(١)

شێوەی لەدایك بوونی هەر بیردۆزو بیرۆکەو ڕێبازێك گرنکە بۆ گەشە و بلاوبوونەوەو سەرکەوتنی، بیرۆکەی عەلمانیەت بەسەلبی وئیجابییەوە لەڕووی تیۆری و جێبەجێکردنەوە لەلایەن زۆر دام دەزگاو کتێب باسی لێوەکراوە، بەلام هیچ کامیان وەکو نووسەری ئەم کتێبە نەهاتووە باس لە ڕەگ و ڕیشەو هۆکارە ڕاستەقینەکانی دروست بوون و بلاوبوتەوەی بیری عەلمانیەت بکات بەتایبەتی کاریگەریەکانی لەسەر مەینەتی کوردیەوە.

سەرەتای بیری عەلمانیەت لەکوێ هات؟ هۆکارە ڕێخۆشکەرەکان چی بوون بۆ هاتن و بلاوبوونەوەی؟ کێ بوون یەکەم جارئەو بیرۆکەیان وەرگرت و کاریان بۆ کرد؟ ئامانج و مەبەستیان چی بوو؟ پاساوی کارەکەیان چی بوو؟ وێکچوون و جیاوازیەکانی ژینگەی ئێمەو ژینکەی سەرەکی بیرۆکەی عەلمانیەت چی یە؟

بەبروای ئێمە گەورەترین خالی لاواز لەم بیرۆکەیە و هەموو بیرۆکەیەکی تری دەستکردی مرۆڤ ئەوەیە دەبێ بیرۆکە هەلقولاوی ناو جەرگەی میللەت و خاك ونەتەوەو ناخی مرۆڤ بێت، تاکو بتوانێت گەشەبکات وببێتە خزمەت. ئەوەش بەبیروبڕوایەکی گەردوونی پتەودەکرێت، جگە لەمە هەموو بیرو بۆچوون و فیکرو پێشنیارێکی مرۆڤ وابەستەو سنووردارن بەتواناو حەزو پێداویستییە کاتی و ناوچەیی تەسك کەلێی سەرهەلدەدەن.

خالێکی تری لاوازی ئەم بیرۆکەیە لەوەوە دەردەکەوێت کە نەیتوانیوە لە سەرەتای سەرهەلدانیەوە ئامانج و مەبەستی ڕاستەقینەی بەبەرگی ئاشکرای خۆی پێشان بدا، خۆی وەك خۆی پێناسە بکات.ئەوەش هۆکارێکی سەرەکی بوورە لەدرێژکردنەوەو بگرە بەلاڕێدابردنی کێشەو ململانێکانیش. هەروەها وای لە میللەتی کورد کردوە کە لە ناوەرۆکی چارەسەریەکە تێنەگات تاکو بتوانی بەشێوەیەکی دروست چارەسەری بۆ دابڕێژی.

چونکە بنەچەی بیری عەلمانیەت لەنیو خاك و میللەتێکی جیاواز لە کوردستان سەری هەلّداوە. ئاساییەلەجیاتی ببێتە چارەسەرو دەرمان بۆ کێشەو گرفتەکانی ئەو خاك و میللەتە.ببێتە هۆکاری دەردو مەینەتی و بگرە کارەساتیش بۆمان.

ئەم کتێبە بەشێوەیەکی بابەتیانەو لە ڕوانگەی لێکدانەوەی ئەکادیمی و بەلگەنامەیی ڕووداوە مێژووییەکان و شێوازی بەدوای یەکداهاتنی ڕووداوەکان باس لە ڕۆلّی عەلمانیەت دەکات لەدروست بوونی مەینەتیەکانی کورد. ئەم شێوازە نوێیە لەباسکردنی عەلمانیەت و بەو شێوە ڕاشکاوی یە پەردەلادان لەسەری، چونکە لەناوکوردواباوە کەئیسلام سەرچاوەی ئەومەینەتیە بێت،لەهەمانکاتدا سەلبیاتی سولتانی سەردەمی خۆی و وولاتانی ئیسلامی ئەو سەردەمەش وەك خۆی باس بکا،تەقەلاشی داوە ماندووبوونی عەلمانیە کوردەکانیش بنرخێنیّ وچوارچێوەیەکی لێك نزیك بوونەوەی بۆ هەمو لایەك دروست کردوەبەبڕوای ئێمە زۆر کەس دێنێتە وەلام و قسەو گفتوگۆ .وەهەموو وەلام و قسەیەکیش لەسەر ئەم باسە، بابەتەکە دەولّەمەندتر و ئەنجامەکەی ئاشکرا تر دەکات.

پڕۆژەی تیشك

## چاپی دووەم

## بەناوی خودا

دوای ئەوەی کتێبی (ڕۆڵی عەلمانیەت.......) کەوتە بازاڕ دەرکەوت خوێنەرێکی زۆری بۆ پەیدابوو و لە بازاڕ نەما، پەرتووکخانەی حاجی قادری کۆیی وەك چەند جارەی پێشووشی لە سۆنگەی دڵسۆزی بۆ ووشەی جوانی کوردی و وەك ئەرکێکی ئاینی و نیشتمانی داوای کرد ئەرکی چاپی دووەم بە دابەشکردنەوە لە ئەستۆی خۆی بگرێت، هەندێ هەڵلەی بچوکی ناوەڕۆکی و هونەری تێدا بوو هەڵسان بە چاککردنی، ئێمەش زانیمان مەبستیان خزمەت کردنی زانست و زانیاریە بە سوپاسەوە بەبێ مەرج پێمان بەخشین، بە هیواین سەرکەوتوو بن، زۆر سوپاسی تری دەزگای تری دڵسۆز دەکەین کە ئەوانیش ئامادەیی خۆیان دەربڕی بۆ چاپ.

## پێشەکی پێداچوونەوە(٢)

ئەو توێژینەوە وەك هەمو توێژینەوەیەك بێ کەم وکوڕی نیە،بەلام بەلای بابەتی زۆر گرنگ ودەگمەن بە بویرانەو زانستیانە چوە، توانیویەتی تیروانینە چارەنوس وقولەکانی میژوو بگۆری کە کاریگەری راستەوخۆی لەسەر سیاسەتی بالای ئیستای کورد هەیە، وای دەبینم ئەو کتێبە شۆرش وئاسۆیەکی نوێ وفراوان بەسەرپرۆگرامی خوێندن ومیژوونوسە کوردەکان دەکاتەوە، نوسەر لەبارەی منهجی توێژیینەوەکەی دەڵێت:" تەقەلاَ دەدەین بەپێی توانا وەك خۆی باسی ئەو مێژووە بکەین، زیاتر شێوازێکی ئەکادیمی وەرگرێ نەك سیاسی، بوێە تاڕادەیەکی زۆر پالپشت دەکەینە سەر دیکۆمێنتەکانی بەریتانی وفرنسی و رووسی و عوسمانی و کتێب و سەرچاوە بێلایەنەکان، هەروەها بۆ ئەو مەبەستەش لەسالَی (١٩٩٣) وە ئێمە بەردەوام وەکو توێژینەوەی مەیدانی هەموو ئەو خەلکانەی کەمێك وشیارن و بەتەمەنن دەیان دوێنین وەك (شایەدك نەسەر مێژووی کورد) زانیاری زۆرمان لێ وەرگرتوون، ئەو توێژینەوە مەیدانیانە هەر سێ کوردستانی گرتوتەوە، خواروو و رۆژهەلات و سەروو، زانیاری هەردزۆرمان لەکوردستانی سەروو لە بەتەمەنەکان وەرگرتووە کە تا ئێستا ئەو زانیاریانە بلأونەکرایتەوە،".

لەگەل ئەوەی نوسەر پالپشتیەکی مەیدانی زۆری نەکردوە،بەلام سودێکی زۆری لە بەلگەنامەو توێژینەوەی جیاجیاو زمانی جیاجیا وەرگرتوە،لەهەمان کاتیشدا لەگەلی نیم کە دلی توێەرەکوردەکان بە هەلەدا چوینە کاتی بە منهجێکی عەلمانی پەتی بۆ مێژووی کورد چوینە،کێشە لەوە نەبوە بەلکو ملکەچی بۆ منهجی مەرکەزیەتی توێینەوەی رۆژئاوایی سەرچاوەی کێشەی منهجی توێژینەوەی مێژووی کوردە، لەدەستپێکی باسەکەی توێژەر ٣ هۆی بۆ ئەو توێینەوە کردوە:

١).. ئاواش مێژوو و کەلتور ومیرات وفەرهەنگیش قۆرخ بکرێ و لە خزمەتی پرۆژەی نەتەوەیی عەرەبی بخرێ، ئەوانە هەلساون پرۆژە لاوازە نەتەودییەکەیان بە شارستانیەتی زەبەلاحی ئیسلام دەولەمەند کردوە، بەو شێوەیە مێژووی ئیسلامیان تێك شێواندوەو بە زەحمەت بۆ خەلکی سادە ڕاستیەکان دەدۆزرێتەوە، کوردیش کە لەو میراتە

بێ بەش کرا نەشیتوانی بۆ خۆی مێژووی خۆی بنوسێتەوە، نەك وەك ئەوانی تر، بەڵکو وەك راستیەکەش بۆی نەنوسرایەوە، هەڵساوە خۆی زیاتر بێبەش کردوە

٢ ) ئەوەی ئەمرۆ بەسەرنجەوە تەماشای پرۆگرامی خوێندنی کوردی و میتۆدی نوسینەوەی مێژووی کورد لەلایەن مێژونوسان و سیاسەتمەدارانی کوردبکا، بەو روانگە سەقەتەی عەلمانیەت، بەتایبەتی لەو دەمە لەدوای سەدەیەك لەو ئەزمونە لەنگەی (نوسینەوەی مێژوو) تازە ئێمەی کورد بەبێ بەرنامەو پلانی زانستی دەستیان بە نوسینەوە کردوە، لەژێر رەوشێکی سیاسی و فیکری نادروست، لەو دەمە کە ولاتان نوقومی گەندەڵی و خۆویستی و دوولەتی و دوڕویی بووە لەپێناو بەرژەوەندی مادی، دەبێ چ جۆرە نوسینەوەیەك بۆ مێژوو بکرێ...

٣) (کورد هەزاران ساڵە دەچەوسێتەوە)، ئیتر باسی تەنها لای شکستەکانی کورد دەکەن، کەمتر باس لە دەسەلآت و لایەنە گەشەکانی کورد دەکەن، ...

نوسەر تویژینەوەکەی کردۆتە پێنج تەودر:

بەشی یەکەم: مێژووی سیاسی کورد،

بەشی دووەم: کوردایەتی ومەینەتی کورد،

بەشی سێیەم: لەمەینەتیەکەوە بۆ مەینەتیەکی تر-باشوری کوردستان و دروست بوونی دەولەتی عیراق،

بەشی چوارەم: هۆی ڕاستەقینەی بە دەولەت نەبوونی کورد،

بەشی پینجەم: دەروازەکانی رزگاری کوردستان.

**نوسەر بەوە دەست پێ دەکا کە مەینەتی کورد تەمەنی قوول نیە لەدوای داڕووخانی خەلافەتی عوسمانی دیت، ئینجا کوردستان بوویتە گۆرەپانی تاقیکردنەوەی سوپایە داگیر کەرەکان، پێشووتر خاوەنی میرنشین وکیان ودەولەت بوە، پارچەپارچەش نەبوەو وای بۆ دەچێ کە دەگەنە ئەنجام، لیدانی شۆرشەکانی کوردی شیخ سعید وشیخ سلام وشیخ محمود لەلایەن داگیرکەرانی نوێ لەبیرێکی تەسکی ناشیۆنالیزمی ئەو جۆرە ولاتانەو عەلمانیەتیکی توندرەو دیت، کە زادەی عەلمانیەتیکی رۆژئاوایە ئالیرەدا عەلمانیەتی کوردی لەدوولاوە توشی ناکۆکی دەکا، لەلایەکی تریش وای دەردەخا کە چارەنوسی بزوتنەوەی**

کوردایەتی لەگەل بەرژەوەندی ئیمپریالیزم وئیسرائیل ناگونجیّ، لەسەر ئەو بنچینەیە نوسەر دەلیت:

ئەو لایەنانەی بەرپرسیاری بوون لەدروست کردنی مەینەتی کورد بریتی بوون لە غەلمانیەتی جهانی (بەریتانیا، فرنسا، رووسیا..) عەلمانیەتی ئیقلیمی (بزووتنەوەی نتحاد الترقي و کمالي..) تارادەیەکیش بزوتنەوەی شریفی، ئینجا عەلمانیەتی کورد کە بەو دوولایە هەلخەلەتان.

واتە گەلانی ناوچەکە لەعەرەب و تورك و... خودی دەولەتی عوسمانیش بەرپرسیارنین نە دروستبوونی مەینەتی کور

لەوبارەیەوەنوسەر لەکۆتایی تەوەرەکانی بەوشێوەیە پوختەی دەکا:

هەلبەتە بەرِوونی دەردەکەویّ کەکورد لە وەرچەرخانی خەلافەت بۆعەلمانیەت زەرەرمەندی هەرە گەورەیە، زیاتر لەوەش تا ناوچەکە هەنگاوی زیاتر نا لە: مەلەکی بۆکۆماری، بۆمەدەنیەت، بۆدەستوریەت، بۆمۆدیرنیەت.. مەینەتی کورد زیارتر بوو، یان بەواتایەکی تر ئەو نەخشە نوێیەی عەلمانیەت لەناوچەکە جیّ گیرتر دەبوو مەینەتی کورد تۆکمە تردەبوو،..

لەتەوەری چوارەم هاتۆتە سەر هۆیەکتنی بە دەولەت نەبوونی کوردو دەیگێرِێتەوە بۆ عەلمانیەتی تورکی وعەرەبی وولاتانی ئۆروپی وئەو تاوانەی لە ئیسلام وموسلمانان دوور دەخاتەوە ،لەتەوەری پێنجەم هاتۆتە سەر ئەو نهێنی ومەتەلەی کەدەولەتی کوردی تیا ژێر کلّ کرا،دەیگێرِێتەوە بۆ رِێکەوتنامەو پیلانی هەمەلایەن نەك نائامادەیی کورد،لەوپیلان وکۆنگرانەش وەك لە سایکس پیکۆو لۆزان دەردەکەویّ سەرباری وولاتانی ناوچەکە هەردوولای رۆژهەلات ورۆئاوا دەستیان لەو مەینەتیە هەبوە ،لەوەوە تیۆرێکی سیاسی-نیشتمانی نویّ دادەرِێژی بۆ (دەرباز) وتەوژمی ئیسلامی وعاملی ئاینی لەناوچەکە بە رزگارکەروهاوپەیمان دەبینی ،ناشیشارتەوە کەلەنیو تەوژمی ئیسلامیش رِەهەندی شۆڤینی وسەلبیاتی ترسناك هەیە ،لەوبارەیەوە نوسیویەتی:

ئەوەی زۆر زەقە ئەوەیە وەك پێویست ئەو لایەنانە بەهانای میللەتی کورد نەهاتوون، هەر چەندە خۆیان بەشدار نەبووینە لەوتاوانانە، زیاتر حزبێکی عەلمانی وەك بەعس و دامو

دەزگای سیاسی تری عەرەبی شۆڤێنی پاڵپشتیان کردوون، بەلاّم لەچاو دادگەری ئیسلام هەڵوێستی بزووتنەوە ئیسلامی وزانایانی ئاینی (بەتایبەتی عەرەب) لاواز بوو

لەوەش لێی جیام کە عەلمانیەتی بەوشێوەیە ڕەت کردۆتەوەو هەمو تاوانی مەینەتی کوردی خستۆتە ئەستۆی ئەوان،چوارچێوەیەکی حەوانەوەی بۆ هەردوولای ئاینی وعەلمانی دانەناوە،لەسەرەتای سەدەی ٢٠ وەدەستپێکی کوردایەتی توێژێکی ڕوشەنبیری کورد لەهەول وتەقەلادایە بۆ خزمەتی کورد،ئەوکوردایەتیە لە ناوەڕاستی سەدەی ١٩دشەوە لەلایەن زاناوشێخەکانمان دەستی پێکردوە،لەگەل هاتنی ئیتحادولتەرەقی لەسالی ١٩٠٨ەوە بەشێك لەوڕەوشەنبیرانەی کوردی ناشیۆنالیزمی(عەلمانی) لە ئەستنبۆل وبەغداو سلیمانی هەولیان بۆ کورد داوە، واتە ئیسلامی وعەلمانی هەردوولاهەولیان داوە،بەلام لەو کاتیەوە ئەومشت ومڕەلەنیوان هەردوولا تائەوساتەش دروست بوە ئاخۆ چ ئایدیۆلۆژیەك گونجاوە بۆ کوردایەتی،لەسەرەتای سەدەی بیستەم ئەو مشت ومڕە شێوازی تری وەرگرت و جۆرێك لەدوو بالّی لیّ خەملی ،سەرەڕای ئەوەش هەر هاریکاری وپێکەوەبیان لە نێوان هەبوە،لیرەدا نوسەر پێی وایە ئەو مشتو مرە توند تر دەبیّ مادام تەیاری ئاینی لەناوچەکە کاریگەردەبیّ لەسەر چارەنوسی کورد،بەتایبەتی لەبارودۆخی نوێدا دەبینین ئیسلامی عەەب وتورك وفارس ئیسلامیەکەو نیشتمانیەکە تێکەل کردوە،کاتی ئەوەهاتوە عەلمانی کورد واز لەپەراویز کردنی ئیسلامی بهینی،بۆ ئەوەی بتوانریّ هەردوولا بەیەکەوەو شان بەشان خزمەتی کوردایەتی بکەن، لەکۆتاییدادەلیم ئەو کتێبە پەڕتووکخانەی کوردی زۆر دەولەمەند دەکا،هیچ نوسەرو ڕەوشەنبیو توێژەرێك نیە سودی لیّ نەبینی، نوسینێکە زۆر بە سادەیی زمانێکی پالاو نوسرایتەوە.

د. عوسمان أحمد محمد علي،
مامۆستا لە مێژووی هاوچەرخ (کۆلیجی ئاداب–زانکۆی سلاحەدین)

## پێشەکی نوسەر (٣)

ئەوەی زیاتر هانی داین بەلای وەها پرۆژەیەك دا بچین ئەو خالآنەی خوارەوەیە:

١-بلآو کردنەوەی زانیاری وڕاست کردنەوەی تێگەیشتن وچەمکەکان. چونکەتەنها عەرەب وعەجەم بە هەلە لە مێژووی کورد نەگەیشتون بەلکو زۆربەی خودی کوردیش ئەو دەردەی هەیە.

٢- بۆ بینا کردنەوەی تاکی کوردستانی وبەرگە گرتنی لە بەرامبەر خۆشی وناخۆشی.

٣- بۆ دەست نیشان کردنێکی دادگەرانەی دۆست وناحەز ودۆزینەوەی ریبازێکی دروست بۆ ڕزگاری

٤- بۆ ئەوەی ئەو چەوساندنەوە نەبتە کاردانەوەی بەرپا کردنی دەمارگیری وچاندنی رِق وقینە لە میلەتانی برامان

٥- زۆر بە ووردی تێبینیمان کرد کێشەی بە هەلە تێگەیشتن لە مێژووبوویتە سەرچاوەی کۆمەلێك دەردی تری زانیاری وسۆسیۆلۆژی ودەروونی و.. ئەودش بەدەوری خۆی بوویتە کاریگەر لەسەر تاکی کورد کەسێتیەکی لەرزۆکی لێ دروست بێت، ئینتمای لاواز بێت ، بەهەموو کزە بایەك لار بێتەوە،.. بە ئاسانی لە ئینتمای فەرهەنگی وشارستانی رەسەنی خۆی هەلوەشێتەوە،هەر لەو سۆنگەشەوە دەبینین شەپۆلەکانی تەبشیریو لائیکی و مارکسی لە نێو هەندێ گەنج رەوشەنبیری کورد بە ئاسانی ئەنجام بدرێت.

٦- ویستومانە کەنالێکی تێکگەیشتنی ڕاشکاوانەو ڕاستەقینە لە نێوان کوردستانی خۆ بە خۆو میلەتانی ناوچەکە دروست بێت دوور لە رِق وقینە کە لە ئەنجامی ئەو تێك نەگەیشتنە وزالّی لایەك بەسەر لایەك دروست دەبێ،بۆیە ئەگەر زۆر بە ووردی لەو مەبەستەمان نەگەن ئەوا لەسەرەتا وا دەردەکەوێ کە ئەو نوسینە بێ لایەن نیە و جۆرە دەمارگیریەکی تێدا بێت.

## دەروازەی کوردۆلۆژی

لەدوای شکستی عوسمانی لـە جـەنگی جیهـانی یەکـەم ١٩١٤-١٩١٨ دوایـش کۆتـایی هێنانی بەیەکجاری بە پشتیوانی ڕۆژئاواوە، دەوڵەتی نەتەوەیی لە ناوچەکە سەری هەڵـدا، هەریەکە هەڵسـان بە دووبارە داڕشتنەوەی مێژووی ناوچەکە لەسـەر بنـچینەی نەتـەوەیی، هەر لایە تەقەلایدا چۆن میراتی خیلافەتی ئیسلامی دابەشکرا، ئاواش مێژوو و کـەلتور و فەرهەنگیش قۆرخ بکرێ و لە خزمەتی پرۆژە نەتەوەییەکەی، ئەوانە هەڵساون پرۆژە لاوازە نەتەوەییەکەیان بە شارستانیەتی زەبەلاحی ئیـسلام دەوڵەمەنـدکردوە، بـەو شـێوەیە ئـەو مێژووەیان تێك شێواندوەو بە زەحمەت بۆ خەڵکی سادە ڕاستیەکان دەدۆزرێتەوە، کـوردیش کە لەو میراتە بێ بەشکرا نەشیتوانی بۆ خۆی مێژووی خۆی بنوسێتەوە، نەك وەك ئـەوانی تر، بەڵکو وەك ڕاستیەکەش بۆی نەنوسرایەوە، هەڵساوە خۆی زیاتر بێبەشـکردوە، ئـەوەی ئەمڕۆ بەسەرنجەوە تەماشای پرۆگرامی خوێندنی کوردی و میـتۆدی نوسـینەوەی مێـژووی کورد لەلایەن مێژونوسان و سیاسەتمەدارانی کوردبکا، بەو ڕوانگە سـەقەتەی عەلمانیـەت، بەتایبەتی لەو دەمە لەدوای سەدەیەك لەو ئەزمونە لەنگـەی (نوسـینەوەی مێـژوو) تـازە ئێمەی کورد بەبێ بەرنامەو پلانی زانستی دەستیان بە نوسینەوە کردوە، لەژێر ڕەوشـێکی سیاسی و فیکری نادروسـت، لـەو دەمـە کـە ولاتـان نوقـومی گەنـدەڵێ و خۆویـستی و دوولەتی و دوڕویی بووە لەپێناو بەرژەوەندی مادی، دەبێ چ جۆرە نوسینەوەیەك بۆ مێژوو بکرێ، بۆیە زۆر ئاساییە لە زەردری خۆمان بـێ، هـەر توێـژەرێك بـەوردی ئـەو تەقەلایـە لەقەپان بدا بۆی دەردەکەوێ نوسینەوەی مێـژووی کـورد و تێڕوانینـی نـوێی ڕۆشـنبیرانی کورد بۆ مێژووی کورد لە فەوزا دایەو سەنتڕیالی نیە، ئەگەر بـۆ خـەڵکی تـر بـەو شـێوە هەنگاو بنێت بۆ خەڵکی کوردستان هەرگیز نابێ، چونکە ئێمە لـە قۆنـاغی ڕزگاریـداین، بەجێماوین، واتە: پێویستمان بە پەیام و لێخوڕین هەیە تا بگەین بە کاروان، لەو زەلکـاوە دەرباز بین، پێویستمان بە ڕێنمایی وکۆکردنەوەو ڕاپەڕاندن هەیە، ئەوەش پێویست دەکـات هەمو بەشەکانی چالاکیمان لە بوارەکانی سیاسی و کۆمەلایەتی و یاسایی و مـەعریفی و فیکری و فەرهەنگی و شارستانی و تەعلیمیان یەکخەین لەپێناو ئـەو پـەیام و ڕزگاریـە،

دیسان ئەوەش پێویست بەدیاریکردنی سەنتەر و چەق دەکا وەك ژێرخانێك، تا باقی سەرخانەکانی تر لەسەر ئەو بنچینەیە دابڕێژین، هەروەك چۆن یەکەم جار دەبێ چەقی بازنە دیاریبکەین ئینجا دەتوانین (لەسەر بنچینەی ئەو چەقە) تیرەو نیوەترەو چیوەو ژێ و لێکەوت بۆ ئەو بازنەیە بکێشین.. ئاواش یەکەم جار پێویستە چەقی کوردایەتی، کە دەکاتە بنەماکانی ئاسایشی نەتەوەیی دابڕێژین، وەك ژێرخانی سیستەمی سیاسی کوردستان ئینجا چالاکیەکان و سیستەمەکانی ئابوری و ئیداری و یاسایی و کۆمەلأیەتی و فیکری و مەعریفی لەسەر دیاری بکەین، پلان و پڕۆژەو ستراتیژیان لە هەمو بوارەکان دیاری بکەین.. هەر لەسەر ئەو بنچینەیەش پێویستە بنوارینە مێژووی خۆمان.

مێژوو غەدری لێکردووین یان وا غەدر لە مێژوو دەکەین، جێی سەرسوڕمانە ئەوەی ئێستا دەکرێ بە حیساب بۆ پتەوی نەتەوایەتیە، کەچی ڕێك پێچەوانەیە، خۆ هەمو لایەك دەزانین پتەوی نەتەوایەتی لە پتەوی میژوو وسەرکردەکان وئاین و کەلتورو سەروەری نیشتمانی وزمان دێت، ئەوەی ئێستا لەلایەن ڕۆشەنبیرانی دەسەلأتی کوردی دەکرێ بریتیە لە قیزەونکردنی مێژووی کورد وسەرکردەکانی و ئاینی میلەتی کوردو... هتد، وای لێدەکا جێی شانازی نەبێت، لەکاتێکا دەبینین میلەتانی تر بە پێچەوانە خیانەتی سەرکردەکانیشیان وەردەچەرخێنە شانازی، سەرنج بدە عەرەب ناوی لەو خیانەتە گەورەی (شریف حسین بن علی) سالی ١٩١٦ بە (الثورة العربية الكبرى) !

ئەوەی بە ڕوانگەی ئێستای کوردەوە تەماشای مێژوی کورد و ئەو مەنتوق و ڕێسایانە بکات، وەك: ئێمە هەزاران سالە داگیر و پارچەپارچەکراوین، کورد هەر زولمی لێکراوە، ئیسلام بۆ هەمو لایەك خێربوە تەنها بۆ کورد نەبێ، ئەوە ئەنفالی دووەمەو ئەنفالی یەکەم لە فتوحات بووە، تورك و عەرەب و فارس هەر کوردیان چەوساندۆتەوە... خۆمان نەزان بوینە، سەلأحەدین کوردایەتی نەکردوە، سەرکردەکانی کوردی وەك شێخ ئیدریسی بەدلیسی، مەلای خەتێ، شێخ مەحمود، شێخ عبدالسلام، مەلا مستەفا، عەشایەری و نەزان بووینە...

هەمو ئەوانە دیمەنێك دێنێتە پێش چاوان، کە باب و باپیران و ئەژدادی ئێمە ترسنۆك و ژێردەستەو دیل بووینە، بەپێچەوانەی مێژووی ڕاستەقینەو بەلگەنامەی ڕۆژهەلأتناس و

کتێبە ئیسلامی و بیانیەکان کە باسیان لە کورد کردووە، وەك میللەتێکی ئازاو نەبەرد و پیاو لێبوردەو بەهاناو وڵاتپارێز و بەناوبانگ بووە.. تا ئەو رادەیە لە کتێبە ئیسلامیەکان کورد بە (قورەیشی عەجەم) ناسراوە، لەلای هند ئۆقرەو خۆڕاگری کورد بە ئەستەق دەهێنرێتەوە[1]، لەلای یۆنانی رۆژئاواییەکانیش کوردستان بە گرێی (کۆرتیۆن)ی رۆژهەڵات وەسفکراوە، واتە: گرێ کوێرەیەکە هەرچی نەتوانێ بیکاتەوەو لەگەڵ کورد رێك نەکەوێ ناتوانێ زاڵ بێ بەسەر رۆژهەڵاتی ناوەڕاست، بۆیەش ئەو ئیمپراتۆرانەی وەك ئەسکەندەر و تەیمور و هۆلاکۆ و سوڵتان سەلیم... هاتونە ئەو ناوچەیە هەمیشە لەگەڵ دەسەڵاتی سیاسی و کۆمەڵایەتی کورد رێککەوتوون و نەهاتونە کوردستان وەك داگیرکەر بەدەگمەن نەبێ، باسکردنی ئەو مێژووە وەك خۆی لەخزمەتی کێشەی کورد دایەو بە پێچەوانەش بەخۆڕایی داگیرکەرەکانی ئێستاو بەرپرسانی مەینەتی کورد ساغڵەم دەردەچوێنین، لە کوردستان دوو وەڵامی جیای (پرسی مەینەتی کورد) هەیە، هەریەکە گوزارش لە مەدرەسەیەکی جیا دەکا:

وەڵامی یەکەم پێی وایە لە کۆنەوە چەوسانەوە هەبووە، بەڵام چەوسانەوەی نەتەوەیی نەبووە، هەتا سەرەتای سەدەی بیستەم، بۆیە پێی وایە مەینەتی کورد تەمەنی ئەوەندە زۆر نیەو لەسەدەیەك تێ ناپەڕێ. هەرچی

وەڵامی دووەمە زیاتر عەلمانیەتی کوردەو دەڵێ: کورد هەزاران ساڵە دەچەوسێنەوە، لەسەر ئەو بنچینەیە.

---

* خودی ناوی کورد لە گۆدی(جودی)وەرچەرخا بۆ گورد (بەمانای ئازایەتی)، غورد لە فارسی مانای ئازا، لە (شانامە)ی فردۆسی دەڵێ (رۆستەمی زاڵ)کورد بوە،لە پۆلینی کەسایەتیە بە هێزەکانی مێژووش ڤاسیلی نیکیتین (۳)کەسی لەمێژوو بەکاریگەر هەڵبژاردوە (ئەردەشێر ،صلاح الدین،کریم خانی زەند) ، ئەو بەڵگەنامەیەش زیاترئەوە دەسەلمێنێ

[1] File No .۱۲/۱٤ vol.v۱۱. secret. Kurdish policy- New Delhi .Lndia.

وزارة الداخلية- ١٦شباط/١٩٣٠ مذكرة سري ، رقم ٦٤٦ \سي

....عرف الكرد منذ القدم بقدراتهم القتالية واصبحوا رمزا للمقاتل والفروسية والتي ليس هناك امم تستطيع ان تتبوا الى ما كانوا عليه في هذه الصفات. ان ثبات الكرد وصبرهم اصبحت مثلا يحتذى بها ويذكر حكماء الهند..

...وزردشت معروف بتوله حكم الكرد وحرية العالم. قلد الشاهات في ايران والخانات والفراعنة الكرد في النظام الاداري التي اقاموها في بلدانهم. قهر الكرد في ديارهم الغزاة من اليونانيين والسلجوق والروصان والمغول.وفي عهد زينفون عرف كردستان فوق السماء بكونه بلاد الازهار والفردوس الارضي وحضارته المزدهرة

سەرۆکی فەرەنسا لە وەڵامی پرسیارێك (ئاخۆ تاکەی کورد هەروا مەغدور بن؟) وتی: خۆ ئێمە غەدرمان لەکورد نەکردوە، بەڵکو مێژوو غەدری لێکردوە!، هەریەکێك کەمێك لە زانستی سیاسی و یاسایی بگا دەزانێت ئەو تێگەیشتنەی سەرۆکی فەرەنسا لە بەچەوت نوسینەوەی مێژوو دێت، کە وایان تێگەیاندوە کورد لە مێژوودا هەر چەوساونەتەوە، هەر لەوەوەش مەوسوعەیەکی باڵای وەك(موسوعە العربیە العالمیە) لەمادەی (کورد) دەڵێ ئەوانە لەمیژوودا بێ دەوڵەت بووینە، کیسنجەریش دەڵێ: تراژیدیای کورد میژوو وجوگرافیا دروستیکردوە[2]، هەروەها لەراقەی کێشەی کورد کەلەلایەن وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا هاتوە ودەڵێ: ئەو کوردستانە کۆنە قەد کیانێکی جیاوازی نەبوە[3]، لەراپۆرتێکی تر بۆ کۆنگرێسی ئەمریکی لە ١٩٧٩/١١/٢٩ لە ژێر سەردێری (کوردی هەتیوی نێو دەوڵەتی) ئاوا هاتوەو دەڵێ: کوردەکان چارەرەشی مێژوون لەسەردەمی یۆنانی ومەغۆل وتورك و بەریناتیا هەرداگیرکراون، وا پێشان دەدا هەر داگیرکراوبووبن، لە سوریاش لەلایەن نوسەرێکی بەعسی (محمد تەلەب هلالە) لەبارەی کورد نوسیویەتی: ئەوانە نەتەوەیەکن بەبێ مێژوو وشارستانی وزمتن و..[4]، لەگەل هەزاران نمونەی تری وا، لەو تێگەیشتنە چەوتە هەر داگیرکەر بەرپرسیار نیە، بەڵکو خۆشمان بەنەزانی ئەو فەرمایشتە دەڵێینەوە، ئیتر ئەگەر وابێ کەواتە:

١ ـ دیارنیە کێ بەرپرسە لە مەینەتی کورد.

٢ ـ دیارنیە کەی کورد کەوتۆتە مەینەتی.

٣ ـ مافەکانیشمان دیارنیە لای کێیە.

٤ ـ ئەو شۆرش و جموجۆلەی داوای ئازادی و رزگاری کوردستان بێ مانـاو عەبەسیە، مادام مافخۆر و داگیرکەر و دابەشکەری کوردستان دیاری نەبێ.

---

[2] ـ کوردو کوردستان لە بەلگەنامەکانی ئەمریکا ص٣٣

[3] ـ ئەو توێژینەوەی وەزارەتی دەرەوەیە، بە دۆسیەی ژ E٤٣١/مایس/١٩٧٢ دەقەکەی لە (هـ س) ص ٢ بلاو کرایتەوە.

[4] ـ بروانە: اکراد سوریا موعد مع التاریخ ص٨٢

کەواتە ناحەقی (محەمەد موکری) نەبوو کە لـە کانگـەی شۆڕشـدا کتێبێکـی بـەناوی (سەگوەڕ) نوسی بەپێی بۆچـوونە وجودیـە (عەبەسـیەکانی) خـۆی جموجـۆڵ و چـالاکی و شۆڕشی کوردی بە سەگوەڕ لەقەڵەم دابوو[٥]

کەواتە ئێمە ناحەقین و دوژمنانمـان لەسـەر هـەقن، ئێمـەین موشـکیلە نـەك ئـەوان، دەردەکەوێ کە ئەوە قەدەری کوردی وابی و وای بۆ دانراوە هەر ژێردەستە بێت، گوایە ئەو دۆخە ڕەسـەنەو مێژووییە، کەچی هەمو ئەوانە ناڕاستن، کورد لە مێژوو سەروەری نازنـاوی (قورەیشی عەجەم ) هەبوەو (تورکیش بەبێ ئیدراکی) کەواتە مێژوومان زۆر باشبوە بەڵام ئێمە (بەنەزانی) وداگیرکەران (بەزانایی) وێنەیەکی بەهەڵە بۆ مێژوو دروستدەکەین، کورد زیاتر لە میللەتی تر خاوەنی دەسەڵاتی خۆی بووەو کـەمتر داگیرکـراوە، هـیچ میللـەت و خاکێکیش نیە لە مێژووی سەردەمی ئیمبراتۆریات و نەریتی پەلاماری ئەو بۆ ئەم و ئەولا بۆ ئەملاو وەبەر داگیرکاری و تالان و وێرانی نەبووبێ، سەرجەم زیاتر لە (٣٠) جار بەغـدا داگیرکـراوە، بـەنیوەی ئـەو ئەندازەیـەش کوردسـتان داگیرنـەکراوە، سـەرەڕای ئـەوەی داگیرکاریەکانی کوردستانی زۆری نەخایانـدوە، هـەمو داگیرکردنـی کوردسـتان لـەماوەی ١٣٠٠ سالی خیلافەی ئیسلامی بە ئەندازەی چاریەکی سەردەمی عەلمانیـەتی ئـەو ١٠٠ سالە نابێت، بەشی زۆری دەسەڵاتی کوردی خـۆی حـوکمڕانی بوینـە، ئـەوەی زیـاتر ئـەو قەناعەتەی دروستکردوە، هەندێ لە ڕاو بۆچوونە بە(پێوانەیی) باسکراوە، ئەگەر زۆر وورد نەبی وێنەیەکی هەڵەت دەداتێ و وادەردەکەوێ یەکەم جارە لە مێژوو و پێش ئەو هەر ژێر دەستەو چەوساندنەوە بوە، هەندێ نمونە باس دەکەین:

١ ـ کوتلۆف دەڵێت: سیڤەری ١٩٢٠ یەکەمین کۆنگرەی نێـو دەوڵەتیـە، کـە کێـشەی کورد تیایدا بەنیو دەوڵەتی کرا

٢ ـ ئێستاش دەڵێن دەستوری ١٩٥٨ بۆ یەکەم جار تیایدا هاتوە، کـەکوردو عـەرەب هاوبەشن لە عیراق.

---

[٥] لە بنەچەدا لە پرۆتوکۆلی ژ:١٩ی (بروتوکولات حکماو الصهیون) شۆرش بە سەگوەڕ واهاتوە: ان الثورة لیس أکثر مـن نبـاح کلب علی فیل، ففي الحکومة المنظمة تنظیما حسنا من وجهة النظر الاجتماعیة لا من وجهة النظر إلی بولیسـها، ینبح الکلب علی الفیل من غیر أن یحقق قدرته. ولیس علی الفیل الا ان یظهر قدرته بمثل واحد متقن حتی تکف الکلاب عن النباح، وتشرع في البـصبـصة[٤] بأذنابها عنـدما تـری الفیل.

٣ ـ ناوزەد کردنی بەرگری وجەنگی نێوان (میرنشین ودەوڵەتە کوردیەکان) لەگەل داگیر کەران بە (شۆرش)*

٤ ـ گێرانەوەی یەکەم دابەشی کوردستان بۆ چالدێرانی ١٥١٤

٥ ـ باسکردنی کۆتایی سەدەی ١٩ وسەرەتای سەدەی بیست وەك (بزوتنەوەی کوردایەتی مۆدێرن)، چەند نمونەیەك لە کتێبە زۆر نایابەکان هەلدەبژێرین، کە ئەوانیش وەك پرۆگرامی خوێندنی بالای کوردستان عێراق کەوتۆنە ئەو هەڵەیەو هەڵەی تر:

أ ـ کتێبی(دراسات فی الحرکة الکوردیة المعاصرة ـــ د. عثمان علی)، لە سەردەمی شێخ عبیدالله لە کۆتایی سەدەی ١٩ دەست پێ دەکا، ئەوە (حرکە الکوردیە المعاصرە) نیە، بەڵکو ئەوە سەرەتای ئەو بزوتنەوەیە، بە پێی ئەو تێڕوانینە باوە دەبێ بزوتنەوەی کوردایەتی سەدەکانی پێش ١٩ (حرکە الکوردیە القدیمە) بێت، ئەوەش تێڕوانینەك دەداتە خوێنەر کە کورد هەر لە شۆرش و کوردایەتی بوەو لە رزگاری ..کەچی وانیە.

ب ـ کتێبی د کمال مەزهەر (کوردو کوردستان لە بەڵگەنامە نهێنیەکانی حوکمەتی بەریتانیادا) لە ل٢٩٨ دەڵێ: شەریف پاشا لە سالی ١٩١٩هەوڵی داوە کوردستانێکی سەربەخۆ لە هەر سێ پارچەی کوردستانی عیراق وئیران وتورکیا پێك بهێنێ..ئەوەش وانیشان دەدا کە ئەو کاتیش ئەو کوردستانانە دابەشکرابێت وکەوتبێتە ژێر دەستی ئەوانە لەکاتێکا ئەو کاتی نەدابەشکرابوو نە دەوڵەتی عیراقی وتورکی وسوریش هەبووینە.

ج ـ کتێبێك بە ناوی (القضیة الکوردیة فی الصراع البریطانی العراقی ١٩١٨ ١٩٣٢)[٦]، هەر لە عنوانەکەی وای لێ دەخوێندرێتەوە کە مل ملانێ لەنێوان بەریتانیاو دەوڵەتی عیراق لەسەر کوردستان هەبووبێ، لەگەل رێز بۆ ماندووبونیان بەلام ئەوکتێبە لەتەرازووی (ئاسایشی نەتەوەیی کوردستان) کفری ئەکادیمی کردوە، چونکە: یەکەم سالی ١٩٢١ دەوڵەتی عێراقی دروستکراوە.

---

* کتێبی (معضلة کردستان..) - د حکیم مختار هەلدەبژێرین کە نوسەرێکی وردە، کەچی شۆرشەکانی کوردی ناوای رێزکردوە لە ص٤٣ عام ١٧٨٨-انتفاضة عبدالرحمن باشا البابانی کردستان الجنوبیه العراق ، عام١٨١٠حرکه محمد باشا الرواندوزی ...بەو شێوەیەی هەموی رێزکردووتاراپەرینی ١٩٩١ی خوارو، هەلبەتە هەلەی کوشندە ئەوەیە کەی عبدالرحمن پاشا شۆرش و راپەرینە ئەوە دەسەلات بوو خۆی والی دیاریدەکرد لەبەغدا، وادێتە پێش چاوی خوێنەر کە ئەویش داوای ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستان ودیموکراسی بۆ عیراق کردبێ لە بەغدا !!

[٦] ـ ئەوە توێژینەوەیەکی زانستی بۆ وەرگرتنی ماجستێرلەلایەن (عمرمحمدکریم) نوسراوە، بەسەرپەرشتی دحسان الحلاق ، پێداچوونەوەی دکمال مزهر ، لە ٢٠٠٨ لەکوردستان چاپ کراوە.

دوودم باوكی شەرعی دەوڵەتی عیراقی بەریتانیایە نیتر (صراع)ی چی

سێیەم تاسالی ١٩٢٥ بە تۆپ وتەیارەی بەریتانی دژ بەكوردو دیپلۆماسیەتی بەریتانی دژ بە توركیاو فرنسا كوردستان خرا سەر عیراق

چوارەم تا سالی ١٩٣٢هەر بەریتانیا بوە جەیشی عیراقی لەگەل خۆی ڕاپێچاوەو شەڕی دەسەلاتی كوردی كردوە، بۆیە لەناوەڕۆكەكەشی یەك دێری تێدانیە گوزارش لەو (صـراع)ە بكا تەنها ئەوە نەبێ عنوانەكی تیایـە (الـصراع البریطـانی العراقـی والتركـی علـی ولایـة الموصـل ص٢٧٢). واتەبەریتانیاو عیراق لەلایەك بووینەو توركیـاش لەبەرامبـەر، كەواتـە ئەو لیژنەیەی مناقشە چۆن ئـەو عنوانـەیان قـەبوول كـردوە كەلـەناوەرۆك یـەك لاپـەڕەی پالپشت نەبووبێ، چۆن ئەوە بەسەر دكمال تێپەڕیوە

٦ ـ لەولایەش عروبیەكان باس لە عیراق دەكەن وەك ئەوە وابێت عـیراق پـێش ١٩٢١ بەسەدان سال وبەهەزاران سال دەوڵەت بووبێـت، هـەروەها باسـكردنی و یلایـەتی بەغـدا بەناوی عیراق بەتایبەتی لە سیستەمی خوێندنی بالای كوردی[٧]، بۆ نمونە دەووترێ: مدحت پاشای والی عیراق بوو، لەڕاستیدا والی بەغدا بوە، ئـەو كـاتی عـیراق بـونی نـەبو، ئـەو هەلانەی كورد بە نەزانی وئەو هەلانەی عروبی بە زانایی ڕێـك یـەكتر تـەواو دەكـەن، بـۆ ئەوەی وێنەیەكی وەرگەڕاو بدەنە خوێنەری كوردو جیهان، كە كـورد هـەر چەوسـاوەو ژێـر دەستی عەرەب وعیراق بووبێ وهەر خەریكی شورش وراپەڕین بووبێ ..!!

لەوەی (كۆتلۆف)یش وادەردەخا كە تەقەلای كورد بۆ دەوڵەت بون تازەیـە لـە مێـژوو، لەكاتێكا بۆ هەموان تازەیە، ئەی سیڤەر بۆ ولاتـانی عـەرەبیش یەكـەمین كـۆنگرەی نێـو دەوڵەتی نەبوە، یان كە باسی دەستور دەكرێ دەبـێ بگـۆترێ لەوەتـەی عـیراق لـە سـالی ١٩٢١ دروست بوە، ئەگینا لەكام دەستور باسی عەرەب وسوریا و عیراق كراوە تـا باسـی كوردستان بكرێ...

[٧] ـ لەهەموی سەرنج ڕاكێش ترتوێژینەوەیەكی نایابی دكتور خلیل إسماعیل محمد بەناونیشانی(كوردستانیة كركوك في ضل الحقائق التاریخیة - الجغرافیة ) تەقەلای كوردستانی بوونی كەركوكی داوە، كەچی باسی عیراق دەكا وەك لە ٦ سەدە پ ز هەبووبێ!! دەقەكەی: ...(( إلاأن المیدیین استطاعوا في (٦١٢ق. م) من تحریرها. فكان العراق یومئذ مقسما بینهم وبین الكلدان الذین سیطروا علی القسم الجنوبي. ثم خضعت المنطقة إلی نفوذ المقدونیین )).

باس کردنی جەنگی نێوان دەسەڵاتە کوردیەکان لەگەل عوسمانی وسەفەوی وبەریتانی بە ڕاپەڕین وشۆڕش بە ئاسانی وای لێ دەفامرێتەوە کە وەك ئێستاو شۆرشەکانی دوای ١٩٢١ بوو بێت لە ژێر دەسەڵاتی داگیرکەرێك هەڵسابن... نەخێر هەریەك لەوانە چەند سەدەیەك بوو دەسلاتدار بووینە، بۆیە (ناوزەدکردنی شەڕی نێوان دوودەسەڵاتی گەورەی میری سۆران وعوسمانی بە شۆرش وراپەڕین زۆر هەڵەیە)، خەریك بوو میری سۆران لەگەل محمد علی پاشای میسر دەست بە سەر ئەستەنبۆلیش دابگرن...

ئینجا داگیر و دابەشیەکەی ئێستای کوردستان ناگەرێتەوە بۆ جەنگی چالدێرانی ١٥١٤، ئەوکاتەی ئەو دابەشیە لەسەر بنچینەی سەربازی بوو لە کەنداوەوە تا دەریای ڕەش بوو، واتە: هەر کورد دابەش نەبوو و عەرەب و تورك و تورکمان و فارسیش دابەش بون، ڕاستیەکەی ئەوەیە مەینەتی کورد ودابەشیەکەی دەگەرێتەوە بۆ فەترەی ١٩٠٨ تا ساڵی ١٩٢٤ و لایەنە تاوانبارەکانیش دیارن، بریتین لە: فەرەنسا و بەریتانیا و ئەتاتورك و ڕووسیا لەگەل هەلەی کورد خۆشی، دوایش ئەو دەوڵەتانەی لە ناوچەکە دروستبون بەرپرسیاردتی بەردەوامی مەینەتیان دەکەوێتە ئەستۆ، تا ڕادەیەکی زۆریش ئەو جۆرە گوتارە چەوتەی کوردیش بەرپرسە لێی.

**پلانی توێژینەوەکەمان**

تەقەلا دەدەین بەپێی توانا وەك خۆی باسی ئەو مێژووە بکەین، زیاتر شێوازێکی ئەکادیمی وەرگری نەك سیاسی، بۆیە تاڕادەیەکی زۆر پالپشت دەکەینە سەر دیکۆمێنتەکانی بەریتانی وفرنسی و ڕووسی و عوسمانی و کتێب و سەرچاوە بێلایەنەکان، هەروەها بۆ ئەو مەبەستەش لەساڵی (١٩٩٣)وە ئێمە بەردەوام وەکو توێژینەوەی مەیدانی هەمو ئەو خەڵکانەی کەمێك وشیارن و بەتەمەنن دەیان دوێنین وەك (شایەدەك لەسەر مێژووی کورد) زانیاری زۆرمان لێ وەرگرتوون، ئەو توێژینەوە مەیدانیانە هەر سێ کوردستانی گرتۆتەوە، خواروو و ڕۆژهە لات و سەروو، زانیاری هەرەزۆرمان لەکوردستانی سەروو لە بەتەمەنەکان وەرگرتووە کە تا ئێستا ئەو زانیاریانە بلاونەکرایتەوە، وەدەبێ زۆر سوپاسی د.عوسمان عەلی بکەین دیکۆمێنتێکی زۆری بەریتانی بە تەرجەمە کراوی(لەلایەن خۆیەوە) بەتایبەت بۆناردم کە تا ئێستا بلاو نەکرابووەوە بە کوردی.

# بەشی یەکەم

## مێژووی سیاسی کورد

باسکردن لە مێژووی سیاسی هەر میللەتێك ئاسان نیە، چونکە بەشی هەرە زۆری ئەوانەی ئەو مێژووە دەنووسنەوە لەپێناو دەولەمەندکردنی سامانی مێژوویانە، کەمتر گوێ بەقەیدو مەرجی زانستی دەدەن، نمونەیەك لەوانە تەقەلاکانی(د. احمد سوسە)بۆ دۆزینەوەی جێکەوتێك لە قولایی مێژوو بۆ عێراق چی کردوە؟ پێش ٤٠ سال لەمەو بەر (واتە: ٢٣٠پ ز) بابلیەکان نەخشەیەکی جیهانیان بە پێی زانیاری ئەو سەردەم کێشاوەو ناوی بابل وئاشوریان بە پیتی هیموگلۆفی خستۆتە سەر لە ژێر ناوی یەکەم ودوەم[٨]، د. احمد سوسە هەلساوە ئەو ئەدرێسەی بە (اقدم خارطة للعالم توضع فيها العراق) گوزارشکردوە. بەهەمان شێوەش لەکتێبی (الحضارة في العراق ص٣٢١) دەلێت: بعد أن اتمت الجيوش العربية تحرير العراق من الحكم الفارسي أصبح العراق جزءا من الدولة العربية الكبرى، وكانت هذه الدولة قد اسسها الرسول

بەشی زۆری ئەو ولاتانەی کەزیاتر دەمارگیری نەتەوەییان هەیە یاخود ولاتەکەیان ڕەسەن نیە تەقەلایان داوە بناغەیەکی مێژووی سیاسی بۆ بدۆزنەوە، هاتوون هەرچی ڕووداوێك لەسەر ئەو نیشتمانەی ئێستایان ڕوویداوە خۆمالیان کردووە، نموونەی عێراق لە هەموی زەقترە، هەلساون ڕووداوەکان و مێژووی ئاشوری و بابلی و فارسی هیلنیستی.. تا دەگاتە مەملوکی و سەلجوقی و عوسمانیان خستۆتە سەر، لە کتێبی (العراق فی التأريخ) دوو کۆلەگەی مێژوویی گەورەی کردۆتە پالپشت بۆناسنامەو ڕەسەنایەتی عیراق، یەکیان: گیربونی کەشتیەکەی (ح نوح)[٩]ە لە جودی دووەمیان: ئەشکەوتی شانەدەرە کەچی هیچیان پەیوەندی بە عیراق نیە، تەنها ئەوەیە ئەو بۆچونە هەولی داوە وێنەی مێژوو بە پێی واقعی ئێستا بکێشی وهەلە دەردەچی.. ئەوە تەقەلای عروبیەکانە بەرامبەر ئەو

---

[٨]ـ دەقی نەخشەکە لەکۆتایی ئەو نوسینەیە.

٩ـ بەمەست لە پیتی (ح) وشەی حەزرەتە.

میلەتانەی دروستکەری شارستانی ئیسلام بووینە، ئەوانە لە چالاکی سەربازی و سیاسی وزانستی وهونەری بۆ ئیسلامیان کردوە کەچی عروبیە شۆڤینیەکان دەیخەنە سەر ئەرشیفی میژووی عەرەب، زیاتر لەوەش دەیکەنە پالپشتێك بۆ ناسنامەی عەرەبی بۆ عیراق، کەچی ڕاستیەکەی ئەوەیە لەسەردەمی سیستەمی ئیمپراتۆری و پەلامار مەرج نیە نیشتمان و دانیشتوانەکەی پەیوەندیان بەرووداوە سیاسیەکەو عەسکەریەکانی سەر ئەو خاکە هەبێ، مادام پەیوەندی یاسایی و سیاسی لە نێوان نیشتمان و نەتەوەو دەسەلاتی سیاسی نەخەملێبوو، ئەو خەملێنە لە ڕۆژئاوا تا سەرەتای سەدەی (١٩) بەتەواوی دێت، لەرۆژهەلات و جیهانی ئیسلامیش تاسەرەتای سەدەی بیستەم بەتەواوەتی خەملی، بۆیە زۆر ئاسایی بوو دەسەلاتی سیاسی ناوچەیەك ناسنامەی لەگەل ئەو میللەت و نیشتمانە جیابوایە، سۆمەری و ئاشوری و کلدانی و بابلی و فارسی لەگەل زۆرایەتی هەرە زۆری دانیشتوانی ئێستای عێراق جیان، هەرچەندە مێژوونوسە عەرەبەکان بەتایبەتی دکتۆر ئەحمەد سوسە تەقەلای داوە ئەوانە لەسەر عەرەب پۆلین بکات [1]، لەولایەش (عبداللە نۆجەلان) لە کتێبی (من الدولة الكهنة السومرية نحو الحضارة الديمقراطية) ویستویەتی لەسەر کوردیان پۆلین بکا، کەچی نەوەو میراتگری ئەوانە ماون لەو ناوچەیە، نە کوردن و نە عەرەب، ئەو سەردەمی وەك ئێستا نەبووە، ئاسایی بووە دەسەلاتی فارسی لە سەر خاکێك بەدەر لە(مسقط رأس)یان حوکمڕان بێت یان پێچەوانە، بۆیە دەبینین ئەسکەندەری مەقدونی (دامەزرێنەری دەولەتی یۆنانە)و کەچی دەسەلاتی لە بابل بووە، صلاح الدین خەلکی کوردستان بووە دەسەلاتی لە میسرو شام و جەزیرە بووە، تەنانەت پیاوێك بەناوی محمد کوری ڕۆستەم لەدەست فارسەکان ڕایکردە مەغریب لەوێ توانی دەولەتێك دروست بکا یەك سەدە بخایەنێ، بنەمالەی گیان پۆلاکان لەدەست هەندێ میرنشینی کورد ڕوویان کردە ولاتی شام و لوبنان میرنشینێکی بەهێزیان لەوێ دروستکرد ئێستا (جونبلاتەکان نەوەیتیان)، عوسمانیەکانیش لەدەست مەغۆل ولە ناوچەی تۆران(ئاسیا نزیك چین) ڕایانکرد هاتنە ئەنادۆل وئەورپا دەولەتیان دروست کرد، بەم شێوەیە ئەو چالاکیە سیاسی و ئیداری و سەربازی و شارستانیانە مولکی ئەو نیشتمان و ولانە نین، کە بۆیان ماوەتەوە، مەگەر وەك مێژوو و شارستانی و کەلەپور.

---

[1] - دکتۆر احمد سوسة – تاريخ حضارة وادي الرافدين.

هەر بۆیەش دەسەلاتی سیاسی ئەمەوی و عەباسیش (هەرچەندە عەرەبیش بووینە) ناگەرێتەوە بۆئەو عیراقەی ئێستا، چجای دەسەلاتی مەملوکەکان و مەغۆل و تەتەرو فارس و کوردو عوسمانی و... هەمو ئەوانە بە ئەمەویشەوە (بەپێی تەرازووی نیشتمانییەوە) بەداگیرکردن هاتوونە بەغدا، ئەو ناوچەیەی پێیدەوترێت عێراق داگیریان کردوە ئینجا دەسەلاتیان لەسەر دروستکردووە، واتە دەسەلاتەکەیان نەشوونمای نەکردوە بەپێی هەنگاوی سیاسی و یاساییەکانی دەوڵەت دروستبون، ئەوە هەر سەبارەت بە عێراق نەبووە، بەڵکو نەریتێکی جیهانی بووە تا دروستبونی دەوڵەتی هاوچەرخ لەسەرەتای سەدەی ٢٠ هەروابووە.

بۆ ئێمەش کە بەدوای مێژووی سیاسی کورد دەگەرێین هەمان گیروگرفت هەیە، لێرە ناکرێ بڵێین: هەر هیچ پەیوندیەك لە نێوان مێژوو و دەسەلاتی سیاسی کوردو کوردستان نیە، وەك عیراق و سوریا نییە، کورد زیاتر لەوانە دەوڵەمبەندترە، خودی مانای کوردستان ئەو پەیوەندیەی هەڵگرتووە کە بریتیە لە پەیوەندی کورد بە نیشتمانەکەی ئەگەر بەلاوازیش بێ، بەڵام وڵاتێکی وەك عێراق ئەو ناوە کە لە بنەچەدا فارسیە(لە ئەراك هاتووە) گوزارشت لە هیچ پەیوەندیەك لە نێوا ن گەلی ئێستاو ئەو عێراقە ناکا، کوردستان لەپێش سەدەی (١٢)وەك زاراوەیەکی کارگێرِی بەکارهاتووە لێردو لەوێ، لەساڵی ١٣٣٩ز کەوتە سەر نەخشەی ئیبن مستەوفی بۆ یەکەمجار، بە فەرمی لە لەدوای سەدەی ١٧ وەك نەخشەی ئیداری بۆ (٥)ویلایەت ناوی کوردستانی بەرە بەرە لێنرایتەوە، یەکەم وەرچەرخانی بۆ زاراوەیەکە سیاسی لەلایەن شیخ عبیداللە هاتە کایەوە، لە دوای ئنقلابی ١٩٠٨ ودوایش لە دانوستانەکانی سالانی ١٩١٢ تا ١٩٢٠نێوان عوسمانی وکورد بەسیاسیانە بەرجەستە بوو، لەکۆنگرەی سیڤەری١٩٢٠یش بەیاسایی بوو، بەوشێوەیە لەسەرەتای سەدەی بیستەم کوردستان بەجیا لە وڵاتانی ناوچە زووتر مانائیداری و سیاسی و یاسایی خۆی وەرگرت، هەروەها لەسەرەتای سەدەی بیستەم سیاسیانە تەواوی کوردستانی ئێستای گرتۆتەوە، سەرەرای ئەوەش مانای ئەوە نیە هەمو رووداوەکانی سەر ئەو کوردستانە یەکسان بێ بە مێژووی سیاسی کورد، یان بە دیوێکی تری لێکدانەوە: مێژووی کوردستان و مێژووی کورد لێك جیایە، هەروەها مێژووی عێراق و عەرەب لێك جیایە، مێژووی تورك و تورکیاش لێك جیایە.... بەڵام لێك جیابونەکان هەریەکە بە

ئەو شێوەیەکە، بە گشتیەکەی مێژووی کوردستان مانای وایە هەرچی ڕووداوێك لەسەر ئەو خاکە ڕوویدابێ مێژوویەتی، هەرچی مێژووی سیاسی کوردە ئەو مەرجەی تێدا نیە، ئەو وایە ڕووداو لەسەر خاکی کوردستان روویداوە لەسەر ئەو حیساب نیە مادام دەسەڵاتی سیاسی نەبووبێ، یان خاوەنی خۆی نەبووبێ، وەك جەنگ وڕووداوەکانی نێوان عوسمانی و سەفەوی، ڕۆم وفارس وئەرمینیا...، هەرچی مێژووی کوردە بریتیە لەو ڕووداوانەی کە ڕەگەزی کورد بە شداری تێدا هەیە، جاروایە مێژووی سیاسی کورد لەدەرەوەی ئەو سنورەی کوردستانی ئێستاش هەیە، وەك: دەوڵەتی میدیا، ئەیوبی و گیان پۆڵا لەگەڵ میرنشین و دەوڵەتە کوردیەکانیش، کە لە کوردستان دەسەڵاتیان هەبووە، جا لێرە بە دوانی ئەو بەشە مێژووەی دەسەڵاتە سیاسیەکانی کوردو بەرگری کۆمەلایەتی و خێلەکانیش بەڕوونی دیاری بکەین، بەلام بەزەحمەت ئەوانەی بەدەر لە کوردستان بەرزەفت دەکرێ، ئەو بنچینە بە خێرایی سەرە باسێك بۆ ئەو مێژووە دەکەین.

## دەسەلاتی کورد لە پێش ئیسلام:

مێژوویەکی کۆن بە خێرایی: لەلایەن ئاینیەکانەوە ح. ئادەم بە سەرەتای مێژوو دەناسرێ، بە پێی (بدایة والنهایة ـ ابن کثیر) ح ئادەم ڕۆژی هەینی دروست کراوە[11]، یەکەم جار لە لە شاری غوکلاندی هند[12] نەوەکانی بەسەر زەوی دا بلاوبونەوە، هەندیك مێژووی دابەزینی بۆ ٣٥ ـ ٤٠ سەدە پ.ز. دەگێرنەوە، ) یوشر(دەلی ژیان لە ٤٠٠٤ پ.ز. دەستی پێکردووە، هەرچی (لایتفوت)ە دەڵێ: ژیان لە ١٣/ئوکتوبەری/٤٠٠٤پ.ز. سەعات ٩ی بەیانی[13] دەستی پێکرد!!، بەلام وا پێدەچی زۆر زیاتر بێ، ئەگەر بە ووردی

---

[11] ـ لە احمد بن حنبل دەگێڕیتەوە: گوایە ڕۆژی شەمە خۆڵوخاك دروست کراوە، یەك شەمە شاخ وکێو، دووشەمە دارو درەخت، سێ شەمە خراپە کاری، چارشەمە ناگروڕووناکی، پێنج شەمە گیان لەبەر، ڕۆژی هەینی لە نێوان عەسرتا عیشا ح ئادەم دروست کراوە.

[12] بڕوانە (معجم ديانات وأساطير العلمية...، ج٣ ص١٤٠) دەلێ: لە بناری شاخی هیمالایەی هەرەبەرزی جهان دابەزیتە سەرزەوی.بەلام هنری فورستر دەلی لە غوکلاند، لە ( تاريخ جرجان -بن يوسف الجرجاني) هاتوە: سمعت أبا الحسن محرز بن جعفر يقول وجدت ببلد الهند حجرا منقوشا بالعبرانية ببلد سرنديب يقال اهبط آدم

أنا الموجود فاطلبني تجدني
فان تطلب سواي فلا تجدني
تجدني أين تطلبني عتيدا
قريبا منك فاطلبني تجدني

[13] ـ بڕوانە: داروین-اصل الانواع ص٣٤

سەرنج بدەینە تەورات دەردەکەوێ تەمەنی نەوەکان کەلێ دوورو درێژ بووە[١٤]، لە دوای(ح.ئادەم) نەوەکانی بریتین لە: شیس، ئەرواس، کیناس، ماهلەیل، یارید، ئیدریس، ماتولسلخ، لامیك، نوح، وەك چەند نەوەیەکی تەمەن درێژ بەسەر زەوی پەرش وبلاو بون، تا تۆفانەکەی (ح-نوح)، لە کتێبی (لقطة العجلان مما تمس إلى معرفته حاجة الإنسان ) هاتوە: ((قال آشوس بين خلق آدم وبين ليلة الجمعة آول الطوفان ألفا سنة ومئتا سنة و ست وعشرون سنة وثلاثة وعشرون يوما وأربع ساعات))، واپێدەچی زۆر زیاتر بێت.

هەندێك پێیان وایە ئەو تۆفانە محەلی بووە هەمو جیهانی نەگرتۆتەوە، ساغ بونەوەی ئەو دووڕایە بەلایەکدا پەیوەندیەکی توندی بە کوردۆلۆژی هەیە، چونکە ئەگەر تۆفانەکە جیهانی بێت ئەوا مانای وایە چۆن هندستان لانکی یەکەمی مرۆڤایەتیە ئەوا کوردستانیش لانکی دووەمی مرۆڤایەتیە، ئیتر ئەوەش دەسەلمێ کە کورد(بە ڕەهایی) کۆن ترین میلەتن لەسەر خاکی خۆیان وبنەچەی کوردیش بە ناوو خاکەوە جودیە نەك زاگرۆس، دیارە بەپێی قورئانی پیرۆز کەشتیەکە لەشاخی جودی[١٥] کوردستان گیرساوەتەوە، هەندێکی تر زیاتر ووردەکاری دەکەن بە پێی نزارگەکانی مسیحی وموسولمان و یەزیدی ئەوا کەشتیەکە لە لوتکەی نیڤاتی[١٦] جودی چەقیوە، گوایە تۆفانەکەش لە ١٧/ ٢/ ٦٠٠ی تەمەنی(ح نوح)[١٧]بووە، (رالف لینتون) لە کتیبی (شجرة الحضارة)دەلی لە ٣٥٠٠پ ز تۆفانەکی سەرانسەری لە جیهان ڕوویدا، ئەو باسە لە زۆربەی کتێبە ئاینیەکانی جیهانی وەك (ئینجیل، تەوڕات، مانۆی هندی، چیسابلپۆکی مەکسیکی، کتێبی هیندیە سورەکانی ـ پۆپۆل ڤۆنخ، زەندە ـ ئاڤێستا، هەروەها لە کتیبەکانی سۆمەری و شارستانی تریش) [١٨] هاتووە، واتە جهانی بووە، لە تەورات بە ڕوونتر باس لەوە دەکا کە کەس لە سەر زەوی نەماوە، دەڵێ: (لأن مياهها كانت على وجه كل الأرض)، (فمحا الله

---

[١٤] ـ سەیری العهد القديم - تكوين (٥) بکە، لە قورئانیش باس لە تەمەن درێژی ئەو نەوانەی ئەو سەردەم دەکا.

[١٥] ـ بەشێکیش پشتیان بەستوە بەهەندی زانیاری تر وەدەلین تۆفانەکەش گوایە تەنها میزوبوتامیای گرتوتەوە لە ٧\١٧ ی هەمان سالی سەروو شاخی لە ئەرارات گیرسایتەوە ، تەورات لە (تكوين -٨) دەلێ لە ئەرارات گیر بووە، قورئان وهەمور زانیارەکانی سەردەم دەڵێن لە جودی گیر بووە، بەلام ئەگەر هەر پشت بە تەورات ببەستین دەلیت ئەو تۆفانە سالیك و دە رۆژی خایاند کەواتە جیهانی بووە.

[١٦] ـ بروانە: واسیلی نیکیتین -کوردو کوردستان ل١٢١(لەناو یەزیدیەکان سەربردەیەکی زیادەی تر هەیە دەڵێن : دوای بەرێکەوتنی پاپۆری (ح نوح)کونێکی تێ بوو، ناوی لێهاتە ژوور زۆر ترسان بەلام مارێك هات و سەری خۆی بە کونەکە وەناو ئاوەکەی بری...بۆیە ئانیستاش مار لای یەزیدی خۆشەویستە).

[١٧] ـ بروانە: تەورات ـ سفر التكوين (اصحاح٦-٩).

[١٨] ـ بۆ زیاتر سەرنج بدە کتێبی: (کۆنترین نهێنیەکانی مێژوو)ـ ئەلکاندر گەربۆڤکی.

كل قائم كان على وجه الأرض)[١٩]، له ئینجیلی(برنابا)ش دەڵێ جیهانی بوە:( ٧ فبسبب الشهوة إن الطوفان حتى أن العالم هلك أمام رحمة الله ولم ينج إلا نوح وثمانون شخصا بشريا فقط ٨ )[٢٠] به پێی (الكتاب المقدس ـ العهد القديم سفرتكوين(٧) لە تەمەنی ٦٠سالەی (ح نوح) تۆفانەکەبوودو دوای لە تەمەنی ٦٠١ی لە دەڵێ لە ئەرارات گیربوە( واستقر الفلك في الشهر السابع في اليوم السابع عشر من الشهر على جبال اراراط ٥ )[٢١]،بەلام دوای لە دۆزینەوەکەی ئاسەواری کەشتیەکە ئەوەی قورئان ڕاست دەرچوو(وَقِيلَ يَا أَرْض ابْلَعِي مَاءكِ وَيَا سَمَاء أَقْلِعِي وَغِيض الْمَاء وَقُضِي الأَمْرُ وَاسْتَوَتْ عَلَى الْجُودِيِّ وَقِيلَ بُعْداً لِّلْقَوْمِ الظَّالِمِينَ[٢٢] لەجودی گیر بۆوە*، جارێکی تر لەو کوردستانە لە دەوروبەری شاخی جودی ژیان و مێژووی مرۆڤایەتی لێی دەستی پێکردۆتەوە، کەواتە کورد کۆن ترین میلەتن لەسەر خاکی خۆیان ئەگەر تۆفانەکە سەرتاسەری بووبێ، کوردستان لانەی مرۆڤایەتی ئێستایە، بەپێی هەندێ سەرچاوە شاری (شەرناخ) کە لە نزیك (جودی)یە مانای (شاری نوحە)، هەروەها ئیبن عەباس دەڵێ لە بناری چیای جودی (ح نوح )شاریکی دروستکرد، تا ئێستاش ئاسەواری ماوە بە ناوی هەشتیان *

هەمو ئەو شارستانی و چرا ڕووناکانەی قولایی مێژوو یەکەم جار لە ڕێگەی هۆکاری دەرەکی و پەیامی ئاسمانیەوە بنرێژ کراون، ئنجا درێژەیان بەخۆداوە، هەرچەندە عەلمانیەتی ئەو سەردەمە دەیەوێ ناسنامەی مێژووی خۆی بگێڕێتەوە سەر لاتینی کۆن بۆ ئەوەی نەچێتەوە سەرتوخمی ئاین، گوایە کەلتووری یۆنان بناغەی ئاینی نەبێ، کەچی بە ووردبونەوە دەبینین هەتا شارستانی (یۆنان)یش بناغەکانی ئاینی ئاسمانیە، ناوی یۆنانیشی لە (ح.یونس) هاتووە[٢٣]، هەروەهاناوە کۆنەکەشی (هەیاس) هەرناوی پێغەمبەرێکە،

---

[١٩]ـ العهد القديم ـ سفر تكوين ٧، ٨

[٢٠] ئینجیل برنابا- فصل١١٥ اية(٧-٨) ترجمة:حمادة

[٢١] عهد القديم – سفر التكوين –اصحاح ٨

[٢٢] سورەتی هود– ئایەتی ٤٤

* بە ووردی لەو مێژوانەمان کۆلیەوە ، دەرکەوت لە تەوراتیان وەرگرتووە، ئیبن حەزم لە کتیبی (الملل والأهواء والنحل) بە توندی ڕەدی ئەو جۆرە زانیارانەی تەوراتی داوەتەوە بەلام لەو زانیاریانە بی دەنگ بووە.

* هەشتیان واتە هەشتا ئەوەش گوزارش لەو ٨٠ کەسە ناسنامە جیاجیایانە دەکا کەلەگەلی بوون.

[٢٣] بڕوانە (لسان العرب)، هەروەها (صحاح)، ..هەر لە تەوراتیش لەجیاتی یونس یۆنانی نوسیە لە.

بناغەی ئیمپراتۆریەتی رۆمیش هەرواله باپیرەگەورەیان کە ناوی (روم بن عیسو بن اسحاق النبی) ە[٢٤] لە سەر ئەو بنچینەیە دەبینین شارستانی یۆنان و میسر و چین ومیزۆپۆتامیا، رۆم، بابلیەکان، هندیەکان، مایا، ...هتد، ..بەرهەمی پێغەمبەرانن بەوشێوەیەی خوارەوە: فیساگۆرس(٥٨١ـ٤٩٧ پ ز) و ئنکسماندرس هەریەکە قوتابی پیغەمبەران (ح داود و ح سلیمان )دەرسیان لاخویندووە[٢٥]، شریعەتی حەمورابی درێژ کراوەی شریعەتی ح ئیبراهیمە، بە پێی (پەیمانگای ئیسلامی بەریتانی ـ زانستەکانی بەراوردی ئاینی ) ئەوا حەمورابی ٣٠٠ سال دوای ح ئیبراهیم هاتوە لە ١٨٧ پ ز، بۆیەش بەشی زۆری مادەکانی شریعەتی حەمورابی لەتەورات و ئینجیل وشریعەتی ح ئیبراهیم و هەندێکیشی لە ئاڤیستای زەردەشتی دەچێ، هەندێکی لەگەل قورئانیش لێك نزیکە[٢٦]، لە سەر ئەو بنچینە قولە رۆسۆ دەلێت یەکەم دەسەلات وشارستانی ئاینی بوە[٢٧]

لەدوای ئەوانەو تۆفانەکەش بێجگە لە مێژووی میللەتـە بالادەسـتەکانی وەك فـارس و رۆم و ئاشوری و بابلی و یۆنانی، ئەوانی تـر زۆر لێلـە، بـەلام بـە مـسۆگەری سـەرۆکی هەندێ دەسەلات کورد بووینە بەرچەلەك، نەك بە کیان و هەستی نەتەوایـەتی، هەلبەتـە سەردەمی ئیمپراتۆری بوە، زۆربەشیان لە ئەسلدا درێژکراوەی پـەیامێکی ئاسمـانی بوینـە، مێژووی ئەو جۆرە دەسەلاتانە تا (٤٥٠٠) سال لەمەوبەر قـوول دەبێتـەوە لـە (...لولـو، گـوتی، جـوتی، مـاد، کـاردۆخی، کـاردوو...) بـەپێی هەنـدێ ڕیوایـەت دامەزرێنـەری

٢٤ـ بروانە: لسان العرب ـ ابن المنظور ج١ص١٢٦٠ مادة: روم. هەندێکیش دەلێن : والمراد بالروم هنا الروم الاول وهم اليونان المنتسبون إلى رومي بن لبطى بن يونان بن يافث بن نوح علية السلام ـ بدايةوالنهاية ج١ ص١٣٠

[٢٥]ـ بروانە: الملل والنحل ..ص ٦٧ـ٧٢ .هەر بۆیەش مەدرەسەو پەیرەوی فیساکۆرس لەهەموان ئاینی تر بوە

[٢٦]ـ توێژەران زۆر لای لە یەکچوو لە نێوان تەورات و یاساکانی حمورابی وشریعەتی ح ئیبراهیم دۆزیتەوە، هەندێکی بە نمونە لێرە تۆمار دەکەین کە لە (مەوسوعەی بریتانی)مان وەرگرتوە: یاساکانی ژ: ٨، ١٢٩، ١٩٥، ١٩٦...وەکو ئایەتەکانی (٢١-٣٧-خروج)، (٢٢-٢٢-تثنية)، (١٥-خروج)، ( ٢٠-٢٤-لاوين)...لەگەل زۆری تر ، هەر ئەو دەقەی هەردوولاش بە نمونە تۆماردەکەین: قانون حمورابی رقم١٢٩- إذا قبض على امرأة مضطجعة، مع سيد فيجب عليهم أن يوثقوهما ويلقوهما في الماء، ويمكن لزوج المرأة أن يبقي زوجته على قيد الحياة إذا رغب، كما يمكن للملك أن يخلّي حياة أمته.

التوراة: وإن أخذ رجل يضاجع امرأة متزوجة فليمُت كلاهما. (تثنية ٢٢:٢٢) ،

لە قورئانیش زینای پیاو ژنی بە هاوسەری ئەو سزایە هەیە، لە ئاڤێستای زەردەشتیش سزای ژنی مێردار لە زینا هەر ئەوەیە ، هەمو ئەوانە بەلگەن کە هەموی لە ڕەچەلەکدا لە پەیام هاتوون دوای بەرەبەرە دەستکاری کراون

[٢٦]- جان جاك رۆسۆ- العقد الإجتماعي ـ ص٢٠١

ئیمپراتۆریەتی ساسانیکان (ئاردەشیر)ـ بەڕەچەڵەك کورد بوە، {بەپێی ئەو نامەیەی بۆی هاتبوو لە لایەن(ئۆردوانی پێنجەم) وپێی دەڵێ تۆ لە ژێر ڕەشماڵی کوردا گەورە بووی}، زۆری تر.

ئەو مێژووناسە کۆنانەی باسی کوردیان کردووە بەناوی سەردەمی خۆی هەریەکە لە(هێرودۆتس٤٨٤ ـ ٤٢٥ پ.ز) و (زەینەفون و ستراب‌ۆ) لەپێش زایین، ڕۆڵی کورد لە مێژوو بە چاك وخراپ هەیە بە پێی کتێبە ئیسلامیەکان یەکەم چەکی کۆکوژی(مەنجەنیق) کورد دروستیان کردوە، هەر بە پێی ئەو سەرچاوانە وا پێدەچێ ڕووداوی سوتاندنی ح ئیبراهیم لەنێو کوردان بووبێ چونکە دەڵێ بەو مەنجەنیقەی (هەزنی) کورد ئاگرەکە کرایەوە[28]، کێشەی باسی ئەو دەسەڵاتە سیاسیانەی ئەو سەردەم لەسەرتاسەری جیهان هەیە، چونکە لەو سەردەمی دەتوانرا دەسەڵاتی سیاسی دروست بکرێ لەسەر خاکێك بێ ئەوەی ناسنامەیان جووت بێت، تەنانەت ناسنامەی دەسەڵات وگەلیش جوت نەبوە، بنەماڵەی قاجاری تا ساڵی (١٩٢١) حوکمی فارسیان کردوە بەناوی فارسیش کەچی تورك بوینە، ئەردەشێر[29] و کریم خانی زەند کورد بووینە، یەك لەپاشای ڕۆمیەکان عەرەب بووە، دەوڵەتی ڕۆستەمی لە مەغریبی(ئێستا) فارسی بووینە، لەو میانەدا باسی لە کۆمەڵێك کیان و ئیمپراتوریاتی وەك لولوەکان و کاردۆ و میتانی و دەکرێ لەهەمویان زەقتر و نزیك تر لە کورد ئیمپراتۆریەتی میدیا بووە، ئەوەی لەوەش لێڵە ئەو دەسەڵاتە دوور بووە لە کوردستان لای خوراسان بووینە، ئێستاش کیانێکی بچووك لە نزیك هێمالایە بەناوی میدیا ماون[30]، لەسەر دەستی فارسەکان لەنێوچووینە، بۆیە بە گشتی ئەو مێژوە سیاسیەی ئەو سەردەم لێڵە.

---

[28]ـ ثم وضعوا ابراهيم عليه السلام في كفة منجنيق صنعه لهم رجل من الاكراد يقال له هزن وكان أول من صنع المجانيق فخسف الله به الارض فهويتجلجل فيها إلى يوم القيامة—المصدر: بداية والنهاية (١٦٨/١)

[29]ـ بەلای کەمی بەلگەی کوردبوونی ئەردەشێر لەو نامە گۆڕینەوانە بە ڕوونی دەردەکەوێ کە لە(تاريخ الطبرى) وەرگیراوە: إذ ورد عليه رسول الأردوان (ئۆردوانی پێنجەم) بكتاب منه فجمع أردشير الناس لذلك وقرأ الكتاب بحضرتهم فإذا فيه إنك قد عدوت طورك واجتلبت حتفك أيها الكردي المربى في خيام الاكراد من أذن لك في التاج الذي لبسته والبلاد التي احتويت عليها وغلبت مونكها وأهلها ومن أمرك ببناء المدينة التي أسستها في صحراء يريد جور مع أنا إن خليناك وبناؤها فابتن في صحراء طولها عشرة فراسخ مدينة وسمها رام أردشير وأعلمه أنه قد وجه إليك ملك الأهواز ليأتيه به في وثاق

فكتب إليه أردشير إن الله حباني بالتاج الذي لبسته وملكني البلاد التي افتتحتها وأعانني على من قتلت من الجبابرة والملوك وأما المدينة التي أبنيها وأسميها رام أدرشير فأنا أرجو أن أمكن منك فأبعث برأسك وكنوزك إلى بيت النار الذي أسسته في أردشير خرة

[30]ـ القانون الدولي فى الاسلام ـ (تەنها ئەو کتێبە باسی لەو کیانە بچوکە دەکا، بەڵام باسی مێژوویان نا کا).

## لە سەردەمی ئیسلام:

کورد بەزەبری شمشێر یان بە بیرو باوەڕ موسولمان بوو؟

بەشێکی زۆر لە رەوشەنبیران و سیاسەتمەداران بەبێ زانیاری دەچنە ناو ئەو بابەتەو دەڵێن : یاوەران بە زەبری شمشێرو بەتاڵان و جینۆساید هاتونە کوردستان، لەوانە (ساڵح قەفتان) دەڵێ: کوردستانیان داگیرکردو خەڵکیان کردە (موالی) مزگەوتیان دروست کرد، تا نوێژ بۆخوای عەرەب ببینن [٣١]، لەتازە ترین کتێب بە ناوی (ئەنفال لە ڕۆمانی کوردیدا لە ل(١٥ ـ ٢٨) دووبارەی ئەوە دەکاتەوە، کە هاتنی عەرەب و ئەسحابەکان ئەنفالی کوردیان کردوەو پشت بەو پیستە دەبەستێت کە لەخوارەوەو باسی دەکەین، ئیتر ئەوە بەلای ئەوانە ئەنفالی یەکەم بووە ئەوەی بەعسیش ئەنفالی دووەم بووە، بۆ ئەو مەبەستە پێستێکی تەزویر(گوایە) لەناوچەی هەورامان دۆزراوەتەوە گوزارش لە ڕاستی ئەو دەنگ و باسانە دەکا(*)، ئەو ڕایە وزۆربەی ئەو ڕایانەی لەبارەی خیانەتی مەلای خەتێ وزانایانی تری کورد لەدوای بە عەلمانیکردنی شۆرش و دەسەڵاتی کوردی هاتووە، ئەگینا لەپێشتر ئەو ڕاو بۆچوونە نەبووە، ئەوەش گوزارش لەڕای هەمو عەلمانیەکان ناکا، بەشیکی زۆر لە مێژوونوسە کوردەکانیش باوەڕیان وایە، کە کورد بەخۆشی بوویتە ئیسلام لەوانە: مام هەژار، مەسعود محمد، تەنانەت لەسەروو صالح قەفتان وا دەڵێ، کەچی لە (مێژووی کورد

---

[٣١]ـ مێژووی گەلی کورد ص١٤٣ لەراستیدا بەڕێز ساڵح قەفتان بڕیارێکی گەورە بوو، بەڵام وا پێدەچی لەو بابەتانە لاواز بێت، چونکەموالی تایبەت بوو بەسەردەمی ئەمەوی وبەس، کاتێ هاتنە کوردستان سەردەمی ئەمەوی نەبوو، ئینجا لەزۆر شوێنی تر کەوتۆتە هەڵە، لەل٢٩٤دەڵێ ساڵی ١٩٠٨ ناوی عوسمانی گۆڕا بۆ تورکیا، ڕاستەکەی ئەوەیە لەساڵی ١٩٠٨ ئینقلابی ئیتیحادیەکان بوو، لەساڵی ١٩٢٢ بوو تورکیا.

(*)دەقی نووسراوی سەر پێستەکە(لە مەوسوعەی جودی) وەرگیراوە:

هورمزکان ڕمان ئاتران کوژان

ویشان شاردەوە گەورە گەورەکان

زۆر کار ئارەب کردە ئدە خاپوور

گنا و پالەیی هەتا شارەزوور

شەن و کەنیکان و دیل بشینا

مەرد ئازا تەلی دەرووی هدینرا

١ـ لەو سەردەمی ناوی شارەزوور نەبوو،ئەو کاتی بە (شەهر زیڤار) ناوزەد دەکرا.

٢ـ گوایە ئەوە بوو لەسەر ئەو پێستە نووسرابووە، ئێستا گەیشتۆتە مۆزەخانەی بەریتانیا، وا تێ بینی دەکرێ:

١ـ بەپێی پسپۆڕانی زمانەوانی زۆر وشەی نوێی تیادایە.. بۆیە بە دەستکرد دەچێت وەك ئەو ڕووداوەی (ئنسان پلتداون)، کە ویستیان هەندێ ئێسك وا تەزویر بکەن لەگەڵ (تیۆری پەرەسەندنی-داروینی) بگونجێ..

٢ـ هەمان ئەو بەندانە بەش بەش لە شێنی ژنانی دەرسیم هەیە، لێرە هەندێ ناوی تری (ئارەب)، (شارەزور).. زیادکراوە.. بۆ زیاتر سەرنج بدە کتێبی د.نوری دەرسیمی (دەرسیم لە مێژووی کوردستان)- دەقی هەڵبەستەکە بەلاتینی لە لاپەڕە (٤١) هەیە..

له کۆنەوە تا ئەورۆ) دەڵێ بە خۆشی خۆیان بووینە ئیسلام...لەهەموان بە ووردتر لە پێشەکیەکەی شەرەفنامە وئینجا لەکتێبی(محمدئەمین زکی بەك ـ خولاسەی تاریخی کوردو کوردستان لە ل١٢٣) دەڵێ بەخۆشی وبێ جەنگ ئیسلام لە کوردستان وەرگیراوە.

گابانی هاوەل نزیکەی سالیك ڕاستەوخۆ لەدیدەنی پێغەمبەر(د_ خ)بوە، دوایش گەراوەتەوە مەرگەو لە دژی زوڵم و زۆری فارسەکان خەباتی کردوە،لەنێوان سالانی ١٤ــ ١٦ی ڕێکخستنەکانی ئیسلامی لەکوردستان بەنهێنی بڵاوکردۆتەوە، لەو کاتی کوردستان داگیرو دابەشکرابوو لەنێوان ڕۆم و فارس، لە باروودۆخێکی سیاسی و ئابووری و کۆمەلایەتی و فەرهەنگی زۆر ناخۆش بووە، کۆمەڵێك باجیان خرابووە سەر، هەردوو ڕێبازی(منحرفی) زەردەشتی (مانی و مازدەکی) لەنێو کورد بڵاوکرابۆوە، بەشێوازی جۆرە سوسیالیستی و عەلمانیەتێکی وا کەس خاوەنی ماڵ و منداڵ و کچ و ژنەکانی نەبووە بەتەواوەتی، لەهەردوو سەرچاوەی (قصة الحضارة ـ ویل دیورانت) و (الحجاب ـ مرتضی مطهری) هاتووە کیسرا داریۆش٣٠٠٠ ژنی هەبوو کەچی نامەی بۆ کێخواکان دەنووسی وەسفی ئافرەتی دەکرد کە بە مواسفاتی ئەو زیاتری بۆ بنێرن،کیسراکانی دوای ئەویش هەروابوون، بەپێی وەسفی (سینۆهە) کە دەڵێ خۆم میوانی کیسرا بووم پێی وتم: بڕۆ ئافرەتێك لە باخچە هەڵبژێرە بالات بێت هەتا میوانی[٣٣]، زیاتر لەوەش لە کوردستان نەریتێکی تریش بڵاوکرابووەوە ئەویش ئەوە بووە هەر یەکێك هاوسەری بکردبایە دەبوایە شەوی یەکەم بیبردبایە لای بەگ و کێخواکانی فارس لە کوردستان (پێی دەووترا مافی شەوی یەکەم)، جاروا بوو ئەو زەماوەندە دوادەخرا لەبەر ئەوەی کێخوای کیسرا لە کوردستان هەر شەوەی بووکەکی پێ بەرێ دەکرا! بۆیە هەروەك ئەزموونی هاتنی ئەمریکا لە (٢٠٠٣) هیواخوازی ڕزگارکەرێك بون، ئە وەبوو لەشکری ئیسلام هات.

چۆن هات؟ کەمتر سەرچاوە عەرەبیەکۆن و نوێکان باسی شەڕی ڕاستەقینەی (سعد) و (ڕۆستەم) دەکەن، کە کێ ڕۆستەمی شکاند، لە (امجاد الاکراد) بەدریژی بەو شێوەیە هاتووە: کاتێ ڕووبەڕووبونەوەیەکی هاوسەنگ لە قادسیە لە نێوانیان درێژەی کێشا، ئەوا

---

[٣٣]ـ بڕ وا نە بە شی یە کە م (سینو هە – دکتۆ ری فیر عە ون)

کیـــرا سـوپایەکی لەشێوەی (گاردی کۆماری) لای خۆی لە سـپێر هـەبوو بەسـەرکردایەتی دێلم[٣٤] و (٠٠ ٤٠تا٠٠ ٥٠) جەنگاوەری ئازا بەرەو ئـەو جەنگـە چـوون، لـە پـشت سـعد هەڵیاندا و زۆریشیان لێ ترسا، بەڵام دوایی بۆ یـەك ئاشـکرا بـون کـە ئەوانـە سـەر بـە ڕێکخستنەکانی ئیـسلامن لـەڕێی گابـان و مـەیمونی کـوڕی[*]، بـەو شـێوە بـۆ بـەیانی بەهەردوولا لە ڕۆستەمیان داو شکاندیان و بووە هۆی داڕووخانی ئیمراتۆریەتی فارسی، لە شکرەکەی دێلمـیش نـاونرا (جـیش الحمـراء)[٣٥]، دوای ئـەو نـاوە بـوە نـاوی هـەمو ئـەو سوپایانەی لە دوای فتح دروست دەبون ناو دەنران (سوپای سور)، لەو ناوچانە دەسـەڵاتدار بون، هەر سوپای دێلم والی حران و دیالەیان دانا، دوایش هـاتن کوردسـتانیان ڕزگـارکرد، کەمتریش شەڕ ڕوویدا ،لەگەڵ هاتنیان خەڵکی کورد لە فارس و کرێگرتەکانیان هەڵسـان و خۆیان ڕزگارکرد،بۆ یەکەم جار لەدوای میـدیا کـورد ئـاوا دەسـەڵاتێکی زۆری بـۆ پەیـدا بوو،هەروەك لە( ج٨ وفيات الأعيان ) لەبارەی دەسەلاتی زۆری کوردیەوە دەڵێت: (ثم ذكر الطبري في سنة تسعين أن الحجاج خرج إلى الأكراد الذين غلبوا على عامة أرض فارس فخرج بيزيد معـه وأخويـه المفـضل وعبـد الملـك وجعـل علـيهم في العـسكر كهيئـة الخنـدق وجعلهم في فسطاط قريبا منه وجعل عليهم حرسا من أهل الشام وأغرمهم ستة آلاف ألف وأخذ يعذبهم وكان يزيد يصبر)[٣٦].دیلمەکانیش دەسەڵاتی تەواویان لە خوارووی عیراقی ئیستاو بەغداو سەروو ورۆژهەلات بوە، جـاریش وابـوە ئـەو دەسـەڵاتە زۆرەی کـورد زولمی لـە عـەرەب وفـارس و خـەلکی ترکـردوە تـا ڕادەی ئـەنفال، لـە (ج٨–وفیـات

---

[٣٤]ـ لە کۆنەوە فارسەکان بە (دیلمیەکانیان) دەوەت کوردی تەبەرستان، بە عەرەبەکانیشیان دەووت کوردی سورستان(عیراقی نیستا).

[*] ـ هە رچەندە ڕۆژهە لاتناسی فەرەنسی ( لویس ماسینۆ لە کتێبی: خطط كوفة وشرح خريطتها) دەڵی دێلم بۆیە لەدژی ڕوستەم وە رگە ڕا وە لە تۆ لەی باپیرانی میدیای، بەڵام ئەوتیۆرە مێژووییە پێنا چی ڕا ست بێت چو نکە (٥) سەدە بە سەر شکستی میدیا ڕەت ببور، بە زە حمە ت نە و کار یکە ریە ی ما بێت بۆ یە نە و بۆ چوونە ڕا ست تر ە کەدە لی سە ر بە ڕیکخستنی نیهێنی نیسلا می بووە.

[٣٥] لـە فتـوح البلـدان-بـلاذری ج٢ص٣٤٢باسـی ئـەو شـەڕەو ڕۆلی دیلمیـەکان دەکا،ئـەویش بەزەحمـەت زانیاریـەکانی دەسـت کەوتوە،لە(ابن مسعود کوفی ومسعر بن کدام)بیستوە کە لەو شەڕەی سعد وڕۆستەم ئەگەر دیلمیەکان (کەلـەوێ بـە سوپای شاهانە ناوی بردوون) نەهاتبوونایە یارمەتی سعد نەیدەتوانی زال بێت ،لە(موسوعەی بریتانی –ویکبیدیا) دەڵی ئەو هێزەی دیلم ٤٠٠٠شەڕکەر بووینە،دەشلێ لەناو کورد زازاییەکان (وابزانم زەرزاریەکانە)و لەناو عرب دلیمیەکان پاشماوەی دیلمیەکانن وعبدالقادر گیلانی لەوانە ، جێی داخە وەك ڕەگەزپەرستیەك زۆربەی مێژوونوسە عەرەبەکان لە چوارچێوەی ئەفزەلیەتی عەرەب ولاوازکردنی غەیرە عەرەب لە ناو ئیسلامدا ئەو بابەتەوزۆر بابەتی تری ڕۆلی کورد بزر کراوەوخیانەت لەگەل زانست وئاین کراوە،ڕۆلی دێلم لەکووفەو بەغداو ناوچەکە گەلی زۆر بوەو بەدەسەڵات بووینە کەچی نالێن لە ئەسلدا ئەوانە چۆن هاتوونە !!.. بۆ زیاتر بڕوانە :١–وینای کوردلە زانینی مێژووی ئیسلامیدا ٢– بڕوانە ل٢٠٦ی ئەو کتیبەی بەردەستت.

[٣٦] تاریخ الطبری لەج٣ ص٦٨٤ باسی ئەو سەربردەیەی کردوە کەمێك بە جیاواز تر.

**الأعيان) هاتوەبە هۆی کوژرانی یەك کورد چیان بەسەر هێناون:** قال أفرأيت مسلما يوجه بالأكراد الكفار إلى بلاد المسلمين فيقتلونهم ويحملون نساءهم ويأخذون أموالهم ألم تعلم أن أحمد ابن الليث الكردي قتل بكرمان سبعمائة إنسان على دم واحد وافتض الأكراد مائتي بكر من أهل البيوتات وحملوا معهم نحو ألفي امرأة إلى بلادهم أفرأيت مسلما يرضى

له کتێب و مێژوونووسە ئیسلامیەکانیش وای لێ دەخوێندرێتەوە، کە کوردەکان بەشداری شەڕیان دژ بە هێزی ئیسلام کردوە لە پەڕگەکانی کوردستان، واتە لەو شوێنانەی کە لایەنی تر زال بوە، تەنانەت ئیبن خەلدوون وئیبن کەسیرو چەند سەرچاوەیەکی تریش بە سەردێرێك باسی شەڕێك لەگەل کورد دەکەن بەناوی (غەزوەت لئەکراد) بەو شێوەی خوارەوە: (غزوة الاكراد ـ ثم ذكر ابن جرير بسنده عن سيف عن شيوخه: أن جماعة من الاكراد والتف إليهم طائفة من الفرس اجتمعوا فلقيهم أبو موسى بمكان من أرض بيروذ قريب من نهر تيري، ثم سار عنهم أبو موسى إلى أصبهان وقد استخلف على حربهم الربيع بن زياد بعد مقتل أخيه المهاجر بن زياد، فتسلم الحرب وحنق عليهم، فهزم الله العدو وله الحمد والمنة )، بەلاّم دەبینین ئەویش لە دەورو بەر بوە نەك لەکوردستان، واتە شەڕی خەلّکی تر بوە هەندێ کورد کردوویانە، شەڕ لەناو جەرگەی کوردستان نەبوە، کەمتر ئەو ناوانەی وەك دۆلّی ئەسحابان و بەردە قارەمانە (گوایە ئیمامی علی پشتی پێداوە ئەوەندە لە شەڕی کورد ماندوو بووە)، تەنانەت ئەوەی جزیرەش گوایە (عەیاز)ئەنفالی کردوون هیچ بناغەیەکی نیە، هەرچەندە ئەوێش ناوجەرگەی کوردستان نیە بەلام(تەبەری) وزۆری تر باسیان لەوێ کردوەکە چۆن ڕێنمایی داوە ئەگەر بوەشەڕ ڕەچاوی مافی ئادەمیزاد بکەن، لە تەبەری وا هاتوە: ذكر خبر سلمة بن قيس الأشجعي والأكراد (( ....فإن قاتلوكم فلا تغلوا ولاتغدروا ولا تمثّلوا، ولا تقتلوا وليدًا...))، سەرەنجامەکەشی لەلایەن مێژوونووسی گەورە مقدسی وا هاتوە کە شەڕ نەبوو بەئاشتی وڕێکەوتن جزیرە کرایەوە( ورام هرمز وبعض نواحي فارس وكان سعد لما بعث عتبة بن غزوان إلى البصرة بعث أبا موسى إلى الجزيرة فافتتح الموصل ونصيبين صلحًا)[٣٧]،هەندێ

---

[٣٧]المطهر بن طاهر المقدسي- البدء والتأريخ ص٣٩٢

شەڕ بوە لەو ناوە لەگەل کورد بەلاّم بە پێچەوانەی ئەوەی گوایە عرب هاتبن ووایان لەکورد کردبێت بەلکوکوردوعەرەب لەویّ هاوپــەیمان بووینــە دژی لــە شــکری ئیــسلامی وەك لــة تاریخالطبری وا هاتوة: وكانت الأعراب والأكراد لما بلغهم خروج المعتضد تحالفوا أنهم يقتلون علي دم واحد واجتمعوا [38]

زۆربەی ئەوگوتارەگریۆکانەی هەندیّ رەوشەنبیری کورد دروست نین، ڕاستیەکەی ئەوەیە هەر لەدوای گەیشتنی بانگی ئیسلامی ـ بەپێچەوانە عەرەب کە زۆربەیان بە زەبری شمشێر ئیسلام بون ـ کوردەکان بەخۆشی ئیسلام بون، ئەوانەی ئێستا دەلێن کوردلەو کاتی ئەنفال کراوەو شەڕی لەگەل کراوە بەلگەیان نیە، ئەگەر کورد شەڕی کردبیّ بۆ کێی کرددوەو چ دەسەلاّتێك کۆی کردۆتەوە خۆ ئەو کاتی داگیر کراو بوە، زۆریش بێزار بوە لە داگیرکەر بۆیە لە هەندیّ ناوچە کە سوپای ئیسلام نزیك بۆوە کورد لە سوپای فارس ڕاپەڕی وباقیەکەی تریش بە ئارەزووی خۆیان پێشوازیان لەو ئاینە نوێیە کرد، هەر بۆیەش یەکسەر ناوی مندالەکانیان تا ئەو ساتەش بووە محمد وعلی و عمرو خالد...، ئینجا دیاردەی (ردە)ش لە کوردستان پەیدانەبوو، لەگەل زۆر بەلگەی تر، بەلاّم بەگشتی ئەوەبوو ئاینی ئیسلام وەك ئیمپڕاتۆریەکانی تر نەبوو هەر داگیرکەربیّ، بەلکو خاوەنی پەیام و بەرنامەیەك بوو، پێویستی بەسوپایەکی زەبەلاح نەبوو بیکاتە پاسەوان لەسەر میللەتی داگیرکراو، بەلکو کە پەیامەکە دەگەیشت میللەتانی ناوچەکە خۆیان دەبونە خاوەنی، ئەگینا چۆن چەند هەزار نەفەرێك بەشی ئەو هەمو پانتاییەی جیهانی ئیسلامی ئەوسای دەکرد، نیشانەی داگیرکەریش یان تۆبزکار ئەوەیە بەماوەیەکی کەم دەردەکرێت و ئاسەواری سیاسی و عەسکەری و فکری فەرهەنگیشی دەبڕێتەوە.

## بەشی کورد لەشارستانی ئیسلا م:

شارستانی ئیــسلام مــولکی کێیــە؟ دەتــوانین بلــێین ســەرەتایەکی میــژوویی سیاســی ڕاستەقینەی گەلانی ئیسلام لەوشارستانیە دەست پێدەکا، هــەمو لایــەك لەدروســتکردنی مێژووی سیاسی و شارستانی و زانستی و فەرهەنگی ئیــسلامی بەشــدار بووینــە، ئــەوەی

[38] تاريخ طبری ج٥ص٦٠٩

ئێستا ـ لەدوای نووسینەوەی مێژوو لە سەردەمی ناشیۆنالیزمی ـ گەلانی غەیرە عـەرەب بەبێ هۆیەکی مەنتیقی و زانستی تەسلیمی ئەوە بووینە کە شارستانی ئیسلامی مـولکی عەرەبە، کەچـی وانیـە، نـەك ئیـسلام بـەڵکو ئیمراتۆریەتـەکانی تـریش نابنـە مـولکی نەتەوەیەك، ئەگەر بە تەرازووی ئێستاش حوکم لەسەر مێـژوو بکـەین هـەر ڕاسـت نیـە، چونکە دەسەڵاتی سیاسی ئیسلامیش ماوەیەکی کەم نەبێ لەدەست عەرەب نەبووە، زیاتر لەوەش ئیسلام و ئیمراتۆریەکانی تر نەبووە جۆرێك لە سێنتریالی ڕەگـەزی، بـەو مانایـەی هەر نەتەوە یان بنەماڵەیەك سەردەستە بـن لـە ئیمپراتۆریەتەکـەدا، بـەڵکو وەك دەبیـنین دەسەڵاتی ئیـسلامی دەسـت گـۆڕی پێکـراو کەوتـە دەسـت فارسـی(سـەفەوی) و کـورد (ئەیوبی)و تورکی (عوسمانی)..و گەلانی تـریش وئـەو دەسـەڵاتە جیاجیایانـەی خـوارەوە دروست بووینە: راشدین لەمەکە(٦٣٢ ـ ٦٦١)، ئەمەوی دیمەشق(٦٦١ ـ ٧٤٩)، عەباسـی بەغدا(٧٤٩ ـ ١٢٥٨)، عەبادیە لە ئشبیلیە(١٠٢٣ ـ ١٠٩١)، عامریە بلنسیە(١٠٢١ ـــ ١٠٨٥)، ...مرابتـون لـە سـەرووی ئـەفریقا(١٠٥٦ ـ ١١٤٦)، فـاتمی لـە میـسرو قـەیردوان(٩٦٩ ـ ١١٧١)، ئـەیوبی شـام ومیـسرو جزیـرە(١١٧١ ـ ١٢٥٠)، ممـالیکی بحری(١٢٥٠ ـ ١٣٨٢)، ممالکە شرکسیەکان(١٣٨٢ ـ ١٥١٧)، محمدعلی لەمیسر(١٨٠٥ ـ ١٩٥٢)، تاهیری لە خۆراسان (٨٢٠ ـ ٨٧٢)، سـەقاریە لـە فـارس، سـامانی لـە تورکستان، سەلجوقی لە ئاسیا، زەنکیەکان لە شام و میزۆپۆتامیا، ئەرتەکی لە دیاربـەکر، سۆران لە کوردستان، عوسمانی لە ئەوروپاوعەرەب، سەفەوی لە ئاسـیا، ...غەزنـەوی لـە ئەفغانـستان، گۆریـەکان لـە هنـد....[39]، کەواتـەمولکی یـەك رەگـەزو نەتـەوە نـەبوە، هەروەهاش شارستانی و میراتە زانستی و فەرهەنگیەکەشی، بـەپێی (ابـن خلـدون) نـەك زانستەکانی مێژوو کیمیاو فیزیـا فەلـسفەو... تەنانـەت زانایـانی زمانناسـی قورئـانیش غـەیرە عـەرەب بووینـە، ئەگـەر کـەمێك وردبینەوەلـە مێـژووی شارسـتانی عـەرەب لەگەورەترین قەیران و قەلۆشی دایـە، چـونکە شارسـتانی ئیـسلامی وەك ئـیبن خەلـدوون

[39] ـ بۆ زیاتر بڕوانە: موسوعة العربیة المیسرة- المادة: دول الإسلامیة

ده‌ڵێ: كه‌می جیّ په‌نجه‌ی عه‌ره‌بی تێدایه‌ بۆیه‌ عروبییه‌كان ویستویانه‌ زاناو ناودارانی ئیسلامی ته‌عریب بكه‌ن ونه‌كرا، قه‌یرانه‌كه‌ له‌وه‌ دێت عروبیه‌كان ده‌یانه‌وێ ڕیشه‌یه‌ك به‌ شارستانی عه‌ره‌ب به‌بێ ئیسلام به‌ خۆ بده‌ن، یان به‌لای كه‌م پرۆژه‌ی عروبییه‌یان له‌سه‌ر میلاكی رۆژئاوا پۆلین نه‌كرێ وبلێن ئه‌وه‌ته‌ مێژوومان هه‌یه‌، كه‌چی نیه‌، ئیتر ئه‌و مێژوه‌ شارستانی ئیسلامه‌ نه‌ك عه‌ره‌ب، شارستانی عه‌ره‌بی په‌تی وراسته‌قینه‌ له‌دوای سه‌ده‌ی ٢٠ ده‌ست پیّ ده‌كا ئه‌ویش جێی شانازی نیه‌ له‌ هیچ ڕوویه‌كی تكنۆلۆژی وسیاسی وفه‌رهه‌نگی وزانستی ..، عه‌یب نیه‌ ئه‌گه‌ر شارستانی ڕاسته‌قینه‌ی عه‌ره‌ب ده‌ست نیشان بكه‌ین زیاتر بریتی بێ له‌ مێژووی ڕه‌وه‌ندی به‌هه‌مو سه‌رخانیه‌كانیه‌وه‌، مێژووی ده‌سه‌ڵاتی سیاسیش هه‌ر ئه‌و قه‌یرانه‌ی هه‌یه‌، زیاتر ژێر ده‌سته‌ بووینه‌ وخه‌ڵكی تر حوكمی كردوون، ته‌نانه‌ت تا ئه‌و دواییه‌ش هه‌روه‌ك له‌ به‌ڵگه‌نامه‌كانی به‌ریتانی ده‌رده‌كه‌وێ له‌ویلایه‌ته‌كانی به‌غداو به‌سره‌و شام[40] وته‌نانه‌ت یه‌مه‌ن[41] وجزیره‌ش كورد رۆڵی گرنگی بینیوه‌[42]، زیاتر له‌وه‌ش وادیاره‌ زمانی كوردی زال بوه‌ به‌سه‌رزمانی تر بوویته‌ هۆی پاراستنیان، له‌ (الكورد والكوردستان في الوثائق البريطانية)هاتوه‌: ان اللغة الكوردية منتشرة بحيث تستخدم عند شعوب اخرى من الأرمن والأشوريين والعرب والسوريون[43]، له‌لایه‌ن عرب توانیویانه‌ به‌سه‌رناوچه‌كانی شام ومیسر زاڵ بن كه‌چی نه‌توانراوه‌ زال بن به‌سه‌ر زمانی كوردی[44]، هه‌ر له‌ خودی قورئان وله‌ مه‌وسوعه‌كان و زیاتر له‌وانیش ابن خلدون ڕا سته‌وخۆ عه‌ره‌ب به‌ میلله‌تێكی دڕنده‌و نه‌فام و دوور له‌ شارستانی له‌ قه‌ڵه‌م ده‌دا ئه‌گه‌ر ته‌واو ئاوێته‌ی ئیسلام نه‌بن[45]، بۆیه‌ش كوردله‌میژوودا به‌ چاوێكی سوك ڕوانیتیه‌ ئه‌و جۆره‌

---

[40] ـ بۆ زیاتر رۆلی كورد سه‌یری: العبر في خبر من غبر – الإمام الذهبي ص٤٨٧ ج٢ هه‌روه‌ها(آثار البلاد وأخبار العباد- زكريا بن محمد بن محمود القزويني ).. باس له‌ ده‌سه‌ڵاتی كورد له‌ شام و موسل ده‌كه‌ن

[41] ـ له‌ یه‌مه‌ن باس له‌(امرا الكورد)كراوه‌ له‌ تیبت (باب الأكراد)هه‌بوو

[42] به‌لگه‌نامه‌ی ژ:٢/١٦١ /٧٣٠ CO بریتانی.. كان للكرد في العهد العثماني دورا مهما في ادارة ولاية بصرة وبغداد وموصل. هناك حاليا عدد كبير من الاداريين الكرد من العهد العثماني ومن ذوي الكفاءات الجيدة....

[43] وليد حمدي- كوردوكوردستان فى الوثائق البريطانية ص١٥-١٧

[44] ٢/١٦١ /٧٣٠ CO.... اللغة ينطق الكرد باللغة الكردية التي تعود الى اللغات الارية ولا تربطها شيء بالعربية ذات الاصل السامي. بينما استطاع العرب ان يفرضوا لغتهم على الشعوب الغير العربية في سوريا ومصر ومناطق اخرى فلم يستطيعوا ذلك في كردستان حيث لا زال الكرد والاثوريون والكلدان (ذوي الاصول الارامية) يتكلمون بلغاتهم الاصلية...

[45] ـ بروانه‌: ابن خلدوون ـ مقدمة هه‌م له‌: تاريخ ابن خلدوون زیاتر له‌ ١٠شوین باس له‌و ڕاستیانه‌ ده‌كا،

عەردبە، تا ئەو دواییەش هەروەك لەبەڵگەنامەجهانیەكان دەردەكەوێ [٤٦]، مەبەستی نموەیە هەر كاتێك عروبەكەیان بخەنە پیش ئیسلام نەوا سەرگەردان وسوك بووینە كاری بەدەویان كردوە، بۆیە شارستانی ئیسلامی و شارستانی عەرەبی جودایە هەروەك شارستانی تورك و كورد وفارسی و میللەتانی تری ئیسلام لێك جیان، شارستانی نەتەوەیی لەدوای سەدەی (١٨) بە گشتی ولە جیهانی ئیسلامیش لەدوای سەدەی ١٩ ـ ٢٠ دەست پێدەكا و شارستانیەتێكی عەلمانیشە.

لەڕاستێدا لەو فەترەیەش چالاكی سیاسی و شارستانی و فەرهەنگی عەرەب جێی شانازی نیە، ناچار لەبەر قەلۆشی پەنا بۆ ئیسلام دەباو دەیەوێ بیكاتە پاڵپشت و ڕەگ و ڕیشەی خۆی، ئینجا تەقەلاّ دەدا صلاح الدین و تارق و زانایان و فەیلەسوفان و مێژووەكانی تریش خۆمالی بكا كە ناكرێ، لەسەردەمی شارستانی ئیسلام پارێزگاری فەلەستین و قودس كراوە، سەردەمی شارستانی ئیسلام بە سلبی و ئیجابیەوە مولكی هەمو لایەكە ناگەڕێتەوە بۆ هیچ نەتەوەیەك.

## دەسەڵاتەكانی كوردی:

هەر لەدوای هاتنی ئیسلام بنەمای (رضا) باڵی بە سەر هەمو پەیوەندیەكان كێشا، گەلێ جاریش دەسەڵاتدارە دێكتاتۆریەكانی خەلیفە و والیەكان لەسەر ئەوە نەوەستاون زوڵمیان لە هەمو لایەك كردووە بە پێی دوورو نزیكی خەڵك لە مەڵبەندی خیلافەت، لەدوای ڕاشیدین دوو دەسەڵاتی ئەمەوی و عەباسی دیكتاتۆری [٤٧] بووینە (جگە لە هەندێ فەترەیان نەبێ)، زیاتر لە هەموان زوڵمیان لەعەرەب خۆبەخۆ كردووە، وا باوە دەسەڵاتی ئەمەوی (كە هەردوو زاراوەی موالی و شعوبی لێ چەكەردكرد) دەسەڵاتێكی عەردبی پەتی بووبێ، بەڵام (ابن خلدون) جوان تر وەسفیان دەكا دەڵێ دەسەڵاتی دەمارگیری قوڕەیشی بووە لە بەرامبەر دژایەتی بنەماڵەی (ئالوبەیت)، لەو فەترد ناخۆشانەش ئەوەند

---

[٤٦]ـ الكتاب معنونة الى ر.جيب سليد ضابط الجناح دائرة استخبارات القوة الجوية الملكية البريطانية مقر القيادة، ذوبيان - الحركة القومية الكردية ...و ان الكرد ينظرون بعين الريبة و عدم الأحترام لكل الأوامر الصادرة من الحكومة المركزية التي تسيطر عليها العرب و ان الكرد ينظرون للعرب كما ننظر نحن في بريطانيا للزنوج السود و القادمين من افريقيا الوسطى...

[٤٧] بۆ مانای دیكتاتۆری بگەڕێوە بۆ مەوسوعەی جودی

کاریگەریەکەی نەدەگەیشتە کوردستان، (تۆماس بوا)ش دەڵێ: ((بەدرێژایی تەمەنی خیلافەت کوردەکان سەربەخۆ بووینە، جگە لە هەندێ دۆخی تایبەتی و هێرشەکانی دەرەکی نەبێ))[٤٨]، ئەو دۆخانەش زیاتر لە سەردەمی ئەمەوی وعەباسی بوە و ئاوا لە کتێبی (الملل والنحل والاعراق) باس کراوە: ((فقد اکتفی معظم خلفاء في دولتين الأموية والعباسية الولاء من القبائل الكردية دون ممارسة حكم المباشر عليهم))[٤٩] دەڵێ: لەو ساتانەش تەنها میرە کوردەکان بە نامەیەك موالاتی خۆیان بۆ خەلیفە ناردووە و بەس، ئەگینا هەر خاوەنی دەسەڵاتی خۆیان بووینە، شێخ الاسلامی عوسمانلی (خواجە سەعەدین) لە (تاج التواريخ) دەڵێ: ((کورد هەر سەربەخۆ بووینە، ئەگەر ئەو کێشە ناوخۆییەیان نەبوایە ئەوا فارس و هەمو جیهان لێیان دەترسا)).

لەسەردەمی عوسمانیش چاکتر بووینە، لە نووسینەکانی محمد امین زکی بەگ هاتووە: ((حکومەتی عوسمانی بە واسیتەی دامەزراندنی بەعزێ حکومەتی مەحەلی قەومی کوردی بە تەواوی لەخۆی ڕازی کردبوو))[٥٠]، ..هەمو ئەوانە لەگەل بۆچونەکەی بەیتار نوری دەرسیمی یەکدەگرێتەوە کەدەڵێ بۆ یەکەم جار لە مێژوودا لە١٩٣٦ دەرسیم داگیرکرا، دوای هاتنی ئەتاتورك، ئەگیناکوردستان هەر سەربەخۆ بووە[٥١]، کوردستانیش وەك وڵاتی تریش لە مێژوویدا چەندین جار دوو چاری پەلامارە مەزنەکانی فارسی و ڕۆم و ئەرمەن و هیلنیستی و تەتەر و مەغۆل بووینەوە، بەڵام پانتایی هەرە فراوانی کوردستان لەمێژوودا سەربەخۆیی بووە، تەنانەت لەو کاتە تەنگانەشدا هەر لەمیللەتانی تری دەوروبەر بە بەرگری تر بووە، هەندێ جاریش دانوستانیان کردووە بەپارە سولحیان کردووە، هەندێ لە میرە ئاقڵەکانی کورد جاری وا بووە بانگی ڕاوێژکارانی کردووە پێی وتونە: ئەو شەڕەی ئێمە لەگەڵ (هۆلاکۆ وەك نمونە) چەندی تێدەچێ؟ ووتوویانە ئەو گوژمەیە، ووتوویەتی دەباشە بەناو بژیوان بڵێن با بەو پارەیە سولحمان لەگەل بکاو بڕۆن، هەڵبەتە زۆربەی ئەو ئیمپراتۆرانەش مەبەستیان لە داگیرکردن زیاترئەوەبوو بگوترێ ئەوە پاشای فلان ناوچە سەری شۆڕ کرد، ئیدی هەروەك باسی هۆلاکۆمان کرد ئەوانە هەمو جیهانی ئاوەدانیان

٤٨- تاريخ الاكراد ص١٩١-١٩٣

٤٩- سعدالدين ابراهيم ص٢٧١

٥٠- خولاسەی تاریخی کورد و کوردستان ل١٦١

٥١- دەرسیم لەمێژووی کوردستان... ل١٥

گرت، له کوردستان وردتر له شا ری هەولێر بەرگریەکی بێ وێنەی کرا بۆیە قایل بوو بەبڕی. ١٠) میسقال زیو ناوچەکە بەجێ بهێڵێ بەسولحەوە[٥٢] زۆر جاریش دەسەڵاتی کوردی پەڕیتەوە بۆ شام ومیسرو چەندین جار حوکمی بەغداشیان کردوە، هەمو ئەوانە یشانەی ئاستی بەرزی دەسەڵاتی سیاسی کوردی بووە، تەنانەت لەدوا قۆناغیش ولەسەروبەری رووخانی عوسمانی ئەوڕاستیە بەدی دەکرێ هەروەك لەو بەڵگەنامەی یە ڕوون تردەردەکەوێ[٥٣]، بە کورتی بە پێی (مەردۆخی) لە دوای ئیسلام تا کۆتایی سەرجەم کورد خاوەنی ٦٤ دەوڵەت و میرنیشینی جیاجیا بووە، کەچی بە پێی (د سیار الجميل) بەهەمو عەرەب سەرجەم خاوەنی (٦٣) دەوڵەت و میرنشین بووینە[٥٤]، پەیوەندی کوردو عەرەب لە قازانجی کورد بوە زۆربەی جار عەشایرە عەرەبەکان چەکیان بۆ کورد هەڵگرتوەو ناویان نرابوو(سواریچە)، یەکەم خراپەی عەرەب بەرامبەر کورد ئەوەبوولەسەرەتای سەدەی بیستەم کە ئیبراهیم میلی پاشا لە ١٩٠٨ ولەدوای یەك هەفتە لە ئینقلابەکەی ئیتحادولترقی شۆرشی کرد، ئەوەبوو عەرەبەکانی شەمەر کە پیشووتر جاشی کوردان بون، هەڵگەرانەوەو بەگەر ئیتحادیە تۆرانیەکان کەوتن وپیکەوە وەك جاش هێرشیان کردە سەر شۆڕشەکە[٥٥]

---

[٥٢]ـ نیکیتین- کورد کوردستان ل٣٠٢

[٥٣]ـ ١٩٤/٢٣١٧ FOملحق في تقرير السيد هيرد، ٣ كانون الثاني١٩٠٩ أقام النادي الكردي في الجامع الكبير حفلا كبيرا.... أن لهذا الاجتماع مغزى واضحا وهو ان النادي الكردي أقوى بكثير من فرع الاتحاد والترقي في ديار بكرالذي بدأيفقد الكثير من اتباعها هنا.وفي الخامس من هذا الشهر غادر حاجي مقصود بيك دياربكر متوجها الى مكة، وحسب المعلومات الموجودة عند روجيدشيان، هناك مؤتمر تعقد هناك لنقباء الاشراف في الامبراطورية العثمانية لمناقشة الاوضاع الجديدة في الدولة العثمانية. وحسب رأي روجيدشيان دروغومان ( مترجم- القنصل الرسمي) أن النمو الكبير للحركة الكردية مؤخرا يعود الى عدم تحمس الكرد للنظام الجديد(اتحادوالترقى)، ليس هناك أي شك بأن الترويج للشريعة يرضي أكثرية الجماهير الكردية الجاهلة....

[٥٤]ـ بروانە کتێبی( بقايا وجذور تكوين العربي الحديث) ص٤١٧

[٥٥]. وثيقة رقم ٢ ( مقتبس من كتاب بيشان اوغلو) حديث عارف أفندي برنجي زادة نائب دياربكر في المجلس الوطني التركي ١٩٠٨ عن حركة ابراهيم باشا الملي... تم تجميع حوالي ٣٥٠٠ جندي متطوع واحتياطي في ديرك للهجوم على ويرانشهر. كانت هذه القوة مشكلة من ٨٠٠ فارس حميدي التابع لكتيبة ٤٧ المؤلفة من أبناء عشيرة طي و٢٠٠ متطوع من الخيالة من عشيرة اضاور و٢٥٠٠ جندي من دياربكر وديرك...ولكن قامت القوات الحميدية لفصيل ٤٤ التابعة لعشيرة قرة قاج، والآلاف من المسلحين العرب من عشائر الشمر والعنزة الهجوم على ويرانشهر وحواليها بأمر من وزارة الحربية ونهبوا ممتلكاتها من الأغنام والحيوانات الأخرى. وفي اليوم التالي قامت قوات الاحتياط من ماردين ودياربكر اقدموا على نهب خيام اليزيدية المذكورة أعلاه والتحق بهم الكر د على امل الحصول على الغنائم...

## دەسەلاتی کوردی و عوسمانی:

بەشێکی زۆر دوو بەشی مێژوویی لە عوسمانی لێك جیاناکەنەوە، بەشی سەلتەنەت[٥٦] و بەشی خیلافەت، بۆیە دەبینین لە شیعرێکی (د فەرهاد پیربال) باسی (عوسمانە شەل)ی دەکرد وەك یەکەم خەلیفە، ڕاستیەکەی ئەوەیە لە سەرەتادا ئەو بنەماڵەی تەغرول بەگ لە دەست مەغۆلەکان ڕایانکردو لە کۆتایی سەدەی ١٣ ـ یان بە ووردتر ئیسماعیل بیشکچی لە کتێبی (النظام فی اناضول الشرقیة ص٣٥٢) دەڵێ: تورك لەسالی ١٢٠٨هاتن لە ئەنادۆل جێگیر بون، دوایی پەلامارەکانیان ڕوو لە ڕۆم بوو نەك میللەتە ئیسلامیەکان، دەسەلاتیان دروست بوو بە (سەلتەنەت) گەیشتە سولتان سەلیم(١٥١٢ ـ ١٥٢٠) لەگەڵ کورد ڕێکەوت، بەوەوە توانی ناوچەکانی میزوپۆتامیا و شام و دوایش میسر لەسالی ١٥١٧بگرێ و لە قاهیرە بەیعەت[*] لە (موکل) دوا خەلیفەی عەباسی وەرگرێ و سەلتەنەتی عوسمانی لە سەردەستی سلیم یاوزلە ١٥١٦/٩/٢٩ بە فەرمی وەرچەرخا بۆخیلافەت، کەواتە ئەوەی ووتویەتی کورد لە ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست (گرێ ی کورتیۆنە)[٥٧] ڕاستی وتوە، ئەوەی ئەو گرێیەی بە خۆشی یان بە ناخۆشی پێ نەکرێتەوە بونی لەو ناوچەیە وەك دەسەلاتی ئیمپراتۆری نامێنێتەوە، بۆیە زۆربەی ئیمپراتۆرەکان ویستویانە لەگەل کورد ڕێکەوتنیان هەبێ، نەك جەنگ و ناخۆشی، هەر لە ڕاستیشدا کورد گرنگ بوە، ڤاسیلی نیکیتین (٣)کەسی لەمێژوو بەکاریگەر هەڵبژاردوە (ئەردەشێر، صلاح الدین، کریم خانی زەند) ئەوانەبەلای کەم دوانیان کوردن، فردۆسیش لە (شانامە)کەی دەلێ رۆستەمی زال کورد بوە، بۆیە لەگەل کورد ڕێکەوتن کراوە لەگەڵ ئەوانی تر(وەك عەرەب بە نمونە) نەکراوە، پێش ئەوەی عوسمانی بێنە ناوچەکە هەمو

---

[٥٦] ـ هەریەکە لە: عوسمان غازی(١٣٥٩-١٣٨٩)، اورخان غازی (١٣٢٦-١٣٥٩)، مرادی یەکەم (١٣٥٩-١٣٨٩)، یلدرم بایزید (١٣٨٩-١٤٠٢)، محمد الجلبی ( ١٤٠٢-١٤٢١)، مرادی دودم (١٤٢١-١٤٥١)، محمد الفاتح (١٤٥١-١٤٨١)، بایزید دودم (١٤٨١-١٥١٢)، ئەوانە سولتان بووینە نەك خەلیفە، لە رۆژی ١٥١٦/٩/٢٩ز سەلتەنەت وەرچەرخا بۆ خەلافەت لەسەردەستی سولتان سەلیم وبە یارمەتی شێخ ئیدریسی بدلیسی

[*] هە ر بۆیەش بەشێك لە یاساناس وفە قیقهە کا ن پێ یا ن وایە (بە یعە ت لە ئیسلا مدا) مە رجی پێنجەمی بوو ن بە دە وڵەتە.

[٥٧] ـ بۆ نا ئیە کانن لە دوای ئە زموو نێکی دوور وو در ێژ لە سە ردە می ئە سکە ندەرەوە تا سە دەی (١٦) ئینجا گە یشتوونە ئەو ڕا ستیەو بلێن کرێ ی ڕۆ ژهە لا ت لە کو ردستا ن دە ست پێ دە کا، پێیان دەوت گرێی کۆرتیۆن.

ناوچەکە لەدەست کورد بووینە، ئینجا لە سەرکەوتنەکانی کورد بەسەرکردایەتی صلاح الدین پیرۆزبایی ودیاری لە لایەن سەلجوقی وعەشایەری عوسمانی ولای تر بۆ ناردوە، هەربۆیەش سەلجوقیەکانیش ڕێکەوتنیان لەگەل دەسەلاتی کورد کردوە، هەروەك ڕێکەوتن نەکەل عوسمانی کاریگەر بوە

## ڕێکەوتنی بەدلیسی ــ سولتان:

ئەو ڕێکەوتنە لە ١٥١٤ لەنێوان (٢٣) میرنیشینی کوردی و سولتان سەلیم بە سەرپەرشتی(**) شێخ ئیدریسی بەدلیسی (گەورە پیاوی کورد) ئەنجام درا، هەرچەندە سولتان سەلیم کاغەزی سپی بۆ شیخ ئیدریس نارد وئەوی سەرپشك کرد هەرچی بۆ کورد ومیرنیشینەکان دەیانەوێ بۆیان بکا و خۆی بنوسی، بەلام شیخ ئیدریس ترسا لەوە نەوەك سەربەخۆیی تەواو ببتە هۆی شەڕی برا کوژی[58]، وای بەباش زانی ڕێکەوتنەکی چڕکراو لە (٥) مادە مۆر بکەن لەگەل سولتان[59]، مادەی(١) بریتی بوو لە سەربەخۆیی تەواوی دەسەلاتی کوردی، مادەی (٢)بریتی بوو لە گوازتنەوەی دەسلاتیان بەمیرات، مادەکانی (٣) و (٤) بریتییە لە (دفاع المشترك) بەزمانی ئەو سەردەمە، مادەی (٥) بریتی بوو لە پشك ویارمەتی ئەو دەسەلاتانە لە (بیت المال)ی گشتی، دوای سولتان ٣ فەرمانی دەرکرد بۆ بەرجەستەکردنی ئەو ڕێکەوتنامەیە، کەواتە ئە و ڕێکەوتنە بایەخێکی یاسایی سیاسی زۆر گرنگی هەبووە، بەداخەوە نووسەر و مێژوو نووسی کورد جار وایە بە سوکی هەلێدەسەنگێنی، کەچی خۆیان لەو سەردەمە هەرچی ڕێکەوتنامەیەکیان کردبێ لەگەل ولاتانی دەوروبەر لە دانوستانەکانیاندا نەگەیشتۆتە ئاستی ڕێکەوتنی سولتان وبدلیسی، سوڕەییا بەدرخان ناوەڕۆکی ئەو ڕێکەوتنەی لە نامەکەیدا لە کانوونی یەکەم ١٩١٨ بەناوی (کۆمیتەی ئیستیقلالی کورد) بۆ بەریتانیا دەرخستوە، تیایدا باسی لەوە کردووە

(**)ـ دد بیّ تیّ بینی ئە و ڕێکە وتنە بکریّ چە ندە کر نگ بووە بۆ کو رد شیخ ئیدر یس لا یە ن نە بووە بە لکو لە ژێرسەرپەرشتیاری ئە و هە ردوو لاڕێکەوتن

[58]ـ بروانە: شەرەفنامە ل٤٥٣، دەقی فەرمانی سولتانیش لەو بارەیەوە لە ل٤٥٥ هەیە

[59]ـ دەقی ئەو خالانەی ڕێکەوتن لەکتێبەکانی: کوردو کورستان فی الوثائق البریطانیة ــ د ولید الحمدی، هەروەها: الکورد والدولة العثمانیة ص٣٦٩ هەیە.

که کورد بەئارەزووی خۆی ئەو ڕێکەوتنە چاکەیان لەگەڵ سەلیم مۆرکردووە[٦٠]، هەر ئەو ڕێکەوتنە بناغەی سیستەمی ویلایات و لامەرکەزی بۆ عوسمانی داڕشت و سەرجەم ٣٢ ویلایەتیان هەبوو، لەدواییەکەی کوردستان بەو ناو و ناوەڕۆکەوە بوو بە ئیالەت لەسەرووی ویلات، لەژێر سایەی ئەو ڕێکەوتنە (لەگەڵ هەورازو نشێویش)، تا سەرەتای سەدەی (١٩) بەردەوام بوو، لەڕاپۆرتی بەریتانی ـ کۆلۆنیل ئیفلینستۆن هاتووە و دەڵێ: ئەو ڕێکەوتنەی کوردو عوسمانی تا ساڵی ١٨٢٦ی خایاند، بووە هۆی دروست بوونی ١١ ئیمارەتی تر[٦١]، دکمال مەزهەر هەمان ڕای هەیە دەڵێ: تا سولتان محمدی دووەم هات لەساڵی ١٨٢٦سیاسەتی نوێخوازی گرتە بەر و ئەو ڕێکەوتنە تێکچو[٦٢]، لە کتێبی (سياسة البريطانية العظمى تجاه مستقبل كردستان ص٢٤) کە لە سەرچاوە جیهانیەکانی وەرگێڕاوەو دەڵێ: ئەو ڕێکەوتنە ٤سەدەی خایاندو کوردیش زۆر قازانجیان لێکرد، ڕاستیشە تا ئەزموونی عەلمانی بە فراوانی پەڕیەوە نێو عوسمانی لەسەرەتای سەدەی١٩ ئینجا ئەو ڕێکەوتنە تێك چوو، وردتر لە سەردەمی سولتان محمودو لە١٨٣٣دوەپیادەی سیستەمی مەرکەزیەتی کرد، ئینجا دەسەڵاتی سیاسی کورد(میری سۆران وبۆتان و..)کەوتنەژێر هەڕەشە، نەك هەر بۆ کورد (میرنشینی عەرەبی مونتەفەك لەخوارووی عیراقی ئێستا) وجەلیلی لە موسل و چەرکەس و هەتا میرنشینە تورکمانیەکانی ئەنادۆلیشیان لە١٨٣٠ بەدواوە لەناو برد، ئەوەش دەرکەوت کەزیاتر دەستی بەریتانیا بوو لەسەدەی ١٩تائەو لامرکزیە نەبێتە بە هێزی میلەتان ولە عوسمانی جیا بنەوەو نێچیرەکەی کەم بکا[٦٣]، لەوکاتەی کەدەسەڵاتی ئەوانەی لاواز دەکرد بەڵام بەریتانیاوفرنسا مەسیحیەکانی لبنانی بە هێز دەکرد، تا لەساڵی ١٨٦٤ز ئۆتۆنۆمی بۆ وەرگرتن، لە پێش تر پێشێلکاری سەربازی ومنافسەی دەسەڵاتی هەبوە لەلایەن هەردوولا، ئەوەی هەرە زەقە لە ڕووی یاسایی کە پێشێلی ئەو ڕێکەوتنە کرابێ لەلایەن عوسمانی بوە، لەو کاتە هات کە ڕێکەوتنی (کوچك کەینارچی) لە نێوان عوسمانی وروسی لە١٧٧٤/٧/٢١

٦٠ـ بڕوانە: بە لگە نا مە کا نی بر یتا نیا ژ: ٩٥/٦٠٨ دە قی نا مە کە ش کر اوە تە کوردی لە کیتبی: کو مە لە وڕێکخراوە کورد لە بە لگە نا مە ی وە زارەتی دە رە وەی بریتا نیا.

[٦١]ـ کەمال مەزهەر ـ کوردوکوردستان لەبەلگەنامە نهێنیەکانی بەریتانی ل٢٢٢

[٦٢]ـ کوردوکوردستان ...ل٢٢٢

[٦٣]ـ بۆ پرسی مەرکەزیەت ویارمەتی بریتانیا بۆمەرکەزیایەتی عوسمانی ومەبەستەکانی بڕوانە کتێبی: سياسة البريطانيا العظمى تجاة مستقبل كردستان ص٣٧

مۆرکرا(پێك هـاتبوو لـه ٢٨ مـادە)، لـەمادەی(٣)بـاس لـەمافی گـەلانی ژێـر دەسـتی ڕووسیاکردبوو، کەچی کوردلەوێ هـەبون باسـی مافیـان نـەکرابوو کـه دەبوایـه بـه پێـی هەردوومادەی (٣ و٤)ی ڕێکەوتنی بدلیس ـ سولتانی باس بکرانایه.

ئەو ماوەیەدا لەگـەڵ(کـرژی و خاویـەکی زۆر) بـەڵام فەترەیـەکی زێرینـی دەسـەڵاتی کوردی بوو، که ناکرێ ئەو بارودۆخه هەمو بدەینه پاڵ پیـاوەتی سـولتانەکانی عوسمـانی، ڕاستیەکەی ئەوەیه زۆربەیان وەك سەرۆکەکانی تری دونیا بە(کوردیشەوە) حـەزیان لـه زاڵ بون و فراوان کردنی دەسەڵات بووە، هەر یەکـه بـۆ ئـەویتر لـه دەرفـەت و بۆسـەبووە تـا دەسەڵاتی ئەویتر لاواز بکاو بیخاته ژێر ڕکێفی خۆی، لەو ڕوەوە دەکـرێ ئـەوەش ئاشـکرا بکەین، کەمەرج نیه ئەو ڕێکەوتنەی بدلیسی سـولتان لـەلای عوسمـانی پێـشێل کرابـێ، ئەگەر بەووردی سەرنج بدەینه یەکەم ڕووبەڕووبونەوە لەگەڵ دەسـەڵاتی عوسمـانی دەبیـنین دەسەڵاتی گیانپۆلاکانی شام بوو، که کوردن، کەواته ئەگـەر بـەو پێوانـه لێـك بدەینـەوە لایەنی کوردیش هاوبەشه له پێشێل کردنی ئەو ڕێکەوتنه، ئەوە پاکانه نیه بۆ چاوچـنۆکی هەندێ خەلیفه، دەسـەڵاتی عوسمـانی گـەلێ جـار بـه نـاوو هەنجـەتی جیـا ویـستویەتی کوردستان داگیر بکا، وەك وڵاتانی عەرەبی و ئەوروپی تەواو نەیتوانیوە، بۆیه بـه ڕێگـەی تری ڕێکەوتن و سەربەخۆیی پێـدان بووینـه، هـەروەك محمـد امـین زکـی بـەگیش دەڵـێ: حکومەتی عوسمانی به واسیتەی دامەزراندنی بەعزێ حکومەتی محەلی قەومی کوردی بـه تەواوی لەخۆی ڕازی کردبوو[٦٤]، جار وایه ئەوەی مێـژوو دەنووسـێتەوە یـان دەخوێنێتـەوە دیمەنێکی بەهەڵه دروستدەکا، ویلایەتێك یان شارێك یان میرنشینێك دووچـاری جـەنگ و داگیرکردن بووە ئەوە هەمو کوردستان نەبووە، چەندین میرنشین لەوساتێدا سەربەخۆ بووە، هەروەك محمد ئەمین زەکی بەگیش دەڵێ: دەسەڵاتەکانی کوردی زیاتر کۆمەڵایەتی بووینـه بەناوی نەتەوەیی و کوردستانی نەبووە، بۆیه ڕەنگه که لـه یـەکێکیان قـەومابێ دڵخۆشـی ئەویتر بووە، بنەمای (مصائب القوم عند قوم الفوا ئد) پەیڕەو کراوە، ئەوە تەنها لـه نێـو کورد نەبوو، مێژووی هەر میللـەتێك هەڵدەیتـەوە هـەمان شـێوازەو ئـەو گلەییانەشـیان لێدەکرێ لەلایەن نەوەکانی سەردەم، تورك و عەرە ب له هەموان زیاتر گلەییان له مێـژوو هەیه و گوایه دەسەڵاتەکان هەر بەناو عوسمانی بووە ئەگینا کورد و چەرکەسـی و خـەڵکی

---

[٦٤]ـ خولاسەی تاریخی کورد و کوردستان ل١٦١

تر دەسەڵاتدار بووینە و تورك تەنها خزمەتکاریان بووە، عەرەبیش ئاوا دەدوێن، بەڵام سەرجەم دەسەڵاتی کوردی بەو ناوە رەنگە لە هەموان زیاتر گەشە سەندووتر بێ پەیوەست بە نیشتمان و گەل (لەرووی یاساییەوە) تووندتوڵ تربووە، بەم شێوەیە:

١ دەسەڵاتەکانی کوردی ئاستی بەرزبووە تائاستی دەوڵەت، بە هەڵە بە هەندێکیان ووتراوە میرنیشین، چونکە کۆڵەگەکانی یاسایی دەوڵەتی تێدا بووە وەك: هەرێم، گەل، دەسەڵاتی سیاسی. ئینجا لە رووی یاسایشەوە خاوەنی (شەخیسەتی قانونی) بووینە مادام لەگەل دەوروبەر و پەیوەندی دوەلیەوە رێکەوتن تەعامولی سیاسی و ئابووریان کردووە.

٢ بەشی زۆری ئەو دەسەڵاتانە ئاڵای سەربەخۆ و جیا لە ئاڵای عوسمانیان هەبووە، هەروەها لە نوێژی هەینی دوعا بۆ میری کورد کراوە نەك خەلیفە، ئەو دوو رەهەندە لەو سەردەمی مانای سیاسی و یاسایی خۆی هەبووە، مەسەلەی ئاڵاو دوعای رۆژی هەینی زۆرگرنگ بووە بۆ سەربەخۆیی وەکلەمادەی(٧)دەستوری عوسمانیش واهاتوە[٦٥]

٣. سکەو پارەی تایبەتی خۆشیان هەبووە[٦٦]، دەستوری سەربەخۆ بەپێی مەزهەب و فتوای ئاینی خۆیان کە شافیعین جودا لەگەڵ مەزهەب حەنەفی عوسمانی کاریان کردووە.

## سەرەتای کێشەی کورد(*) :

بەشێکی زۆر بە پێی واقیعی ئێستا دەروانێتە رووداوەکانی مێژوو و ئەو هەمو پەلامار و ناکۆکیانەی کە لەگەڵ عوسمانی و عەباسی و ئەمەوی و لایەنەکانی تر بە ناکۆکی نەتەوەیی گوزارش دەکا، ئەوەش رەنگی داوەتەوە سەر هەڵوێستی سیاسی و نووسین و ناوەرۆکی مێژوو..باقی چالاکیەکانی ئەو سەردەمە ـ واتە لەدوای سەدەی

---

[٦٥] دەستوری عوسمانی لە ١١٩مادە پێك هاتبوو بەناوی (مشروطیة)

[٦٦] ـ ئەو دەولەت ومیرنشینانەی تا سەدەی ٨ سکەو پارەی خۆیان هەبوە بریتی بووینە لە:هەولێر، ئامەد، بدلیس، جزیرە، حسن کێف، ئەفلات، سنجار، ئاکرێ، ئامێدی، وان، ...سەرچاوە: کوردستان فی القرن الثامن الهجری

(*) یاساناسان پێیان باش نیە زاراوەی (کێشە ی کورد) بە کار بهێنری، چونکە کورد کێشە نەبووە، بەڵکو کێشەیان بۆ کورد دروستکردووە، بۆیە واچاکە دۆزی کورد بەکاربهێنری بەڵام هەر بۆ سانایی تێکەیشتن بەردەوام دەبین لە سەر ئەو وشەیە

بیستەم تا ئێستا ـ، کەچی ڕاستیەکەی وانیە، وەك لەدوایی زیاتر دەردەکەوێ کە ئەو ڕووداوانە (شانازی یان شەرمەزاری) بە ئاڕاستەی پاڵنەری نەتەوەیی نەبووە، بەڵکو زیاتر گوزارش بووە لە: دەسەڵات پارێزی، ململانێی شەڕە دەسەڵات، پاڵنەری ئیمپراتۆریەتی و زاڵ بون، ململانێی چینایەتی و هەندێ جار ئاینی و تائیفی و ڕەنگە خۆی لەقەرەی ناوچەگەریش دابێ بەڵام نەچوویتە قالبی نەتەوایەتی، تەنانەت گەلێ جار سنوری عەشایریشی بڕیە، هۆیەکەش سادەیە ئەوەیە لەو سەردەمی باسی خواسی لە نەتەوایەتی و هەستی نەتەوایەتی و ئینتمای نەتەوایەتی و بیرو ئایدیۆلۆژیایی نەتەوایەتی نەبووە، بۆ هەمو لایەك نەك تەنها کورد. بۆیە پێویستە لە سەرەتا بە کورتی هە لۆەستەیەك بکەین لەسەر سەرهەڵدانی نەتەوەیی لەئەوروپا ئینجا لەجیها نی ئیسلامی.

سەرهەڵدانی نەتەوەیی لەئەوروپا:

جاران وەڵامی ئەوپرسیارە ستونیەی (تۆکێیت؟) ئۆتۆماتیکی ئەوە بوو من فلانە عەشیرەتم، بۆیە دەڵێین پرسیارە ستونیە ئەگینا پرسیاری ئاسۆیش هەبوو لە شێوەی تۆچی؟ من مسیحیم یان ئیسلامم، تۆخەڵکی کوێی ئەوکۆمەڵە پرسیارەی ڕوو لە ح.یونس دەکرێ کە لە (تە ورات ـ یۆنان تهرب الی تریشش) هاتووە: ماهو عملك؟ ومن این اتیت؟ ماهو أرضك؟ ومن أي شعب أنت؟ وانەزانن (شعب) لەگەڵ ئەو مانایەی ئێستایتی بەڵکو لەوەڵامدا دەڵێ: من عبرانیم، فقالت لهم: انا عبرانی)[67]، بەهەمان شێوە(یا قوم) لە قورئان لەگەڵ مانای ئەو(قەوم)ی ئێستای نییە، مانای (قەوم) لەپێش ئیسلام و لەناو قورئان و لە دوای ئیسلام لەو سەردەمە لێك جیایە[68] بەو شێوەیە تۆ کێیت، چیت، لەکوێ، وەڵامی جیاجیای خۆی هەبووە، ئەوەی لێرە مەبەستمانە(تۆ کێیت) لەو سەردەمی لەگەڵ ئێستا لێك جیایە، ئێستا دەڵێ: من فلانە نەتەوەم، وا خەریکە ئەوەش لەژێر سایەی عەولەمە بگۆڕێ، کەواتە لە ئەورووپاش ئینتیمای ستونی تاك زیاتر بە بنەماڵە وعەشیرەت بووە، ناوی نەتەوە نەبووە، وا دیارە ئەوەش پاساو و بارودۆخی خۆی هەیە، سەردەم لە پێدانی ناسنامەی وا بەرپرسیارە، ئەو سەردەم بواری چالاکی مرۆڤ زۆر تەسك

---

[67]ـ بڕوانە: الكتاب المقدس ـ دار الكتب المقدسة بمصر ـ ط ٢٠٠٢ـ ص ٦٤٩(یۆنان مەبەستی یونسە).
[68]ـ بڕوانە: راغب الاصفهاني، یان لسان العرب، ما هو القوم.

بوو، پێوستی به ناسنامەیەکی فراوانتر لەعەشیرەت نـەبوو، بۆیـە ئینتیمـای نەتەوایـەتی نووستبوو، تا کۆمەڵێك گۆڕانکاری گرنگ هاتە کایـەوە لـەژێرخانی کۆمەڵگـە و سـنوری چالاکی تاکیش فراوان تر بوو، ئینجـا ئـەو ئینتیمایـە ورووژاو بـەرە بـەرە سـەری هەڵـدا، وەرچەخانی ئینتمای تاك لە عەشیرەتەوە بۆ نەتەوایـەتی کۆمـەڵێك گۆڕانکـاری ڕیـشەیی لەگەڵ خۆی ڕاپێچا، بەکورتی بەوشێوەیە:

١ لـە ڕووی فکریـەوە - ئینتیمـای ئایـدیۆلۆژی شـان بـە شـانی ئینتمـای ئـاینی هاتەکایەوە، ڕێبازی فەلسەفی مادیش بە تەنیشت ڕێبازی میسالی سەری هەڵدا.

٢ لەڕووی سیاسی - سەرهەڵدانی ڕاڕەوی میکـافیلی سیاسـی، دیمـوکراتی لـەجیاتی سیوکراتی، ئیمراتۆریش بەرەو کۆماری وەچەرخا.

٣. لە ڕووی ئابووری - سەرمایەداری لەناو جەرگەی دەرەبەگی سەری هەڵدا، هـەروەها پیشەسازیش لەناو کشتوکاڵ ئەوەیش بووە هۆی گۆ ڕانی گرنگ لە گوندەوە بـۆ شـار، لـە ڕەوەندەوە بۆ شارستانی... ئیتر سەرهەڵدانی بەرژەوەندی تا یبەتی و چینایەتی.

٤. لە ڕووی کۆمەڵایەتی: ئینتیمای عەشیرەتی وەرچارەخا بـۆ ئینتیمـای نەتەوایـەتی چینی ئاغەش وەرجەرخا بۆ بورجوازی شار، چینی کرێکاریش پەیدا بـوو شـان بـە شـانی چینی جووتیار.

٥. لەڕووی یاساییەوە لەجیاتی کارکردن بە نەریت کارکرا بەیاسا، شریعەت و ئـاینیش بۆ دەستور، ئەنجوومەنی کێشەکانیش بۆ پەرلەمان، لـە دەسـەڵاتی ئـاینی بـۆ دەسـەڵاتی یاسا.

٦. لە رووی ئاینییەوە: دەسەڵاتی ئاینی بەتەواوی وەرچەرخا بۆ دەسەڵاتی عەلمانی.

هەمو ئەوانە بنەماو زەمینەی وەچارخانی ئینتیمای عەشیرەتی وەرچەرخان بۆ ئینتمـاو سەرهەلدانی نەتەوایەتی.

ئەو گۆڕانکاریانە بە بڕیارو ڕێککەوتن نەبوو بۆ هێنانە دی نەتەوایـەتی، بـەڵکو ئـەوە ڕەوتی گەشەی کۆمەڵگەبوو، هەریەکە لـەو گۆڕانکاریانـەش چیرۆك و بەسـەرهاتی دوورو درێژی خۆی هەیە بەدەر دەبێ لە ڕەوتی بابەتەکەمان، بەڵام ئـەو بەشـەی کـە ڕاسـتەوخۆ کاریگەری لەسەر هەبووە هەڵوەستەیەکی لەسەر دەکەین:

جاران ئەوروپاش وەك جیهان دابەش ببـوو بـۆ دەسـەڵاتی ئیمپراتۆرەکـان ڕێککـەوتبون لەگەڵ کەنیسە، ئاینی مەسحیش وەك ئیسلام (تەبشیریە) و (ئومەمیە) قەتیس نـامێینی لەناو یەك میللەت و بە میرات بۆیان بمێیننەوە وەك یەهودی، بۆیە بە زەحمەت نەتەوایەتی لەفەزای وا سەرهەڵدەدا، هەر دەبێ ئەو دەسەڵاتەی لاواز بێت ئینجـا نـۆرەی دێـت، لـەو بارەیەوە چەند بۆچوونێکی جیا جیا هەیە بۆسەرەتای چەکەرەبونی نەتەوایەتی، ئـەوەی بـە زۆری دەگۆتری ئەوەیە کە لەدوای میراتی شارلمان لـە(پەیماننامـەی فیردانـی ٨٤٣ز)* بـۆ کوڕەکانی دۆخی تایبەتی و ناوچەی تایبەتی دروستبوو، بـەڵام نـەبووە نـەریتیك، تـا لـە ڕێکەوتننامـە بـەناو بانگەگـەی (ویـستیڤالیا- ئوکتـوبر ١٦٤٨) ئـەو دۆخـە بـە تـەواوی هاتەدی، لە ڕاستیدا زۆربەی چەمکە هاوچەرخەکانی وەك دەوڵەت، دەستور، عەلمانیـەت، نەتەوایەتی، بۆ ویستیڤالیا دەگەڕێتـەوە، ئـەوەش لـە ئـەنجامی جـەنگێکی ئـاینی و تایفی ٣٠ ساڵە لە نێوا ن ئیسپانیا و هۆلندا و ئەلمانیا(*) لەسەر خاکی ئەڵمانیا کرا تیایدا دان بە سەربەخۆیی ئەو لایەنانە نرا و ئازادی ئاینی بە کاثولیـك و پرۆتـستان و کـالفنی[69] کرا و خاکیش بەپێی تایبەتمەندی دابەشکرا[70]

لە دوای ئەوە هەریەکە و بارودۆخ ڕەوتێکی تایبەتی بـەخۆی وەرگـرت، کنێـسە ئـەو ڕۆڵە مەرکەزیەی نەما هەر تەنها لەسەر خاکی ئەڵمانیای ئێستا بەدەیان کیانی سیاسـی و کۆمەلآیەتی پەیدا بوو بەپێی کتێبی (معجم الحروب) (١٣٠٠). میرنیشینی بچوك پەیـدا بووە، ئەو چوار دەوڵەتەش بەرجەستەبون: بەریتانیا، فەرەنـسا، هۆلەنـدا، ئیـسپانیا، لـەو قۆناغەدا بارودۆخ و کیانی تایبەتی دروست بووە، هەریەکە لـە شۆرشـی فرنـسی ١٧٨٩و هەڵمەتەکانی ناپلیۆن لەلایەك یەکخستەوەی ئەو هـەمو پارچـە پارچـەییەی ئـەڵمانیا لـە ساڵی ١٨٧١ لەلایەن (بسمارك)ەوە هاتنە کایەی ئـەڵمانیا بەبـەردی بناغـەی سـەرهەڵدانی نەتەوەیی دادەنرێ، هەروەك ئیتالیاش لە ١٨٦١ لەسەر دەسـتی (مـازینی)، هەڵبەتـە ئـەو هەنگاوانەش بەرەبەرە دەسەڵاتی کنێسەی پاشەکشێی پـێ دەکـردو دەوڵـەت و دەسـەڵاتی

---

*- ئەو پەیماننامەیە لە ٨٤٣ی ز کرا مەملەکەتی ئەوروپا بەسەر کوڕەکانی شارلمان(لۆسەر، لۆدفیز، شارل) دابەش کرا.

(*) - دەبێ ئاگاداربین ناوی ئەو وڵاتانە دەهێینین ئەوکاتی نەبوینە بۆ سانایی ئەو هەڵەیەدەرۆین.

[69] - ڕیبازێکی تایبەتی نیو مەسیحیەتە (جون کالفن ١٥٠٩-١٥٦٤٩)باوەری وایە سیاسەت وئاینی مەسیحی لیك جیا نیە، بیرو راکـانی لـە کتێبێك بە ناوی(أنظمة الدین المسیحی) دان بەدەسەڵاتی پاپا ناهێنی ودەیەوێ کتاب المقدس چۆنە ناوای پیادە بکا

[70] - بڕوانە: ویل دیورات - قصة الحضارة - ج ٣ ص ٥٣٠

نەتەوەیی جێی دەگرتەوە، تا وای لێهات کنێسە قەتیس ماوە لە ولاتێك بەناوی فاتیکان رووبەرەکەی ١کم گەلەکەش ١٠٠٠ نەفەر پایتەختی رۆما، بەپێی رێکەوتنێکی زۆر سەیر لە نێوان مۆسۆلینی و پاپا لە ١٩٢٩ کرا بەم شێوەیە: مرۆڤ تا کۆرپەلەیە لە سکی دایکی ئەوا هەر ئیش و کارێکی پێویست بوو لە ئەستۆی کنیسەو پیاوانی ئاینی بیت، هەر لەدایك بوو لە ئەستۆی مۆسۆلینی بیت تامردنی، ئەو کاتی تەرمەکەی تەسلیمی کنیسە بکرێتەوە تا قیامەت(*)، بەو شێوەیە ولاتانی ئەوروپا لەسەر بنچینەی ئاین کۆتایی هات و کەوتە سەر بنچینەی نەتەوایەتی.

## نەتەوایەتی و نیشتمانی (Nationalize & patriotic)

نەتەوایەتی لەئەوریا جیاکاریەکی هەبوو زیاد لە رادەی خۆی تێکەڵ بە نیشتمانی بوو، نەتەوایەتی مانای پەیوەستی هاوخوێنی، نیشتمانی مانای پەیوەستی هاولاتی، بەلام سەرەتای هەردووکیان نەتەوایەتیە، هەر یەکە لە هیگل، نیتچە لە (ئەلمانیا) گۆبینۆ، شامبرلن، مازینی ئیتالیا چەمکێ شۆفینی لە فەرەنساو دوای چەمکەکانی فاشی لەئیتالیا، نازی لەئەلمانیا، فالنژیسی لە ئیسپانیا، زیاتر بیرۆکەی نەتەوایەتیان گەیاندە ترۆك وگەرانەوە، بەلام زۆر ولاتی تریش لەسەر بنچینەی نیشتمانی دروست بون، بەشێکیش لە چەند نەتەوەو کەمایەتی ورەگەزی دروستبون لەسەرەتادا دوای بەهۆی پەیرەوی دیموکراسی تەوافوقی وەرچەرخا بۆ نیشتمانی وچەمکی (هاولاتی دەستوری)، لەوانە: لەنەمسا، بلجیکا، هولندا جاران[71]، بێجگە لە ئەزمونەکانی چیکۆسلۆڤاکیاو قوبرس ولبنان وعیراقی نوێ تا رادەیەك ئیماراتی عەرەبیش، یەکەم روو بەروو بونەوەی نەتەوایەتی(ناشیۆنالیزم) لەگەڵ نیشتمانی لە شۆرشی ئەمریکا ١٧٧٦دروست بوو، چونکە ئەو شۆرشە لەسەر بنچینەی نیشتمانی لێك جیا دروست بوو، ئەگینا شۆرشگێرانی ئەمەریکی و داگیرکەرانی بەریتانی یەك نەتەوە (ئینگلیز) بون، بەسەرکەوتنی ئەمریکاو دامەزراندنی دەولەت زیاتر بیرۆکەی دەولەتی نیشتمانی بەرجەستە کرد، بەرە بەرە لەگەڵ

(*)ـ ئەو رێکەوتنەیە موسولینی ـ پاپا بەناوبانگە، وەك دوویرا کەرێك کەوتن لەسەر بەشکردنی مالی و گەورە، کە بەبرا بچووکەی ووت خۆم دەغە وردەکەم لەبەر خاتری تۆ، بامالەکە لەزەمینەوە تاسەربان بۆمن بێت و لەسەر بانیش تاناسمان بۆتۆ بێ هەلبەتە لەنیوان عەلمانی و ئیسلامی کوردستانیش تارادەیەکی زۆر بەرێکەوتنی مووسولینی پاپادەچێت.

[71]ـ بروانە: الدیمقراطیة التوافقیة فی المجتمع متعدد ـ ارنت لیبهارت ص١٢

ـكـتى تيۆرەكانى فاشى و نازى زياتر ولآتانى ئەوروپا دەولـەتى نيـشتمانيان پـەيڕەوكردو چمكى (هاونيشتمان)ى گرتەوە لەدەسـتور و ئـەزمونێكى سـەركەوتوترى دا بەدەسـت و جێگەى كەمايەتى جياجياش لە ولآتا بوودوە، تـاواى لێهـات دەولـەت لەسـەر بنـچينەى ـەرژەوەندىَ هاوبەش ببىَ، هەرچەندە وەك باوە دەوترىَ ئەلمانيا لەسەر بنچينەى ڕەچـەلەك ـروست بووە، فەرەنسا لەسەر بنچينەى بەرژەوەندى هاوبـەش، ئيتاليـا لەسـەر بنـچينەى ـيشتمانى هاوبەش.

نـەدواى جـەنگى جيهـانى يەكـەم ١٩١٤ ـ ١٩١٨ چـوار ئيمپراتۆريـەتى (ئـەلمانيا، ـمسـا، ڕوسيا، عوسمانى) وەرچەرخان بۆ كۆمارى و دەولەتى نەتـەوەيى نيـشتمانى، بـەو ـێوەيە تا سەرەتاى سەدەى بيستەم هەمو ئەوروپا بونە دەولەتى هاوچەرخ (نيشتمانى يـان ـەتەوەيى)، ئەوەى گرنگ بوو لە وەرچەرخانى ئيمپراتۆريەتى عوسمـانى بـوو بـۆ توركيـاى ـوىَ، دەولەتى نيشتمانى لىَ دروست نەبوو، بەلكو دەولەتى نەتەوەيى لىَ دروست بوو، يان ووردو دروستتر بلێين: لێى دروست كرا، ئەوەش بەشێكى تـرى كاريگـەرى گرنگـى بەسـەر سـەرهەلدانى بيرى نەتەوايەتى كوردە.

## بيرى نەتەوايەتى توركى:

لە بنەچەدا عوسمانيەكان خەلكى ناوەڕاستى ئاسيا بون لەدەست مەغۆلەكان هەلآتن بۆ ناوچەكانى ئەنادۆلَ، لەوىَ خۆيان قايم كردو كەمتر ڕووى شەڕيان لەلاى جيهانى ئيـسلامى بوو، بەلكو زياتر ڕوو لە هێزەكانى ڕۆم بوو، بەو شـێوەيە سـەلتەنەتى عوسمـانى دروسـت بوو، لە دواى ڕێكەوتنى شێخ ئيدريسى بـدليس و سـولتان سـەليم لـە ١٥١٤بـووە هـۆى ئەوەى لە جەنگى چالدێران سەركەوىَ و دوايش ناوچەكانى عـەرەبيش گرتـەوە تـا قـاهيرە، (خەليفە متوكل)ى عەباسى هەلآتبووە ئـەوىَ ، متوكـل بەيعـەتى بەسـولتانى عوسمـانى (سـليم) داو ئـيتر سـەلتەنەتى عوسمـانى گواسـترايەوە بۆخيلافـەت، عوسمـانيش وەك ئيمپراتۆريەكانى تر بۆ پارێزگارى لە دەسەلآتەكەى خـۆى تونـد بـووە، جـار وابـووە بـراى خۆيان كوشتووە[٧٢]، چاكو خراپەيان هەبووە شەڕو شـۆريان هـەبووە، پـەلامارى دەسـەلآتى

[٧٢]ـ قتل بايزيد الأول (١٣٨٩-١٤٠٣) أخاه الأصغر وابنه فى سـبيل ذلـك، ومحمد الأول (١٤٠٣-١٤٢١) قتـل أخوتـه الأربعة، ومـراد الثـاني (١٤٢١-١٤٥١) قتل آخاه وعمه، ومحمد الثاني (١٤٥٠-١٤١١) قتل أخاه الرضيع، وسليم باوز (١٥١٢-١٥٢٠) قتل خمـسة من أولاد أخوانـه

دەورو بەریان داوە، بنچینەو پێوە نەوە بووە کەس لەوان سەردارتر نەبێ، بۆیە هەروەك بەگژ ڕۆم وفارس داچووینە بەگژ کوردو عەرەب هەتا تورکیش چووینە، بەڵام ئەوەی نەگۆڕو ڕوونە عوسمانی لە سەرتاوە تا ئەو ڕۆژەی ڕووخان لەسەر بنچینەی نەتەوایەتی و تورك تۆرانی کاری نەکردووە، بۆسەلماندن ودۆزینەوەی ئەوڕاستیەش چەند بەڵگەیەکی سەرەکی بەکاردەهێنین، لەوانە:

١ چالاکیە سەربازیەکانیان ڕوو لە ئەورووپاو نێو وڵاتانی عەرەب بووە بەلای نەتەوەکەی خۆی دانەچووە، کە لە ناوەڕاستی ئاسیا بووەو بریتین لە مەغول وتەتەرو ئازەرو قرغیزوئۆزبەگ وتاجیك و.. بۆیە نەخشەی عوسمانی نەك هەر جووت نەدەبوو لەگەڵ نەخشەی تورخمی تورك بەڵکو زۆر لێك دووربوون.، سەرەنجام وەك ( B ـــ G ancyclobildia)گۆتەنی دەوڵەتی نەتەوەیی بریتییە لەجوتبونی سنوری نەتەوەی بە نیشتمانیەکەی، کەچی دەبینین سنوری وڵاتی عوسمانی نەك هەر جووت بە نیشتمانی تۆرك (تۆران) نەبوو بەڵکو زۆر لێی دوور بوو.

٢. تائەو ساتەش هیچ بەڵگەنامەیەکی عوسمانی نەدۆزراپتەوە لە باس وخواسی تورك و تورکمان و قیرغیزو ئۆزبەك و ئازەری پێچابێتەوە، یان لەبارەی تورکمانی کوردستانی کۆلیبێتەوە، خەڵکێکی زۆر وا تێگەیشتوە بونی تورکمان لە کوردستان و ئەو هەمو ناوە تورکمانیانەی کوردستان بۆعوسمانی دەگەڕێتەوە، کەچی ئەوە دەگەڕێتەوە بۆ هەڵمەتەکانی تەتەرو مەغۆل و تورکمان و سەلجوق و ماوەی سالێکیش دەستیان بەسەر هەمو کوردستان و ناوچەکەداگرت، ئەو ناو و(بونی خودی تورکمانیش لە کوردستان) بۆ ئەو سەردەم دەگەڕێتەوە نەك عوسمانی.

٣. بە پێچەوانەی گومانی خالی ٣٢ تورك لەناو کورد تواینەوە، لە سەردەمی خیلافەتی عوسمانی ڕەگەز و نەتەوەی تر لەناو کورد دەتوایەوە، هەروەك (تۆماس بوا) لە ل١٩٧ کتێبی (تأریخ الأکراد) و ڕاپۆرتی لیژنەی (تەحکیمی موصڵ ص١٤٨) هاتوە:

---

وأخوين، وسليمان القانوني (١٥٢٠-١٥٦٦) قتل بعض أولاده وبعض أحفاده بدسيسة زوجته، ومراد الثالث (١٥٧٤-١٥٩٥) قتل اخوانه الخمسة، ومحمد الثالث (١٥٩٦-١٦٠٣) قتل (١٩) أخا له خنقا قبل دفن أبيه، وعثمان الثاني (١٦١٨-١٦٢٢) قتل أخاه.. وبعضهم خلع وقتل...(الدولة العلية العثمانية- ص٧٧٧)

تورك و عەرەب و ڕەگەزەكانی تر هاتوونە ئەناو كورد تواینەوە، هەروەهالـە ڕاپۆرتـەكانی بەریتانیش ئەوە دەردەخا، كە لەسەردەمی عوسمانی تورك لەناو كورد تواینەوە[٧٣]

٤. لە كاتی ململانێی سـەفەوی و عوسمانی توركمانی كوردســتان وعێـراق و(جگـە لـە تەنەعفەر)زیاتر لای سەفەوی گرت، ئەو دیاردەیە توركمـان و ئازەرەكـانی ئازدربێجـانیش دەگرێتەوە، باقی توركەكانی ناوەڕاستی ئاسیاش ئەگـەر زیـاتر بـەلای سـەفەوی نـەبووبن بێلایەن بون، ئەویش بەڵگـەی هەرەگـەورەی ئەوەیـە مـل ملانێـی ئەوسـەردەم (رەگـەزی ونەتەوەیی) نەبووە.

٥. لەو شەڕو شۆڕنەی دەكرا لە چوارچێوەی یەكەم یاخی بون لـە عوسمـانی بنەماڵـەی گیان پۆلایەكانی شام بون، دووەمیان توركی ئەنقەرە بە ئەمیرایـەتی (قەلەنـدەر ئۆغلـو)، ئینجا دروزو [٧٤]، لێرە دەردەكەوێ ئەو یـاخی بونانـە (یـان ڕاپەڕینانـە ) پەیوەنـدی بـە نەتەوەیی نەبوە، بەهەمان شێوەش لە بەرپا كردنی سیستەمی مەركەزیـەت لەناوەڕاسـتی سەدەی١٩چۆن میرنشینی كورد كۆتایی پێ هێنرا ئاواش میرنشینە توركەكان لە ئەنادۆل.

٦ لەدائیرەی ڕەگەزنامەی عوسمانی ناوی نەتـەوە نەدەنووسـرا، بـەڵكو نـاوی ئـایین و شوێن دەنوسرا، بۆیە كەس كەسی نەدەناسی لەسەر بنچینەی ڕەگەزی و نەتەوەیی، یەكـەم جارلە سـەردەمی دەسـەلاتی ئیتحـادولترقی بەرامبـەر هـەر ئەفـسەرێكی غـەیرە تـورك هیمایەكیان بەرامبەر دادەنا(ع) بۆ عەرەب، (ك)بۆ كورد..

٧. لەنێو دام و دەزگای عوسمانی ڕەگەزی تـورك جێـی شـانازی نـەبوو، زیـاتر مانـای گێلایەتی و بێ ئیدراكی دەدا (بڕوانە: محاضـرات في نـشوء القـو ميـة - سـاطع العـصری، هەروەها دراسات فی الحركة الكوردية المعاصرة – د.عثمان علي ")لە ڕاپـۆرتی ویلایـەتی موسڵیش باس لە ڕەچەلەكی تورك دەكا بە كرێگرتەی عەباسـیەكان وئـیتر ئـەوەی هـاتود وەك جەرمانەكان بەكرێی گرتون، دەڵێت: بۆیە لە نێو عوسمانی كە ناوی تورك دەهات وەك

---

[٧٣]- تقرير المفتش العام الأول حول الأوضاع السياسية الداخلية في ولاية دياربكر، بتليس، وان، هكاري، موش، و ماردين، و ورفة و سعرد - FO. ٣٧١/١٢٢٥٥ يمكن ان نستنتج بان سكان المنطقة تصنف الى صنفين. الصنف الأول هم الكرد ، و الصنف الثاني هم الأتراك الذين حسب المصادر و الوثائق التاريخية المتوفرة فقدوا هويتهم القومية و تكردوا.

رغم ان هذا التميز هو مهم جدا في عملية بناء المشروع القومي و لكن ليس هناك بيانات محدودة عن نسبة الكرد و الترك المتأكردين ضمن ٧٦٥٠ انسان الذين عرفوا انفسهم كاكراد...و استنادا الى احصائيات نفوس عام ١٩٢٧ كان هناك ١٢٥٠٢٧٤ كردي في ٥٣ ولاية في تركية. ان اتراك الذين كانوا في السابق ينتقلون الى المناطق الداخلية في تركية و يعيشون هناك و(معروفين) كالترك يسجلون ككرد.

[٧٤]- بروانە: الدولة العثمانية-عوامل النهوض واسباب السقوط ص٢٧٧

گەمژەو غەشیم سەیر دەکرا تا ١٩٠ ـلەسەر دەستی (بزوتنەوەی عموم الترك[*]) بونە جێـی شانازی[٧٥]، بۆیە کەمتر تورك لە پایەی دەوڵەتی عوسمانی بو زیـاتر سـەربازو فەرمانبـەری سادە بووە، لەوەوە بزوتنەوەی تۆرانی و کەمالی سەری هەڵداو ووتیان تورك لە هاوکێشەی عوسمانی زۆر مەغدورە لە بەرامبەر کورد و چەرکەس و ئەرنائوت و عـەرەب...، پاسـاوی بنچینەیی مستەفا ئەتاتورك لە گوتارەکانی ڕۆژی ١، ٢، ٣\٣\١٩٢٤[*] ئەنجومەنی بـاڵای تورکی ـ پە رلەمان ـ ئەوەبوو، بەوەش سـەرکەوتن وخیلافـەتیان هەڵوەشـاندەوە ئـەگینا دژایەتی لەناو پەرلەمان زۆر بوو.

٨. ئەو کات باوی نازناو بوو، نازناوی وەك: أسد الدولة، الأعـز، ألأغـا، أمـين الدولـة، تاج الملوك، شاهنشاه، الغـازي، القـاهر، المستنـصربالله، ملـك الأشـراف، النـاصـر...بـەڵام نازناوێك نادۆزیەوە بۆنی ڕەگەزی تورکایەتی لێبێت

٩.مادەی (٧١)ی دەستوری عوسمانی (مەشروتیە) هاتبوو: کـە ئەنـدامانی پەرلـەمان (مەبعوسـان) نوێنەرایەتی ویلایەتێك و چینێك و ڕەگـەزێك ناکـەن بـە ڵکـو نوێنەرایـەتی هەمو عو سمانی دەکەن، لە نێـو دەسـتوری عوسـمـانی کـە پێـك هـاتبوو لـە ١١٩ مـادە ووشەیەکی تیا نەبوو چ ڕاستەوخۆ چ ناڕاستەوخۆ بـۆنی ڕەگـەزی لێبێـت، بـە پێـچەوانەی دەستوری ئێستای تورکیا پرە لە مادەی ڕەگەزپەرستی ـ لەگەڵ کۆمەڵێك خاڵی تر.

### کەی تورکایەتی (نەتەوایەتی ـ تۆرانی) سەری هە ڵدا؟

وەڵامی ئەو پرسیارە لە وەڵامی پرسیارێکی تردەست پێ دەکا، ئەویش ئەوەیـە بۆچـی ڕۆژئاوا هەوڵیدا بیری نەتەوایەتی بنێرێتە جیهانی ئیسلامی؟

ئەوەی شارەزای ڕووداو و پاڵنەری ڕۆژئاوای نویٚ بێت لەپاش سیستەمی سـەرمایەداری لەلایەك و لەلایەکی تر سروشتی ئـاینی مەسـیحی بەسـانایی وەڵامـی دەسـت دەکـەویٚ، ڕۆژئاوا لەسەدەکانی ١٦ ـ ١٧لەگەڵ هەڵوەشانەوەی کنێسە هەوڵی یەکخستنی هەڵوێستی ئەوروپی داوە، لە سەدەی ١٧ لە کاتی جەنگی ٣٠ ساڵەکە ئەنجومەنێکی باڵای ئـەوروپی

---

[*] عموم الترك نەبوە ڕەنکە لەگەل ئیتحادوالترقی بێت

[٧٤] ـ تقرير ولاية الموصل١٢٧، ص١٢٩، ص١٣٢

[*] لەو ٣ ڕۆژە لە دانیـشتنی پەرلمانی تورکیا مناقشە لەبارەی هەلوەشانەوەی خەلافەت کرا.

دروستکرد، له سالی ۱۷۱۳کۆنگرەی تریخت پێك هات بۆ دروستکردنی یەکیتی ئەوروپی، ئەو تەقەلایانە شانبەشانی پارچە پارچە کردنی جیهانی ئیسلامی بەردەوام بوو تائەوان بە یەکیتی ئەوروپی ئێستا گەیشتن وجیهانی ئیسلامیش بە پارچە پارچەیی گەیشت، هەوڵ بەردەوامە خەڵکی تر پارچە پارچە بکەن و سوود لەبنەمای (فرق تسد)[*] وەربگرن، تەنها بۆ دابەشی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست نزیکەی ۱۰۰ کۆنگرە کرا، (دین کروسیة) لەکتێبی (وجه اسیا) دەڵێت:ئەو تەقەلایانەی دابەشی عوسمانی وجیهانی ئیسلامی لە(معاهدة کارلو فیجة ۱٦۹۹م )دەستی پێکرد،بەبەشداری (بریطانیا ـ فرنسا ـ روسیا ـ ایطالیا).

هەڵبەتە ئاینی ئیسلام وەك مەسیحی نیە، ئاینی مەسیحی کێشەی لەگەڵ مۆدێرن وسەردەم و عەولەمەو خودی زانست هەبو، فاکتەری گەشەی پێ نەما، هەرچی ئاینی ئیسلامە بە پێچەوانە نەك هەر لەگەڵ ئەوانە دەگونجا بەڵکو پێشڕەوبوو، ئینجا فاکتەری یەکێتی میللەتانیش بوو، بۆیە بە مانەوەی ئاینی ئیسلام وقورئان و خیلافەت (هەروەك گلادیستۆنی سەرۆك وەزیرانی بەریتانی ووتەنی) [77] جیهانی ئیسلامی داگیرو دابەش نەدەکرا، نەدەبووە بازاڕێکی ڕاستەوخۆی ڕۆژئاوا، دەوڵەتی ئیسرائیلیشی لێ شین نەدەبوو، ئەو جۆرە دەسەڵاتەی وەك ئێستای عەرەبیش دروست نەدەبوو.. کەواتە کۆمەڵێك پاڵنەرو فاکتەری جیاجیا، هێزی جیاجیا، بۆ ئەو مەبەستە کۆبونەوەو نەخشەی ناردنی بیری نەتەوەییان ناردە نێو جیهانی ئیسلامی وەك دەروازەی پەرتەوازەیی بۆیان، زیاتریش دوو نەتەوە پێی کاریگەر بون، یەکەم تورك و دووەم عەرەب (ئەوانەش هەر یەکەیان بەپێی شوێنی سیاسی کاریگەریان لەسەر ڕابونی نەتەوایەتی کورد هەبووە، بەپێ ئیبن خەلدوون و د. علی وەردی و هەندێ توێژەری تر پەیوەستی تورك و عەرەب بە بیابان ونەریتی

---

(*) ـ نه و بنه ما یه ده گه ڕێته وه بۆ نه و نا مه یەی (نه سکه نده ر مه کدۆنی) که بۆنه ر ستۆی ما مۆستا ی نا ردو تیا یدا پر سیا ری نه وەی کردبوو نا خۆته و خا کی فا ر سی دا گیر کردووە، به لاّ م چۆ ن بتوانی به سه ر دلّ و ده روو نی میلله ته که ش زا لّ بێت، له وه لاّ مدا نه ر ستۆ بۆی نووسی: په رش و بلاو یا ن بکه و به سه ر یا ن دا زا لّ به..: نامەی ئەسکەندەر: آنه شاهد بایرانشهر رجالا ذوي أصالة في الرأي، وەلاّمی ئەرستۆ ..أشیر علیك برأی هو أبلغ ، فتتفرّق کلمتهم، ویجتمعوا على الطاعة لك، ولا یؤدّی بعضهم إلى بعض طاعة، ولا یتّفقوا على أمر واحد، ولا تجتمع کلمتهم.

[2] ـ بروانە: د کمال مزهر –کوردستان فی سنوات حرب..ص۳۱٦

[77] ـ بنی مرجه –صحوة الرجل المریض ص۲۹٤

بەدەوی وای کردووە ئەو دەمارگیریەی ڕەگەزی خێراتر لەمیللەتانی تری ناوچەکە بووروژێ، بۆیە دەبینین تا ئەو ساتەش کەمتر میللەتانی تری جیهانی ئیسلامی بە بیری نەتەوەی و دەمارگیری کاریگەربووە، ئەو دوو میللەتە زیاتر کەوتنە ئەو داوەو بونە سەر ئێشە بۆخۆیان و بۆ میللەتانی دەورو بەریشیان، عەرەب لەژێر سایەیدا بونە ٢٢ پارچەی ڕیسواو تورکیش ئاوا بچووك بونەوە، ئەو دووەش هەریەکە بەدەوری خۆی کاریگەری هەبوو لەسەر ڕابونی نەتەوایەتی کوردیش.

سەرهەڵدان وگەشەکردنی: لەبەر ئەوەی بیری نەتەوایەتی لەناو زەمینەی عەلمانی چەکەرەدەکا، بۆیە پێویستە سەرەتایەك لەبارەی ڕەگ و ڕیشەی عەلمانی لەناو دەوڵەتی عوسمانی بزانین لە کەیەوەیە، هەندێ سەرچاوە زۆر قوڵی دەکەنەوە بۆ جم وجۆلی ڕۆکسلانی* هاوسەری سوڵتان سلێمان، بەڵام بەڕوونی لەسەردەمی سوڵتان محمود کە ئینکشاریەی لە ١٨٢٦ هەڵوەشاندەوە، سوڵتان عبدالمجید لەساڵی ١٨٣٩ بە نیمچە دەستورێکی هاوبەش (لە بنەماکانی شۆرشی فەرەنسا و شریعەت) قایل بوو ـ ئیتر هەنگاوەکانی عەلمانی پتەوبوو، تاوای لێهات معارەزەیەکی پان و بەرین لە نێو ڕەوشەنبیرە (تەغریبیەکان) واپەیدابوو، توانیان وا پێشان بدەن کەچارەسەری دەردەکانی عوسمانی (کەبەپیاوە نەخۆشەکە ناوزەد دەکرا)** بریتیە لە لاسایکردنەوەی ڕۆژئاوا، نامق پاشا (کە لەدوایدا بوە سەرکردەی تورکیای لاو) دروشمی ئەوەبوو دەردەکانی عوسمانی بە چارەسەریەکانی ئەوروپا بەکۆتایی دێت، تا لە١٨٦٥ز بوە بزوتنەوەی عوسمانی لاو، هەتا ئەو وەختەش هێشتا معارەزەیەکی گشتی بوو، (مراد) پێش سوڵتانیەتی وەك یەکێ لە بنەماڵەی سوڵتان لەگەل ئەو بزوتنەوەیە بوو، لەوێرا بەرەبەرە وەرچەخا بۆ نەتەوەگەری، عوسمانی لاو گۆڕا بەتورکیای لاو(جوان تورك)، ئەو ناوەش هاوشێوەو لاسایی بەریتانیای لاو، ئیتاڵیای لاو، ئەڵمانیای لاو..هتد، بەو مانایەی دەوڵەتێکی تازە لەسەر بنچینەی تورکی دروست بکرێ، ئەو ڕێکخراوە لەناوەکەش وەك ئەوانە مانای دروست کردنی

* ـ نافرەتێکی بلیمەتی ڕوسی ئاین یەهودی بوو.
** ـ یەکەم جار نیکولا قەیسەری ڕوسیا ناوی دەوڵەتە نەخۆشەکەی لە عوسمانی نا.

دەوڵەتێکی مۆدیرنی(جوا ن ـ لاو ـ تازە)لەسەر بنچینەی تورکایەتی نەك عوسمانی، کەواتە عوسمانی لاو چاکسازی تەواوی عوسمانی بوو، بەڵام تورکیای لاو ئینقلاب بوو بەسەر عوسمانی بۆ تورکیایەکی نوێ هەروەك ڕوویدا لە ١٩٠٨، دوایش لە بزوتنەوەکەی ئەتاتورك، تورکیای لاو لەسەر ترازی بزوتنەوەی کاربوناری ئیتالی کە لە سالی١٨٠٧بە مەبەستی دروستکردنی دەوڵەتێکی نەتەوەیی بۆ نابۆلی ئیتالی سەری هەلدا، بە بەئەدەبیاتی شۆرشی فرنساش کاریگەربوو، دوای بە بۆنەی یادی ١٠٠ ساڵەی شۆرشی فەرەنسا لە١٨٩٩/٧/١٤ تورکیای لاو کرا بە (ئیتحاد الترقی) و لەسالی ١٩٠٨ ئینقلابیان بەسەر عوسمانی کرد، لەوکاتیەوە دەسەلاتی خیلافەت وەك مەلەکی دەستوری مایەوە، هەر سێ سەرکردەی ئیتحادی (انور پاشا، طلعت پاشا، جمال پاشا) دەرکەوتن ودەستکاری مێژوو و پرۆگرامی خوێندن و هەمو بەشەکانی عوسمانییان کرد لەقازانجی ڕەگەزی تورك، ئیتر نیازی ئەو بزوتنەوەیە ئاشکراتر دەرکەوت کە تورکایەتیەو لەساڵانی ١٩١٢بەدواوە بە تەواوی بزوتنەوەی تۆرانی باڵی کێشا، یەکەم جار یەکێك بەناوی (نیکیتن ئەلب[٧٨] ـ پێنج بەرگی کتێبی نووسی بە ناوی تۆران)، وەك ئەدەبیاتی نازی و فاشی بەسەر تورکی هەڵدەگوت، ئیتر لەسالی ١٩١٨ بەدواوە دوو دەسەلات دروست بووە، یەکیان بەسەرۆکایەتی ئەتاتورك ئەوەی تریش بەسەرۆکایەتی سوڵتان و دوایی ئەتاتورك زاڵ بوو (لەدوای تایبەت لەو دۆخە بەووردی دەکۆلینەوە)، تورکیای نۆێی لێ هاتەدی. کە کۆمارێکە لەسەر بنچینەی تورکایەتی و عەلمانی[٧٩] دروست بووە هەروەك لە مادەی(٦٦)ی دەستوری تورکیا (ana yasa) واش تۆمارکرا.

لەو تەوەرە کاریگەریەکی زۆری کردە سەر کوردو عەرەب و نەتەوەکانی تر، هەریەکە لە (ساطع العصری) لە (محاضرات فی نشوء القومیة) و(محمدامین زگی بەگ ـ هەر لە پێشەکی کتێبی خولاسەی مێژووی کورد و کوردستان) باس لەوە دەکەن دەڵێن : هەتا

[٧٨] ـئەوە ناوی نهینی بوە ناوە راستەقینەکەی (زیاو ئەلب کۆك)بوە .

[٧٩] ـ دروشمی بریتی بوو لە:(کۆماری ـ نەتەوەیی ـ میلی ـ عەلمانی ـ مۆدێرن ـ شۆرشگێری) سەرچاوە: تاریخ الإسلامی ج١٧ص٤٩

ئنقلاكەی ئیتیحاد الترقی ساڵی ١٩٠٨ نـەكراو بانگێـشەی بـۆ توركایـەتی نـەكرد ئێمـە هەستمان بەكورد بون و عەرەب بونی خۆمان نەدەكرد، بـەڵام پـێش ئـەوەی بێینـە سـەر درێژەی ئەو كاریگەرییە بابزانین لای عەرەب چۆن بیری نەتەوایەتی سەری هەڵدا.

## سەرهەڵدانی عروبە(نەتەوایەتی عەرەبی):

ئەوانەی لەسەر تەوەری توركایەتی ئیشیان كرد لە نێودەوڵەتی عوسمـانی بەشـی هـەرە زۆری لەوانە لە بنەچەدا یەهودی بون، كەچی ئەوانەی لەسەر تەوەری عروبی ئیـشیان كـرد بەشی هەرە زۆری مەسیحی بووینە لەوانە: محمد عـزە دروزە، بنەماڵـەی بـستانی، سـلیم یازچی، جۆرج ئونتۆنیۆس، نجیب عازوری، ناسیف یازجی، میـشیـل عفلق،شـوبلی شمیـل، سلامە موسی...ئیسماعیل مەزهەر، قاسم امین، لوتفی سید،

ئەوانە لەگەڵ جم وجۆڵی (توركیای لاو) جولێنران، مەرج نیە هەمو ئەوجموجۆڵە بدرێتە پاڵ پیلانی ڕۆژئاوا، چونكە مەسیحیی و یەهودیـەكان جیهـانی ئیـسلامی لەهاوكێـشەی نەتەوایەتی بونیان بـەهێزترە نـەك لـە هاوكێـشەی ئیـسلامی عوسمـانی، بۆیـە خۆشـیان ئامادەبون، هەر بۆیەش یەكەم دەروازەی كرانەوە بۆڕۆژئاوا لەلای ئەوان بوودكە بـوە هـۆی پیك هێنانی بیری عروبی نەتەوەیش، یەكەم دەزگای چـاپی لەسـاڵی١٦١٠ هاتـە لوبنـان، یەكەم كۆمەڵەی عەرەبیش بەناوی (جمعیـة الـسوریة العلمیـة) لـە ١٨٥٦، یەكـەم كتێـب كەناوی (امة العربیة) لەجیاتی(امة الاسـلامیة) نوسرا لەساڵی ١٩٠٥ لایەن نجیب عازوری بە ناوی (یقظة الأمة العربیة) بو، ئینجا بتروس بستانیش كتێبێكی بەناوی(جامعة الـوطن العربی) نوسی، هەرچەندە لە (معجم الشامل للمصطلحات الفلسفیة ص٦٦١)دەلی یەكەم كەس ئومەی عەرەبی لە تەرجەمەی (ناشنالی)ئەورویی بەكارهێنا ساتیع الحوسـەری بـوو، لە پیش ئەو بەروارانە لە هیچ كتێبێك ناو و زاراوەی وەك (امـة العربیـة) (امـتي العربیـة والاسلامیة) (وطن العربي الكبیر) نادوزیەوە.

هەلس وكەوتی عەلمانی تۆرانی نێـو دەزگاكـانی عوسمـانی لەلایـەك لەلایـەكی تـریش نەزانی و خراپی و بـێ توانـایی دەسـەڵاتی سـوڵتان و دارو دەسـتەكەی كاردانـەودكی بـۆ نەتەوەكانی تریش دروست كردبوو، عەرەب میللەتێكی زۆر بـون كەچـی دەسـەڵاتیان زۆر

لاواز بوو، له نێو عوسمانی نەدەگەیشتە ئاستی کوردو چەرکەس و ئەوانەی تر، ئینجا لـە نێو ویلایەتەکانی عەرەبیش کەمتر وەك کـورد خـاوەنی میرنـشین و دەسـەلاّتی خـۆجێیی بووینە، چەندین سەدە بوو هەر ژێر دەستە بون، عبدالرحمن بەزاز لە کتێبـی (العـراق مـن الاحتلال الی الاسـتقلال ص٣٠) دەڵێت لەوەتەی سالی ١٢٥٨ز وە عەرەب ژێر دەستەو بێ دەوڵەت ودەسەلاّت بون، فۆرستەر دەڵێ: ٧ سەدە عـەرەب ژێـر دەسـتە بـون[٨٠]، لـە ڕۆژی ٣/تشرینی یەکەم/١٩٣٢ ی بە بۆنـەی وەرگیرانـی عـیراق لـە (عـصبة الامـم) سـکرتێری عوسبە (مسیۆ پۆلتس) وتی: ئەوە چەندین سەدەیە عەرەب ژێر دەستە بوە بۆ یەکەم جار بتوانن سەروەریەکانیان بەدەرخەنەوە.ئەو دۆخە ژێردەستیەیان لـەلای عـەرەب بـە گـشتی هەتا لەلای زانایانی ئـاینی عـەرەبیش کاردانـەوە هـەبوو، لەوانـە (شـیخ محمـد عبـدە)، (عبدارحمن کواکبی) باسی جۆرێك عروبە دەکرا، بە ڕاسـتەوخۆ وەك کـورد ئـەوەی کـاری لێکردن ئینقلابەکەی ١٩٠٨ی نەتەوەگەری تۆڕانی بوو، لە دوای ئـەوە جیـاوازی کـردن و نەتەوەی سەردەست پەیدابوو، هەر بەنمونە جاران لە ڕەگەزنامەی عوسمانی نـاوی نەتـەوەی هیچ لایەك نەدەنووسرا، کەچی لە دوای ئەو ئینقلابە لەبەرامبەر هەر ئەفسەرێکی عەرەب پیتی (ع)دەنووسرا، ئیتر ئەوە تورکەو ئەوە کوردەو ئەوە عەرەب بـووە ناسـنامەی نـوێ و جموجۆڵی سیاسی و فیکری لەسەر دروست بوو، چەندین دەستەو تـاقمی سیاسـی عـەرەب دروست بوو، یەکەمیان الجمعیة السوریة لە ١٨٥٧ دروست بـوو، دوای جمعیـة العربیـة لـە ١٨٧٥، دوای ئەوانەی خوارەوەش دروست بون:

١ـ جمعیة العربیة، ١٨٧٥م لە دمشق وتەرابلس.

٢ـ جمعیه بیروت ـ سالی ١٨٨٠م.

٣ـ جمعیة حقوق المرأة، ١٨٨٠م.

٤ـ جمعیةالسوریة الفتاة ـ ١٨٨٩، سەرۆکەکەی جمیل معلوف

٥ـ جمعیة الوطن العربي دامەزرێنەری خیرالله خیرالله، ١٨٩٥م لەباریس.

٦ـ جمعیة رابطة (الوطن العربي)، نجیب عازوری دایمەزراند لە ١٩٠٤م لە باریس.

٧ـ جمعیة الشوری العثمانیة، مصر ـ ١٩٠٧ ـ ١٩٠٨م.

٨ـ جمعیة الأخاء العثماني ـ ١٩٠٨م لە استانة.

---

[٨٠]ـ بروانە: فورستر- نشأة الدولة العراقیة ص٤٩

٩ـ جمعية القحطانية، خليل حماده دایمەزراند لە ١٩٠٩م

١٠ـ جمعية العربية فتاة لەپاریس، ١٩١١م.

١١ـ حزب اللامركزية، ١٩١٢مم.

١٢ـ جمعية بيروت الإصلاحية، ١٩١٢م، لقەکانی چوە: دمشق، بیروت، حلب، بغداد، البصره، الموصل..

١٣ـ حزب العهد، ١٩١٢م لە نێو ئەفسەرانی عراقییەکان.

١٤ـ جمعية العلم الأخضر، د.فائق شاكر ـ ١٩١٣م.

١٥ـ جمعية العلم ـ ١٩١٤م[٨١]

دوای ساڵی ١٩١٣کۆنگرەیەکی عەرەبی لە پاریس بەستراو بۆسەربەخۆیی جودابونەوە لە عوسمانی، لە هەموی گرنگترو کاریگەرتر ڕێکەوتنامەکەی شریف بن حوسین (باوکی مەلیك فەیسەل و باپیرەی مەلیکی ئوردنی ئێستاش) بوو لەگەڵ بەریتانیا لەڕێی ماکماهون بەڕێوەبەری هەواڵگری بەریتانیا لە مەکتەبی قاهیرە، کە لە ١٩١٦ شۆڕشێکی لێ هەڵگیرسا ناویان ناوە (ثورة العربية الكبرى)، کە لە کاتی جەنگی جیهانی لە عوسمانی هەستان بەهۆی یارمەتی بەریتانی، بە ئامادەبونی (لورانس) ناوچەکانی جزیرەو شامیان لە عوسمانی ستاندو بەریتانیا و فرنساش بەڵێنیان بە (شریف بن حسین) دا، کە لە پاداشتی ئەو چاکە بیکەنە خەلیفە، دوایی لێی پەشیمان بونەوە هێنایانە ئاستی سەرداری هەمو عەرەب، دوای بۆ سەرۆکی دەوڵەتی عەرەب بەشی ئاسیا. ئەو کاتیش لەژێرەوە ڕێکەوتنی سایکس ـ بیکۆ لە ١٩١٦ ئەنجام درا بوو عەرەبیان پارچە پارچەکردبوو، دوایش بەڵێنی بەلفۆریان لە ١٩١٧ جاڕدا و فەلەستین و سنجاقی قودسیش درایە یەهودی، بەڵێنە مەزنەکان خووردبونەوە بۆ پرۆژەی ئیستعماری ناوچەکە و ئەو وڵاتە عەرەبیانەی لێ هاتەدی.

لەنیو عەرەب تاڕادەیەك هەندی ئاسەواری ڕەهەندی فقهی ئیسلامیش بەدی دەکرێ بۆزەمینەیەکی مێژوویی وئاینی سەرهەلدانی ناشیۆنالیزمی وعروبە،کە خۆی لەو تەقەلایانەی سەردەمی ئەمەوی وهەمو ئەو ئیمام وفەقیهانەی پەیڕەوی (فەزلی عەرەب)

---

[٨١]ـ لەو سەرچاوانەی خوارەوە وەرگیراوە: أـ الموسوعة الميسرة.. ص٤٤٤-٤٤٥، ب- دراسات في الوطن العربي.... ص٦٠-٦٤ ج ـ الصحوة.. ص٣١١ دـ الاسلام والعلمانية... ص٨١

دەكەن،تاڕادەیەكی باش یارمەتی بـوە بـۆ ئـەو پرۆژەیـەی بـیری نەتەوایـەتی ،واتـە هـەر مـسیحیەكان بەرپرس نین لەو سەرهەلدانە بەشێكی ئیسلامیش لیی بەرپرسیارە.

ئەوە زۆر بەكورتی باسی سەرهەڵدانی هەردوو تەیاری نەتەوەگـەری لـە نێـو تـورك و عەرەبمان باس كرد، بزانین سەرجەم كاریگەریان چی دەبێ لەسەر سەرهەڵدانی كوردایەتی.

## بیری نەتەوایەتی و كوردایەتی

لەوەو پێش بۆمان دەركەوت كە سەرەتای نەتەوایـەتی لـە سـەدەی (١٨) لـە ئـەوروپا سـەری هەڵدا بەڵام لە كۆتایی سەدەی (١٩) بە ڕوونی خۆی لە دەوڵەت خـەم ڵانـد، هـەر لەوێشڕا بۆ جیهانی ئیسلامی هێنرا، یەكەم جاریش تورك و عەرەب وەریان گـرت لەسـەر دەستی خەڵكی تر، ئەوانەی ئەو بیرە نەتەوایەتیەیان هێنا ناو تورك و عـەرەب لـە خۆیـان نەبوو، پێشڕەوایەتی بۆ ئەو هەنگاوە گوزارش لە پێشكەوتوویی و شارستانی نـەكرد، یـان قازانجیان كردبێ، لە لایەكی تریش مەرج نیە ئەوانەی بە درەنگەوە هاتبنە سەر ئەو بـیر و ڕەوتە دواكەوتوو بن، لە ڕاستیدا میللەتانی فارس و چەركەس و ئۆردۆ و پـشتۆو كـۆری و ژاپۆنی و مالیزی و... تا ئەو ساتەش (واكۆتاییە) ئەو بیرەیـان وەرنـەگرت، بـەڵام كـورد كێشەكەی درێژەی كێشا بۆیە ئەو بیرە نەتەوایەتیەی بە ناوی كوردایەتی بۆ دروسـت بـوو، ئەوەش لە نەشارەزایی و دواكەوتەیی نەبوە، ئەوەتا بەشێكی گرنگـی دامەزرێنـەری بـیری توركایەتی تۆرانی كورد بووینە، (٢)لە (٤)دامەزرێنەرەكەی (اتحاد الترقی) كورد بوینە[٨٢] د.عبدالله جووت، د.ئیسحاق سكوتلی، زیا ئەلب كۆك، عصمت ئینینـۆ...زۆری تـریش، بە پێی هەندێك سەرچاوە ئەوەی بناغەی پەیوەنـدی نێـوان ئـەلمانیاو عوسمـانی ڕێكخـست ولەدوایدا پێكەوە كەوتنە بەرەیەكی جەنگ شریف پاشای كورد بوە، ئەوەی پیتـی لاتینـی هێنا ناو عوسمانی هەر كورد بوو (د.عبدالله جودت) بوو- لە ڕاستیدا ئەو پیاوە مونەزیری توركیای نوێ بوە نەك مستەفا كمال، ڕەوشەنبیرانی تـورك و عـەرەب كـەمێك لـە پـێش سەدەی (٢٠) بیروباوەڕی نەتەوایەتیان لە نێو بلاوبۆوە، ئەوانە بـە هـۆی بـە هاونـەریتی بەدەوی و كەلتووی بیابانی هەردوو لایان جۆرێك لە دەمـارگیری خێڵـەكیان هـەر هـەبووە

[٨٢]- دامەزرینەرەكان بریتی بوون لە:دعبالله جودت لە عربكیر لەدایك بوە، ئیسحاق سكوتلی لە دیاربەكر، ئیبراهیم تەمۆ- تەرنانوتی، محمدرشید چەركەسی.

ئەگەر بەهای ئایین ئامادە نەبوویێ وەك (ابن خلـدوون) و (د.علـی وەردی) گۆتـەنی، لـەو سەرو بەریش ئایین زۆر لە پاشەکشە بوو، بۆیە دیـان فاکتـەرە شـاقوولیەکان بـە خێرایـی جێی فاکتەرە ئاسۆییەکانی گرتەوە، ئەو بیرە نەتەوەییەی تورکی و عەرەبی لـە داهێنـانی عوسمانی نەبوو، تەواو بە پێچەوانەی تێگەیشتنی بەشێك لە ڕەوشەنبیرانی کـورد، بـەڵکو ئەو بیرە دژ بە عوسمانی بوو، لە هەردوولا لێی یاخی بـون و بـیری تورکایـەتی لـە سـاڵی ١٩٠٨ ئینقلابیان بەسەر عوسمانی کرد و لە دوای ئەو مێژووە هەر بـە نـاو (عوسمـانی) و (سوڵتان) مابون، ئەگینا دەسەڵات لە دەست ئەنوەر و جمال و تەلعت بوو کە هەرسـێکیان سەرکردەی ئیتحاد الترقی بون، ئەوانەش پێش تر بە ناوی تر بەشێك لە عەرەب و کـوردی عەلمانیان هەڵخەڵەتاند بوو لە گەڵیان بون، تا لە دوای ئینقلابەکە ئینجا دیـوی ناوەوەیـان دەرکەوت کە تورکایەتیە، محدامین زەگی بەگ لە پێشەکی کتێبە بەناوبانگەکی (کوردستان و کورد) دەڵێ ئێمە هەستمان بە خـۆ نـەدەکرد کـوردین هـەتا ئیتحادیـەکان بانگەشـەی تورکایەتیان نەکرد، ئنجا ئێمەش بە خۆ کەوتین، لە نێو کورد لە کاردانەوەی دا لـە لایـەن (شێخ عبدالقادر شمزینی، ذو الکفل، ئەمین عالی بەدرخان، ...)* حزبێکی هاوشێوەیان لـە ١٩٠٨/١٠/٢ دروستکرد بەناوی (تعالی وترقی کورد جمعیتلەر)*...، بـەلام هێـشتا زۆر سەرەتا بوو، بەلام دەتوانین ئەو مێژووە بکەینە بنچینە و هەمو لایەك لە بەڵگەنامەکانی بەریتانی[٨٣]، عوسمانی، ئەرمەنی، ڕووسی، فرنسی...... هەروەها مێژوو نووسە کوردەکان هەر هەموی لایەنگری محمدامین زەگی بەگ دەکەن، کە سەرەتای بیری کوردایەتی لـە نێـو ڕۆشەنبیران لە دوای ساڵی ١٩٠٨ چەکەرەی کردووە، لە پێش ئەو مێژووە کێشەو نـاکۆکی و چەوسانەوەی پێچەوانە، داگیرکاری و داگیرکاری پێچەوانە......هەبووە، سـوڵتان و والی

*ـ لەبەلگەنامەی بریتانی ل٦٦ ی کتێبی(کوردوکوردستان لە بەلگەنامەی بریتانی)ئەوناوانەی تیـادا هـاتوە: مـستەفا بابـانزادەی کۆنـە والی حیجاز، دووکوری سـیدعبـدالقادر، حەمدی بەگی موتەسەریف، میجەر سلیمانی نوری بەگ، میجەر ئەمین بەگ، د. محمدشوکری بەگ، عەلیشان بەگ لە ئەشرافی قۆچگیریە، علی مستەفای بـەگزادە، مـەولانزادە رفعـت بـەگ، پرۆفیـسۆر محمدنوریـە فەنـدی، جنـرال حمـدی پاشـا، جنـرال مـستەفاپاشای یامۆلکی ـ سـەرۆکی ئەودادگایە بوو، کە حوکمی لەسێدارەدانی بۆ کمال ئەتاتورك دەرکرد.

* لە سالی ١٩١٨ درێژەیان بە حزبێکی هاوشێوەی ئەو ناوە داوە.

[٨٣]- FO ١٩٥/٢٣١٧ ملحق في تقرير السـيد هيرد، ٣ كانون الثاني١٩٠٩ ...أن لهذا الاجتماع مغزى واضحا وهو ان النادي الكردي أقوى بكثير من فرع الاتحاد والترقي في ديار بكرالذي بدأ يفقد الكثير من اتباعها هنا.وفي الخامس من هذا الشهر غادر حاجي مقصود بيك دياربكر متوجها الى مكة، وحسب المعلومات الموجودة عند روجـيدشيان، هناك مؤتمر تعقد هناك لنقباء الاشراف في الامبراطورية العثمانية لمناقشة الاوضاع الجديدة في الدولة العثمانية. وحسب رأي روجسيدشيان دروغومان ( مترجم-القنصل الرسمي) أن النمو الكبير للحركة الكردية مؤخرا يعود الى عدم تحمس الكرد للنظام الجديد(مەبەستی ئیتحادولتەرەقیەم ع).

خراپ هەبووە، چەوسانەوەی چینایەتی و دەسەلاتی زۆرداری و بگرە تالان و سووتان هەموی هەبووە، هەم کورد پێی کراوە هەم کوردیش لە گەڵ خەڵکی تر کردوویەتی و جاریش وابوەخۆیەخۆش کراوە، عەشیرەتەك لە گەڵ عەشیرەتەکی تر، جێنشینێك لە گەڵ یەکی تر، سەردەمەکە وابوو نەك هەر بۆ کورد بۆ هەمولایك، ئەوەی نەبوو داگیرکاری و چەوساندنەوەی نەتەوەیی بوو، بە سەرباز و بەرپرسەکانی عوسمانی نەدەوترا تورك، ئەگەر زۆر رقیشیان لیّ بونایە لە ناو کورد بە سەربازەکانیان دەووت (جل خوارەکان) یان (گورگە بۆرەکان)، بە فەرمانبەرە گەورەکانیشیان دەووت ئەفەندی، کۆمەڵێك خەڵك (ئەفەندیەکان) بە رۆژئاواو ئەزموونەکانی ئەڵمانیا و ئیتاڵیا و شۆرشی فەرەنسی کاریگەر بون، هەر لەسەر ئەو بنچینەیەش سیستەمی عوسمانیان لە ویلایاتەوە ودرچەرخاندە سیستەمی ناوەندی و زیاتر گرنگی بەو والیانە درا، کە باجی چاك کۆدەکەنەوە، بووە سەردەمی مادیایەتی و لەو دەمیش دەستکرا بە ململانێی ئەڵمانیا و بەریتانیا و فرنسا و روسیا لەسەر میراتی عوسمانی، قەیسەر ناوی لە عوسمانی نا (دەوڵەتە نەخۆشەکە)، دەوڵەت و دەسەلات لە سەر بنچینەی نەتەوەی سەر دەست و بن دەست نەبوو، بۆیەش لە بەرامبەردا هەست و خەیاڵی نەتەوایەتی و بیری نەتەوەیەتی و... نەبووە، لە ناو کوردیش تا سەرەتای سەدەی بیستەم لە شیعر و گۆرانی و نووسین و جموجوڵی سیاسی و کۆمەلاّیەتی ئەو رەهەندە بەدی ناکەی، راپەرین و میرنشینەکانیش بە ناوی کوردایەتی نەبووە، نمونەیەکی یەك لاکەرەوە هەیە سەبارەت بە (شەریف پاشا) چونکە ئەو پیاوە هێمای کوردایەتی بووە، نوێنەری کورد بووە لە نێو دەوڵەتی، کە باسی شریف پاشا دەکریّ وەك وایە باسی مێژووی کودایەتی بکەی، ئەو پیاوە لەو کاتەی گۆڤارێکی دەردەکرد بە ناوی (مشروتیە)[٨٤] لەو گۆڤارەدا باسی بابەتی گرنگی کۆمە لاّیەتی و سیاسی و مێژوویی تیادا کراوە، کەچی هەتا ژمارە (٤٧)ی ساڵی١٩٠٣ئینجا ئەو باسانەی کوردایەتی وکێشەی نەتەوایەتی کوردی هاتۆتە نێوگۆڤارەکە، بەشێکی زۆری ئەکادیمیای کوردی پێیان وایە شریف پاشا یەکەم دامەزرێنەری کوردایەتی دەوڵەتی

[٨٤]ـ مەشروتیە ئەو بزوتنەوەیە بوو کە داوای دەستوری بۆ دەوڵەتی عوسمانی دەکرد وەك ئەوروپا.

سەرانسەری کوردستانە[٨٥]، گومان لەوە نیە یەکەم دامەزرێنەری بیری کوردایەتی شێخ عبید اللەی نهری بوە لە کۆتایی سەدەی ١٩ ـ کە خۆی لە داوای یەکخستنی سیاسی کوردستان دەنوێنێت (وەك بسمارك وئەلمانیا)، بۆدلنیایی بروانە ئەو بەڵگەنامەیەی بەریتانیا لە خواروو[٨٦]، هەرچی بەڵگەنامەکانی ئەرمەنیە بە جۆرێکی تر لایەنگری ئەو راستیە دەکات، تیایدا هاتوە کە(یەکێتی کورد) بە رابەرایەتی (شێخ عبیداللە نهری) لە سالی ١٨٨٠دروست بووە بۆ یەکخستنەوەی هەمو کوردستان[*]، لەلایەکی تریش لەسالی ١٩٠٧لەشاری دهۆك لەمالی شێخ محمد بریفکانی لەکۆبونەوەیەکی فراوان (پەیوەندی کورد) بەسەرۆکایەتی شێخ عبدالسلام راگەیەنراو تیایدا خواستەکانی کوردی بەرجەستەکرا لە (٧)مادە[٨٧]، لەوەسیەتنامەکانی شێخ سعیدی نەورەسی ( گەوهەری ٣ ) لەبارەی نەتەوایەتی هاتوە: (نەتەوایەتی کومەهندەك خسلەتێن تایبەت هەنە وهەروەسا یێن بەری مەمال ئاڤاهی کرین هەردەم بیرهاتنێن وان وجا کی وقەنجییێت وانماینە لدەڤ مە، دڤێت ئەم گیانێ نەتەوایەتیێ *بپارێزین هەتا گیانێ وان جانەمەرگان دگورێت وان دا دلخوش و کامەران بیت) [٨٨]، هەر هەموشیان داوای جێ بە جێ کردنی تەواوی شریعەتی ئیسلامیان دەکرد، ئەوانە مانیفیستی کوردایەتین بە هەمو پێوانەیەك.

---

[٨٥]ـ تەنانەت د فەرهاد پیربال توێژینەوەیەکی هەیە بەناوی( شەریف پاشا ١٨٦٥-١٩٥١) دەڵێ شەریف پاشا یەکەمین سیاسەتمەداری کوردبووەکەداوای دەولەتێکی سەربەخۆی بۆ کورد کرد

[٨٦]ـ لقاء تأريخي فريد مع الشيخ عبيدالله النهري ٤٤١ \ ٦٠ FO تبريز٩ \ ١٠\\١٨٨١ وزارة الخارجية، رقم الملف ٦٠\\٤٤١ رقم الوثيقة ٢٣، سري للغاية سيدي ايرل اوف كرانفلسبق وان أشرت في المذكرة رقم ٢٧ إلى موضوع الشيخ عبيد الله...، ثم سألت الشيخ عن برنامجه فأجاب بأنه يريد إعادة تنظيم كردستان وتوحيده تحت حكمه كأمارة مستقلة. وقلت متسائلا وكيف يفكر الشيخ في تنفيذ هذه الفكرة فرد الشيخ قائلا" لن الحكومتين الايرانية والعثمانية أساءتا معاملة الكرد" آما بالنسبة للحكومة العثمانية فأنها لم تقدر حسن نواياه وأدعى الشيخ أيضا أن كردستان تحتاج إلى إدارة تحكمها بقبضة حديدية وليس هنالك شخص يفهم هذه الحقيقة اكثر منه....

[*] لە سالی ١٨٨٠ لەنەهری کۆبونەوەیەکی فراوان بۆ سەرۆك عەشیرەت وکەسایەتیەکان کراو تیایدا شێخ گوتارێکی ئاینی وسیاسی خوێندەوە ووتی: پێش نزیکەی ٦سەدە عوسمانی دەسەڵاتی گرتۆتە دەست بێ دەنگ بووین بەڵام ئیستا بەرەو عەلمانیەت دەڕوا حەتمەن تێك دەچێت، کاتی یەکگرتمان هاتوە، بەو شێوەیە کۆمەلەی کورد لەوێ راگەیەنرا، بۆ زیاتر بڕوانە: جلیلی جلیل ـ الإنتفاضة و خالفين ـ صراع علی کوردستان و الكورد والدولة العثمانية.

[٨٧ ٨٧]ـ بروانە: (الكورد والدولة العثمانية ــد محمدزكي برواري) و (امارة بهدينان ــصديق الدملوجي) - هەر لەوێش نامیەکی ٧ مادەی وەك داخوازیەکانی کورد بۆ ئەستەمبۆل دەنێرن وکۆپیەکیش بۆ شریف پاشا دەنێرن.

[*] تێبینیەکی گرنک: مانای کوردایەتی هاوتای عروبەو تورکچیایەتی نیە، چونکە ئەوان کێشەی نەتەوەییان نیە نیشتمانیان پارچە پارچە کرابێت وڕۆژانە زولمی نەتەوەیی ببینن، بۆیە ئەوەی ئەوان رەگەزپەرستیە ، رۆژێك لە رۆژان کورد رزگار بێت وکوردایەتی بکا ئەوە دیمەنی ناشرینەو ئەو کاتی ئەو نوسینەی ئێمەو ئەو وەسیەتنامەی سعید نەورەسی وزۆری تر دەبتە پالپشت بۆ رەگەزپەرستی ئەگەر مێژوو نووسێکی زۆر وورد قۆناغی خۆی بۆ دیاری نەکا.

[٨٨] سێ گەوهەرن لە شێوەی ٣ وەسیەتنامەی شێخ سعیدی نەورەسی کەلە ژ:١ ی رۆژنامەی (تەعالی وتەرەقی) سالی ١٩٠٨ بلاوکرایەوە، هەر ئەو سالیش (یەکێتی محمد)ی دروست کرد.

دوای ئەوا بە سود وەرگرتن لەیاسای (الجمعیات)ی عوسمانی، کە لە ١٩٠٩/٨/٣ دەرچوو کۆمەڵێك ڕێکخراو دەستە و کۆمەڵەی سیاسی سەریان هەڵدالە کتێبی (ناسنامەی حزبە کوردستانیەکان) تۆمارمان کردوون، هەروەها لە بەڵگەنامەکانی بەریتانی وفرنسی ناوی دەستەیەك لە کۆمەلا و ڕێکخراوی سیاسی و نا سیاسی تر بەو شێوە هاتوە: کۆمەڵەی عەزم (دەڵێ لە سالی ١٩٠ز دروست بووە لە ئەستەمبۆل بەسەرۆکایەتی ئەحمەد رامز، بەشێکی تردەلین لەقاهیرە دروست بوە بەسەرۆکایەتی فکری دیاربەکری، جەمعیەتی نەشری مەعاریفی کورد لە١٩١٢\٧\١٧ئەستەمبۆل ـ عبد الرحمان بدرخان، کۆمەڵەی ئیرشاد لەئەرزەرۆم، کۆمەڵەی دیفاع لەهەژاران، کۆمەڵەی برسیان، کۆمەڵەی دۆستایەتی کورد، جەمعیەتی هێڤی کورد، کوردستان محبی جمعیتلر ـ د نوری دەرسیمی، کۆمەڵەی جیهانزانی، کورد ئیستقلال قومیەتی، جەمعیەتی تەعالی کورد – لە ١٢\١٧ \١٩١٨بە سەرۆکایەتی شێخ عبدالقادر دروست بوو لەگەل تەعالی وترەقی سەروو جیایە ئەگەر چی بە هەمان ناوو سەرکردەش بووە، لە بەڵگەنامەیەکی تر باسی کۆمەڵەیەکی تر بەناوی(هاوکاری)لەخوارەوە بەڵگەنامەکەیە[٨٩]، لەگەل زۆری تر.

[٨٩] ـ میثاق مقترح للجمعیات الكردیة تم صیاغة المشروع التالي في بیت اسماعیل افندي في رواندوز و بمساعدة الأشخاص التالیة في صیف عام ١٩٢٦ سید طه أمین افندي رواندوزي {الذي كان في اجازة}محمد أفندي، مدیر المالیة (رفضت وزارة الداخلیة اعطاء الرخصة لفتح الجمعیة على اساس المیثاق المقترح أدناه:

١ـ یسمى الجمعیة "هاوكاري - {Sociability - جمعیة التضامن الأجتماعي} تسعى الجمعیة لنشر التثقافة المتعلقة باللغة الكردیة، و التأریخ الكردي و تطویر الشخصیة الكردیة و تمتنع من الخوض في السیاسة.

٢ـ تكون مقر الجمعیة حیثما تتواجد اكثریة الأعضاء و ان الأعضاء المتواجدین في المناطث الأخرى یتبعون توجیعهات المقر.

٣ـ تكون الهیئة الأداریة في المقر و في مراكز الفروع من:

## سەرەتا یەکی کوردایەتی ( کوردو عوسمانی لە جەنگی جیهانی یەکەم )

پێشتر باسی ئەوەمان کرد کە عوسمانی لە سەرەتای سەدەی (١٩)دەستی کرد بە تەقەلای هەڵوەشاندنەوەی دەسەڵاتە ئۆتۆنۆمی و کۆنفیدڕالیە جیاجیاکانی سیستەمی ویلایات، ئەوەش لە چوارچێوەی ئەو ئەزموونە عەلمانیە ناوەندیەی لە ئەوروپا هێنایەوە، هەروەك بە راشکاوانەتر لە وەسیەتەکانی مدحت پاشا هاتبوو : لەو فەترەیەی ١٨٥٠بە دواوە باری ئیداری وسیاسی دەوڵەتی عوسمانی بەپێی نەخشەی کاری نوێیان گۆڕا، لە ١٨٥٦دەوڵەتی عوسمانی چوەناو خانوادەی ئەوروپی ...لەگەل زۆر هونگاوی تر[90] ئەگینا پێش تر لامرکزیەکی ڕاستەقینە هەبوو، سەرجەم ویلایەتەکانی عوسمانی گەیشتبوە ٣٢ ویلایەت، ویلایەتەکانی وان و بەدلیس و ئامەد و....یەکخران و بە ناوی ئیالەتی کوردستان، دوا نەخشەی عوسمانی کە لە١٨٩٣دوایش لە سالی ١٨٩٦لە سەردەمی عبدالحمیددەرچووە لەسەر ویلایەتەکانی کوردستان چوار بە ئەندازەی عێراق دیایکراوە لە ژێر ناوی کوردستان، کەواتە لەسەردەمە هەرە خراپەکەی عوسمانی چ لەسەر نەخشە چ لەسەرزەمین کورد ئامادەییەکی فراونی هەبووە، سەرۆکی ئەنجومەنی دەوڵەت شێخ عبدالقادر شمزینی کورد بوو، پێش تریش شێخ عبیداللەی باوکی دووەمین کەسایەتی نێو عوسمانی بوو لە دوای سوڵتان، دووەمین دەوڵەمەندی عوسمانی ئیبراهیم میللی پاشای کورد بوو، وەزیری دەرەوەی سعید پاشای باوکی شریف پاشای خەندان بوو، جەنرال هارندی پاشا وەزیری جەنگی عوسمانی بوە[91]، داودپاشاحەیدەری ج وەزیری دەرەوە، حمدی بابان و ئیبراهیم حیدری وزۆربەی شیخ الإسلامەکانی عوسمانی لە بنەماڵەی حیدری وبەتلیسی

[89]ـ لەوەسیەتەکانی مدحت پاشا بۆ ئیتحاد تەرەقی بە جێ هیشتبووئله وەسیەتنامەی ٢ وەدا دەلێ توندو تیژو میکافیلی بن لە سیاسەتا، لە ٧دەلێ خۆ ئامادە بکەن بۆ ئینقلاب... دەقی ئەو وەسیتنامانە لە کتێبی (بنی مرجه ـ صحوة الرجل الریض ص٥٥ بخوێنەوە، مدحت پاشا بەو بیرو بۆچونە لە سالی ١٨٧٢دوە بوە سەدری ئەعزەمی عوسمانی.

[90]ـ بروانە: الإسلام والعلمانیە.. ص٣٢

[91]ـ حركة الشيخ سعيد بيران:١٩٢٥ وزارة الخارجية الأميركية الوثائق الدبلوماسية السرية المنشورة الشرق الأوسط العراق -منشورات الجامعة الأميركية، القنصلية الأميركية ، أثينا، يونان ٢٤ -ايلول -١٩٢٥ الموضوع:تحركات معادية للترك في كردستان الى وزير شؤون الخارجية، واشنطن يشرفني ان ابعث اليكم المعلومات التي وصلتنا من الجنرال الكردي هارندي باشا، وزير الحربية السابق في الدولة العثمانية الذي نفاه مصطفى كمال بعد استلام السلطة و ذلك لكونه خصما قويا،

[92] ئەو ئیبراهیم حەیدەریە ٣ جار هەڵبژێردرایەوە بۆ پۆستی شیخ الإسلام..بروانە: القومیە الکوردیە و دعبدالله جودت ص٧٧

ونامێدی بووینه، حمدی پاشا ڕابەری گـشتی دەریـایی بـوو، داود پاشـا جێگـری بـەحری گشتی بوو، مستەفا زیهنـی والی حیجـاز بـوو حـسین فکـری پاشـا والی کۆسـۆڤا بـوو، نەسەردەمی سولّتان سلیمانی قانونی ابـو سـعوده فەنـدی ٣٠سـال شـیخ لئیـسلام بـوو، نەهەندی سـەرچاوە باس لەوە دەکا هەریەکە لە شیخ عبیدالله ونەورەسی و مـالی بـدرخان پالیوراوی جینشینی خیلافەت بون[٩٢]، پەیکەری عوسمانی کەمتر تورکی تێـدا بـوو، هـەتا نیتحاد والترقی لە ١٩٠٨ دەسەلاّتیان گرتـە دەسـت ئنجـا تەقـەلای ئـەوەیان کـرد ئـەو پەیکەرە بە تورك بکەن، لازاریف وکۆتلۆف زۆر بە ووردی باس لـەو فـشارانە دەکـەن کـە نەلایەن ئیتحادی وتۆرانیەکان خرابوە سەر سولّتان عبدالحمید تا کـورد لـە عوسمـانی دوور خاتەوە[٩٣]، دەتوانین بلّێین لە بارە هەرە خراپەکانی عوسمانیش باری سـیاسی کورد بـاش تـر بوو (بەبەراورد) لەگەل دوای نەمانی عوسمانی، زل هێزە جیهانیەکان وەك دڕنـدەی گۆشـت خۆر لە دەرەوەی عوسمانی وەستابون بۆ ئەوەی بکەوی و دەسـت بـە خـواردنی بکـەن(وەك سولّتان حەمید گۆتەنی)، بەلاّم بەریتانیا زیاتر لـە هـەموان دەیویـست بـە تـاقی تـەنها دەست بەسەر میراتەکەی دابگرێ و بە هەمو جۆرێـك دەسـتی خـستبووە نێـو عوسمـانی، ڕۆلێکی گرنگی بینی لە سەرکوتکردنی دەسەلاّتی کوردی بە تایبەتی هێرشە هاوبەشەکەی میری سۆران ومحمد پاشای میسر بۆ سەر ئەستەمبۆل، لە هند ئـەو مەسـەلەیە لـە بـارەی بەریتانیا بە ناوبانگ بوو دەیانوت، ئەگەر دوو ماسی لە ناو دەریا بە شەڕ هـاتن دەسـتی بەریتانیای تێدایە، قونسولّەکانی دەسەلاّتی زۆریـان پەیـداکردبوو، بەرپرسـانی ئیتحـاد و الترقی دەستیان کرد بە ویلایەت و زەوی فرۆشتن، ڕووباری دیجلـەیان بـە ٢٥٠٠٠٠لـیرە[٩٤] فرۆشتە (کۆمپانیـای لینجـی) بـەریتانیا، ویلایەتـەکانی ڕوملـی (ئـەوروپا) بـەرە بـەرە فرۆشران، ویلایەتی تەڕابلوس (لیبیای ئێستا)بە دوو بەلەمی جەنگی فرۆشرایە ئیتالیا[٩٥] و دوایش دوو بەلەمەکەشی نەدانێ، ..لەو سـەردەمە کـڕین و فرۆشـتنی ولاّت بـە تـەواوی هەبوو، ئەمریکا فلیپینی بە ٢٠ملیۆن دۆلار لە ئیسپانیا کـڕی، سـەرەتای ئـەمریکا ١٣

---

[٩٢]ـ بروانە:مشاهیر کوردوکوردستان نەمین زکی بەگ، معجم اعلام الکورد،
[٩٣]ـ بروانە: دراسات فی الحرکة الکوردیة المعاصرة ..ص١٤٨-١٥٠
[٩٤]ـ لە چەند سەرچاوەیەك هاتوە دەلّێن : کاتێ کیشە دروست بوو لە نیوان بریتانیـاو عوسمـانی ناخۆ عوسمانیـەکان (ئیتحادیـەکان) دیجلـەیان فرۆشتوە یان فورات، لە تۆمارگەکەی خۆیان نەیان دۆزیەوە، بەریتانیا ئەوەی قۆزتەوەو وتی هەردووکم کڕیە.
[٩٥]ـ بروانە: الإسلام والعلمانیة واثرهما فی نشأة الدولة العراقیة الحدیثة ص٧٧

ویلایەت بوو زۆربەی ئەو ویلایەتانەی ئێستا بە پـارە کڕیـەوە، یەهودیـەکانیش پـێش تـر هەوڵیان لە گەڵ سلطان عبدالحمید دابوو بۆ کڕینی فلستین بەڵام قایل نەبوو، یەهودیـەکان هەندە چاوترسێن ببون لەو جەنگەی سەلاح الدین ئاواش عوسمـانلی لاواز ببـوو نـەدەوێران دەست بۆ فلستین درێژ بکەن، بەڵکو دەیان ویست لە ڕێی کڕین وفرۆشتن بگەنـە فلـستین، لەنامەیەکی[96] سوڵتان عبدالحمید بۆشیخ محمود ئەبو شامە دەڵێ: یەهودیـەکان بـڕی ١٥٠ ملیۆن لیرەی[97] ئینکلیزیان پێدام تا سنجاقی قودسیان پـێ بـدەم، دوای ئیتحادیـەکان بـە ٤٠٠،٠ لیرە قایل بون[98]

لە ئەورووپاش شەڕە ملەیەکی زۆر بەهێز لە سەربازاڕ و موستەعمەرە دروست ببوو، لە گەڵ کۆمەڵێك هۆی تر ناکۆکیەکی خەست لە سەرەتای سەدەی (٢٠)دەستی پێکردبوو، تا لە ڕۆژی ١٩١٤/٦/٢٨ بە دەستی (پرانسیب)ی قوتابیەکی سربی کە سەر بـە ڕێکخـراوی (لەپ ڕەشەکان) بوو جێنشینی نەمسا (ئەرشـیدۆك فرنـسیس فردینانـد) وهاوسـەرەکەیان تیرۆر کرد و شەڕ هەڵگیرسا، ئەڵمانیا و نەمسا و مەجەر و بولگاریا ودوایش عوسمانی لـە

---

[96] ـ دەقی نامەکە: بسم الله الرحمن الرحيم الحمد لله رب العالمين وأفضل الصلاة وأتم التسليم على سيدنا محمد رسول رب العالمين وعلى آله وصحبه أجمعين والتابعين إلى يوم الدين.

أرفع عريضتي هذه إلى شيخ الطريقة العلية الشاذلية، إلى مفيض الروح والحياة، وإلى شيخ أهل عصره الشيخ محمود أفندي أبي الشامات، وأقبل يديه المباركتين راجيا دعواته الصالحة. بعد تقديم احترامي أعرض أني تلقيت كتابكم المؤرخ في ٢٢ مايس من السنة الحالية، وحمدت المولى وشكرته أنكم بصحة وسلامة دائمتين. سيدي: إنني بتوفيق الله تعالى مداوم على قراءة الأوراد الشاذلية ليلا ونهارا، وأعرض أنني مازلت محتاجا لدعواتكم القلبية بصورة دائمة. بعد هذه المقدمة أعرض لرشادتكم وإلى أمثالكم أصحاب السماحة والعقول السليمة المسألة المهمة الآتية كأمانة في ذمة التاريخ:

إنني لم أتخل عن الخلافة الإسلامية لسبب ما، سوى أنني _ بسبب المضايقة من رؤساء جمعية الاتحاد المعروفة باسم (جون تورك) وتهديدهم _ اضطررت وأجبرت على ترك الخلافة. إن هؤلاء الاتحاديين قد أصروا وأصروا علي بأن أصادق على تأسيس وطن قومي لليهود في الأرض المقدسة (فلسطين)، ورغم إصرارهم فلم أقبل بصورة قطعية هذا التكليف، وأخيرًا وعدوا بتقديم ١٥٠ مائة وخمسين مليون ليرة إنجليزية ذهبا، فرفضت هذا التكليف بصورة قطعية أيضا، وأجبتهم بهذا الجواب القطعي الآتي: (إنكم لو دفعتم ملء الأرض ذهبا - فضلا عن ١٥٠ مائة وخمسين مليون ليرة إنجليزية ذهبًا فلن أقبل بتكليفكم هذا بوجه قطعي، لقد خدمت الملة الإسلامية والمحمدية ما يزيد عن ثلاثين سنة فلم أسود صحائف المسلمين أبائي وأجدادي من السلاطين والخلفاء العثمانيين، لهذا لن أقبل تكليفكم بوجه قطعي أيضا). وبعد جوابي القطعي اتفقوا على خلعي، وأبلغوني أنهم سيبعدونني إلى (سلانيك) فقبلت بهذا التكليف الأخير. هذا وحمدت المولى وأحمده أنني لم أقبل بأن ألطخ الدولة العثمانية والعالم الإسلامي بهذا العار الأبدي الناشئ عن تكليفهم بإقامة دولة يهودية في الأراضي المقدسة فلسطين... وقد كان بعد ذلك ما كان، ولذا فإنني أكرر الحمد والثناء على الله المتعال، وأعتقد أن ما عرضته كاف في هذا الموضوع الهام، وبه أختم رسالتي هذه. ألثم يديكم المباركتين، وأرجو واسترحم أن تتفضلوا بقبول احترامي بسلامي على جميع الإخوان والأصدقاء.

يا أستاذي المعظم لقد أطلت عليكم التحية، ولكن دفعني لهذه الإطالة أن نحيط سماحتكم علما، ونحيط جماعتكم بذلك علما أيضا.

والسلام عليكم ورحمة الله وبركاته.

في ٢٢ أيلول ١٣٢٩

خادم المسلمين

عبد الحميد بن عبد المجيد

[97] ـ پارەی بریتانی ئەو کاتیش جونەیهی ئیسـتەرلینی بوو، لە دەقی نامەکەی تیۆدۆر هرتزل بۆ سولتان باس لە (جونەیە) دەکـاو دەڵـێ سـاڵانە یەك ملیۆنت دەدەینێ ئەگەر بە پێی یاسای نێو دەوڵەتی سەربە خۆیی بدەیتە یەهودیەکانی فلستین.

[98] ـ لە کتێبی (اليهود والدولة العثمانية) دەڵێ: فلستین بە دوو سینیە لیرە فرۆشرا.

لایـەك بـون، ولاتـی تـەوەریان پـێ دەگـۆتن، فرنـسا و بـەریتانیا و ڕوسـیا و... وولاتـی هاوپـەیمانیان پـێ دەگـۆتن، دوای دوو دڵیـەكی زۆر (ئـەنوەر پاشـا) بڕیـاری دا لـە ١٩١٤/١٠/٢٩ بچێتە ناو جەنگ لە قازانجی وولاتی تەوەرە بێ ئەوەی پـرس بـە سـوڵتان بكات، یەكەم كاردانەوە بەریتانیا لە ویلایەتی بەسـرە هێرشـی هێنایـە سـەر عوسمـانی و هێزەكانی لە بەحرەین ڕا بـەرەو كەنـداو جولانـد، لـە ڕۆژی ١٩١٤/١١/٧ شـێخ الاسـلام خەیری فەندی و ٣٠زانای گەورە لەگەل محمدرەشاد فتوای جیهادی دا، لە هەر سێ ویلایەتی موسڵ و بەغدا و بەسرە وە لامی ئیجابی لەو شوێنانە درایەوە كە مەدرەسـەی ئـاینی لێ هەبوو، لەسەر ئەو بنچینەیە لە ناوچە بەدەویەكانی (سونەنشین) زۆر بە كەمی بە پیل ئەو بانگەوازەی شێخ الاسلام هاتن، بەلام لە كوردستان و لە ناوچـەكانی سـامرا و كازمیـە و نەجەف و كەربەلا... زۆر بە گەرمی هاتن، هێزێكی مەزن بـە سـەرۆكایەتی شـێخ محمـود چووە خـواروو شـان بەشـانی هێزەكـانی زانایـانی نەجـەف وكەربـەلا، لـەوێ ڕووبـەڕووی هێزەكانی بەریتانیا بونەوەو خەریك بون شكستی پێ بهێنن جنرال تاوزندیان بەدیل گـرت، ئەو هۆسەیەی عەرەب لەو سەركەوتنانە هات بەسەر شێخ (ثلثی الجنة لهادینا وثلث للشیخ احمد واكرادة)، ئەگەر خیانەتی عەشایرە عەرەب و ئەفسەرە عەرەبەكانی وەك نوری سـعید و مولود مخلص و علی جودت ئەیوبی وتالب پاشا (میری بەسـرە) و شـێخ خزعـل (مـیری محەمەرە) نەبوایە ئەوا خەریك بوو بەریتانیا دەربكەن لە (دارالاسلام ـ وای پـێ دەووتـرا)، ئەو خیانەتانە وای كرد (سلیمان عسكری پاشـا)ی سـەركردەی عوسمـانی خـۆی بكـوژێ، ئینجا ئەو هاوپەیمانیەی شـیعە و كـورد و عوسمـانی هەڵوەشـایەوەو هێزەكـانی كـوردیش گەڕایەوە، بە تایبەتی دوای ئەوەی هەواڵی ئەوەیان پێگەیشت كـە هێزەكـانی ڕووسـی بـە سەركردایەتی باراتۆف لە چەند لایەك نزیكی كوردستانی خوارووش بوویتەوە، لـەو كـاتی علی ئیحسان پاشا بە ناوی دەوڵەتی عوسمانی لە ڕۆژی ١٩١٧/١٠/٣بروسكەیەكی فەرمی بۆ شێخ محمود نارد و لە میزۆپۆتامیا و كوردسـتان شـێخی كـردە میراتگـری عوسمـانی و مومتەلەكانی عوسمانی بووە موڵكی ئەو حكومەتیشی دروست كرد.

سەرەڕای ئەو سەلبیاتانەی عوسمانلی بـەلام وا دیـارە سـەركردە كوردەكـان بـە وردی زانیویانە عوسمانلی بۆ كورد باشترە نەك تەیاری عەلمانی تـۆرانی (ئیتحادیـەكان و دوایـش كەمالیەكان)، بۆیە زۆر دیفاعیان لە عوسمانلی كردووە، شیخ سعیدی نەوردسی دوعای بـۆ

خەلیفە دەکرد، شریف پاشاش لە دواییەکان ستایشی سولّتانی کردو لە ١٩٢٠ /٤/٢٣ بروسکەی ڕێزی بۆ سولّتان لێدا لە بەرامبەر هەلّوێستی چاکی بەرامبەر کورد، هەر لە دوای ئینقلابی ئیتحادی دژ بە عوسمانی بە یەك هەفتە هەلسا بە شۆرش، دوای ئەو لە ١٩١٢ ـ ١٩١٣ ملا سلیم وشیخ شهاب الدین وشیخ عبدالسلام بارزانی لە ١٩١٤[٩٩]،

شۆرش و ڕاپەرینیان کرد دژ بە ئیتحادیەکان وداوای گەرانەوەی خیلافەتیان کردوە، بە ڕوونتر ئەوەبوو دژ بەو کارەی ئیتحادیەکان بوو کە ویلایەتیان دەفرۆشت و... زیاتر ئەوانە چارەنووسی کوردیان لە عوسمانلی دەدۆزیەوە نەك لە تۆرانیەت، ((شێخ عبدالقادر) لەگەلّ ڕۆژنامەی (ئیقدام) تۆمارکردووە بەجوانی ئەوە ڕونکراوەتەوە کە شێخ عبدالقادر و ئاینیەکان چیان دەوێ[١٠٠]، پێیان وابوو لەچوارچێوەی دەولّەتی عوسمانی ئۆتۆنۆمی وەرگیرێ بۆ ماوەیەك وەری دەچەرخێننە سەربەخۆیی تەواوی کوردستان[١٠١]، بۆ زیاتریش بڕوانە دەقی نامەکەی شێخ عبدالقادر بۆ فەرەنسا، کە لە ١٩٢٠/٦/٢٥ نوسیتی[١٠٢] زیاتر شێخ عبدالقادر و (ئەوەی ناویان نرابوو کوردە ئەستەمبۆلیەکان) ڕۆلیان بینی هەم لە ڕێی هادی پاشا(نوێنەری سولّتانی عوسمانی) هەم خۆشی ڕاستەوخۆ لە هەمو لایەك لە تەقەلادا بوو، ئەگەر بە ووردی سەرنج بدەینە نامەکەی عبدالقادر –کە بەناوی سەرۆکی کۆمەلّەی کوردی ناردووە بۆ کۆنگرەی ئاشتی لە ١٨ ـ ١٩٢٠/١/٢١ دەبینین ناوەڕۆکی مادەکانی (٦٢، ٦٣، ٦٤)ی زۆر لێ نزیکە[١٠٣]، شیخ عبدالقادر پێی وابوە ئەوەی لەڕێی

---

[٩٩] ـ لەکتێبەکەی مسعود بارزانی - البارزاني والحركه الكورديه.. وەك نوسەرە عەلمانیەکان بەهەلەداچودو دەلێ شیخ عبدالسلام لەگەل عوسمانی ڕووبەڕوو بونەوە، لەڕاستیدا بەپێچەوانەیە لەگەل ئیتحادوالترقی ڕووبەڕوو بوونەوە هەروەك لەو بەلگەنامەبریتانیە ڕوون تر باسی دەکا:
نائب القنصلية البريطانية وان. ١٣/آذار١٩١٤/ ١٩٥/٢٤٥٨ REF: FO

اتخذ شيخ البارزان و باستمرار موقفا عدائيا من حكومة الاتحاد و الترقي و كانت منطقة نفوذه مركز الأظطرابات، يقال بان عبد الرزاق بدرخان، الذي كان يخطط ضد الترك في العام الماضي قد انضم الى شيخ البارزان و لعل هذا هو السبب الذي دفع الحكومة باتخاذ قرار بقمعه...ئینجا ئەو والیەی کە دذایەتیشی کرد والی موسل بەناوی (سلیمان نەزیف- ئەندامی ئیتحادوتەرەقی بوو) کەواتە کرا دوژمنایەتی عوسمانی وشیخ عبد السلام

[١٠٠] ـ کۆمەلّە ڕێکخراوە کوردیەکان لەبەلگەنامەکانیبەریتانیاو فرنساله بەلگەنامەی ژ:٤٤ و ل١٥٩ بلاوکراوەتەوە

[١٠١] ـ بۆ ئەم مەبەستە بڕوانە: کورد لە بەلگەنامەی بەریتانیا ژمارە: ٤٠، ٥٠٦٨/f٠.٣٧١ بۆ وەزارەتی دەرەوە ١٩٢٠/٤/٨

[١٠٢] ـ کۆمەلّە ڕێکخراوە کوردیەکان لەبەلگەنامەکانی بەریتانیاو فرنساله بەلگەنامەی ژ:٤٤ول١٥٩ بلاوکراوەتەوە

[١٠٣] ـ دەقی نامەکە لەکتێبی(کۆمەلەو ڕیکخراوە کوردیەکان ١٩١٨-١٩٢٣له بەلگەنامەی بریتانی وفرنسی) - ل١٥٨-١٥٩ بەلگە نامەی ژ:٤٤ ، ئەو کاتی شریف پاشا بەپێی (کریس کۆچیرا) لە ڕقی ئەوەی بەشێکی کوردستان درابوە ئەرمەنەکان لە ١٩٢٠/٤/٢٧وە

عوسمانی دێت ڕاست ودروست ترە لە بەڵێنی بێ بنەمای ئەتاتورك وفروفێڵی بەریتانیا(بروانە ئەوبەڵگەنامەی خواروو)[١٠٤]، ئەو پرۆژەیە لەلایەن فرید پاشای سەرۆك وەزیرانی دەوڵەتی عوسمانی (ئەستەمبۆل ـ سوڵتان واحدالدین) بە فەرمی مۆرکراوە[١٠٥]، لەبەڵگەنامەیەکی تریی بەریتانی (FO.٣٧١/٥٠٦٧) هاتوە دەڵێ: فەرید پاشا لایەنگیری دروست بونی دەوڵەتی کوردی کردوە لەرێی ئۆتۆنۆمی ناوەخۆ، (دیڤید ماکدۆناڵد)یش هەر وای بۆچوەلە کتێبەکەی خۆی(مێژووی نوێی کورد ـ بە ئینگلیزیە) بۆیە لەنێو کوردیش بەوهۆیەوە بونە دوو بەش، هەریەکە لە شێخ عبدالقادر شمزینی و شریف پاشا و شێخ سەعید پیران و نەورەسی و هەندێ لە بەدرخانیەکان و هەندێ دەستەی تری کوردی و ئایینیەکان[١٠٦] پێیان وابوو ئەوەی مستەفا ئەتاتورك دە یکا فروفێڵ و تاکتیکە و دەستکەوتەکانی کورد لە ئەستەمبۆل و پەیماننامەی سیڤەر هەڵدەوەشێنێتەوە[١٠٧]، بەشەکەی ترپێیان وابوە لە دەوڵەتی تورکیای نوێ بە سەرکردایەتی ئەتاتورك باشترە، وەك لە بەڵگەنامەی بەریتانی لەلایەن جێگری مەندوبی سامی بەریتانی لە١٨/٣/١٩٢٠ ١٩٢

---

نیستقالەی دابوو ( القضیة الکوردیة فی المؤتمرات الدولیة.هەروەها لە (کوردو کوردستان لە بەلگەنامە نهێنیەکانی حوکمەتی بریتانی – د کمال مەزهەر)دا هەمان بەرواری نیستقالەکەی دیاری کردوە.

[١٠٤] استنبول ١٨ نیسان / ١٩٢٠ برقیة رقم/ ٤٠١

الی \ وزارة الخارجیة

اشارة الی برقیتكم

..تعقد الموقف بالنسبة القضیة الكردیة وذلك لحصول الانشقاق داخل النادي الكردي الذي أشرت الیها في برقیتي رقم ٣٠٢....

یتهم البدرخانیون والاخرون من النخبة الكردیة السید عبدالقادر افندي بعدم كونه متعاطفا مع المشاعر القومیة الكردیة وذلك لما صدر منه بعض التصریحات. یدعي عبدالقادر بأنه یقف كلیا مع توحید كردستان أداریا ولكن یكن الكثیر من الأحترام للخلافة ولا یری ایة فائدة في الاستقلال السیاسي. یقول عبدالقادر أنه بحاجة الی الدعم البریطاني ویقدره وأنه متی ما شاءت الحكومة البریطانیة ودعمت استقلال كردستان فأنه مستعد آن یعلن الاستقلال ولكن في الظروف الحالیة لیس هناك ایة حاجة لأثارة كل هذا الضجیج حول الاستقلال الكامل. یبدو أن عبدالقادر رجل صادق وأنه بفضل مكانته الدینیة أكثر الشخصیات الكردیة شعبیة وأن خصومه عبارة عن مزیج من القومیین الكرد الذین یحملون افكارا مثالیة ودعاة القومیة التركیة من الذین یعملون للمصالح القومیة.

[١٠٥] د عثمان علی ـ دراسات فی الحركة الكوردیة المعاصرة ص٣٢٤، هەروەها بروانە: بەلگەنامەی بریتانی Air٤١٢ تەلەگرام لە ١٨/٤/١٩١٩.

[١٠٦] ـ دیڤید ماكدۆنال ناوی لەوانە نابوو كوردی ئەستەمبۆلی.

[١٠٧] ـ بۆ ووردتر بروانە: ئەو بەلگەنامەیەی بریتانی چۆن عبدالقادر شەمزینی ئامۆژگاری ئەفەندی وسەرۆك عەشیرەتەكان دەكا كە دوای ئەتاتورك نەكەون مذكرة حول السید عبدالقادر الشمزیني وسمكو

من المندوب السامي البریطاني / القسطنطینیة (٢٠ مایس ١٩٢٢)

وأشتكی السید عبدالقادر بأن كل المناشدات التي قدمها للحكومة صاحب الجلالة لم تلق آذاناً صاغیة و أنه فشل في كسب ثقة جلالته. وكرّر، كما فعل ذلك عدة مرات، بأنه كان في موقع یساعده علی السیطرة علی الكرد في الولایات الشمالیة الشرقیة، لو أعطیت له الفرصة للتحرك. وأكد هذه المرة وبثقة علی قدرته باقناع سمكو للعمل وفق مصالحنا وأضاف أنه لا طائل من الاعتماد علی أشخاص مثل مصطفی باشا وآخرین الذین یحومون هنا وهناك. هؤلاء لیس لهم تأثیر حقیقي علی الكرد.

ناردوه و دەڵێ (ناحەزانی سەید عبدالقادر بریتین لە دەستەیەکی زۆر لەیەك نەچوو هەی ئەوتۆیان تێدایە زۆر حەزیان لە سەربەخۆیی کورد نیە، زیاتر لەگەڵ ئەتاتورك ڕۆیشتون)[108،109]، بەشێك لە عەلمانیەکان وەك هەنوکە ئاسا داوای بەرژەوەندی شەخسیان کردوە، لەگەرمەی شۆرش (وەك لازاریف)دەڵێت: هەندێك لە بنەماڵەی بدرخانیەکان خەریکی دانوستان بون لەگەڵ ئیتیحادیەکان داوای پارچە زەوی گەورەو ٢٠لیرەی کردبوو[110]، ئەو بارو دۆخەی عەلمانی کورد لە کوردستانی خوارووش هەروابوە[111]، جگە لەوەش لە چەندین سەرچاوەی تریش وادەردەکەوێ کە عەلمانیە کوردە نیشتمان پەروەرەکانیش یەکڕا نەبووینە، بەشێکیان بە فرنساو شۆرشەکەی سەرسام بوە، بەشێکی تر بە بەریتانیا، بەشەکی تر بە ئەزمونی ئیتالیاو ئەلمانیا، هەندێکیش بە بلشفی، لەهەموان ترسناك تر بەشێکیان بە کەمالی، دوای بە (نازی)[112]...، لە پێش تریش سیستەمی

---

[108] ـ دەقی ئەو بەلگەنامەی لە پێشوتر لەنیجابیەکانی سێڤەر بلاوکرایتەوە.

[109] ـ بڕوانە: بەلگەنامەی بریتانی ژ: ٦٢٠/م -١٧٤٢ لە ل٧٧ی کتێبی کوردو کوردستان لە بەلگەنامە نهێنیەکانی حکومەتی بریتانیادا بلاوکرایتەوە.

[110] ـ دراسات فی الحرکة الکوردیة المعاصرة ص٢٥٢

[111] ـ Orandale House FO ٣٧١/١٣٤٢٥٥

July- ١٨ -, ١٩٥٨ ٨ Eaton Castle

.... ما ذكر اعلاه كان ملخص الحديث الذي دار بيننا لمدة ١٥ دقائق حيث حاولت الكثير بأن ادفع بأن يقول شيئا قريبا من الحقيقة ولو مرة واحدة. رغم انه لم يكن مرتاحا من الكثير من الأسئلة الا أنه أجاب بمنتهى التهذيب. أن هذا الشخص وأمثاله الكثيرين اناس غير موثوقين بهم ومستعدون بأن يبيعوا أنفسهم لمن يقدم لهم العرض الأكبر. ان هؤلاء الانتهازيون من الكرد لم يستطيعوا ان يطوروا لحد الأن ولو خطوة واحدة نحو الاستقلال ولكنهم شوكة كبيرة في جسم السلطات الحكومية. يدعي هؤلاء بأن نفط كركوك هو نفطهم وطبعوا معايدة على شكل كارت لتجسيد هذا الأدعاء ، سبق ،ان أرسلت نسخ من الكارتات الى مستر سام ويقول هؤلاء بأن بأمكانهم أن يفجروا السدين الكبيرين في الشمال اذا اردوا....

[112] ـ العلاقة بين الكرد والمانيا النازية

FO ٣٧٠/٦٧١ - تقرير الاستخبارات البريطانية ـ فرع العراق للأسبوع المنتهي في ٢٧ـ٥ـ ١٩٣٩

...استنادا إلى المعلومات الواردة إلينا من مصادرنا الموثوق هناك نوع من التوتر في الأجواء في سليمانية وان حركات أنصار الإنكليز مراقب من قبل أعضاء الحزب النازي في المدينة. علما أن إبراهيم أحمد( أحد الناشطون في سليمانية) والمدعو رمزي المتصرف في المدينة وقائمقام جم جمال يعد من مؤيدي الحزب النازي في المدينة المؤيد لألمانيا وهؤلاء على صلة وثيقة بفانق طابو المؤيد للحزب النازي.

٥) أخبر الشيخ محمود أبنه الشيخ لطيف الذي كان يزوره في بغداد بأن أبنيه: الشيخ رؤوف والشيخ بابا علي قد خدعا إلى درجة بحيث بدا يعملان لصالح الحزب النازي في بغداد. ولكن طلب الشيخ محمود من الشيخ لطيف عدم الإفصاح بهذه الحقيقة لأحد لأنها تسوء إلى سمعة العائلة.

٦) استنادا إلى مصدر موثوق بأن الشيخ كريم من عبد ولان والشيخ حسام الدين النقشبندي يعملان لصالح المعسكر الألماني بين الكرد. ويعمل كريم كلاري الجاف أيضا لصالح المعسكر الألماني....

جامیعەی ئیسلامی کە لەلایەن سولتان عبدالحمید و شێخ سعیدی نەورەسی و جمال الدین ئەفغانی وئەبوهودا رفاعی، ئەسعەد قەیسەرلی لە مدینە، شێخ فەزلەلا لە ملیبار، شیخ محمد زاهیر لە ئەفریقا، حسێن بن علی لە مەکە..، بریتی بوو لە کۆمەڵە دەوڵەتێکی کوردستانی و عەرەبی و تورکی و چەرکەسی و ئەفغانی... لە چوار چێوەجامیعەی ئیسلامی (عوسمانلی)*، بەڵام دیسان ئیتحادیەکان هەڵیان وەشاندەوە، بۆیە کورد ترسی زیاتر لە ئیتحادیە عەلمانیەکان هەبوو...، وادیارە لە دوا ساتەکانی عوسمانی تا رادەیەك پابەند بوو بە (جامیعە)ی بۆیە قایل بوو حکومەتی کوردستان لە سلێمانی دابمەزرێ و دانی پیاهێنا، بەڵام شکستی عوسمانی لە جەنگی جیهانی و شکستیشی بەرامبەر عەلمانیە تۆرانیەکان هەمو ئەو ئومێدانە نێژران، جەنگی جیهانی بەرەبەرە لە قازانجی هاوپەیمانان تەواو بوو، ناوچەکەش کەوتە دەستی بەریتانیا و فرنسا و نەخشە تایبەتیەکە(لە سایکس پیکۆ را) جێبەجێکرا، نەخشەی جامیعەی ئیسلامی هەڵوەشایەوە و عوسمانی و کورد و ناوچەکە و جیهانیش کەوتە قۆناغێکی نوێ.

لەبەرامبەریشدا میلەتانی ناوچەکە وەك نەتەوایەتی بێدار بونەوەو دەتوانین ئەو قۆناغە بەسەردتای نەتەوایەتی بەگشتی وکوردایەتی بەتایبەتی پۆلین بکەین.

---

*ـ لەوکاتی کۆمەلێك لەو جامیعانە هاتنە کایەوە، لەوانە: جامیعەی جەرمەنی، جامیعەی لاتینی...ئینجا جامیعەی ئیسلامیش.

# بەشی دووەم

## کوردایەتی ومەینەتی کورد

بەشێکی کاریگەر لە مێژوونووس و ڕەوشەنبیر و سیاسەتمەدارانی کورد (بە تایبەتی نەوەی ئێستا) کە باسی سیاسەتی کورد دەکەن عادەتەن بەو فەرمایشتە دەست پێ دەکەن: (کورد هەزاران ساڵە دەچەوسێتەوە)، ئیتر باسی تەنها لای شکستەکانی کورد دەکەن، کەمتر باس لە دەسەڵات و لایەنە گەشەکانی کورد دەکەن، ئەوان وا دەزانن بەو ڕێگەیە مەزلومیەتی کورد پیشانی جیهان دەدرێ، هەڵبەتە هەمو میللەتانی جیهان و ناوچەکە هەمان بارودۆخی بەخۆوە بینیوە، ڕەنگە کورد لە عەرەب زۆر باشتر بوبێ، هەر تەنها ئەو بەغدایە زیاتر لە (٣٠)جار وا بە ئاسانی داگیر و وێران و تاڵانکراوە، ئیتر بۆ تەنها کورد، ئەوەی زۆر ترسناکە ئەو مێژوونووس و ڕەوشەنبیر و سیاسەتمەدارانە دەیکەن هەنگاوێکی زۆر زیان بەخش و چەوتیشە، ئەوەی کورد دەیکا زۆر سەرسوڕهێنەر و نالۆژیکیە، جۆرێکە لە لاسایی بەڵام چ لاساییەك، عەرەب و تورك لە چوارچێوەی (پێداچونەوەی زانستی مێژوویان) هەوڵیان داوە ڕەگ و ڕیشەی نەتەوایەتیان بە ساختە بۆ قوڵایی مێژوو ببەنەوە، سەرنج بدە کتێبی (الحضارة في العراق ص٣٢١) چ دەڵێت: بعد أن اتمت الجيوش العربية تحرير العراق من الحكم الفارسي أصبح العراق جزءا من الدولة العربية الكبرى، وكانت هذه الدولة قد اسسها الرسول(ص)... لە شوێنێکی تر لەبەشی (الشعورالقومي لدى البابلين ص٢٤٤) باس لە عروبەو ناشیۆنالیزمی دەکات لەو سەردەم، هاتوە: ((استخدم العراقين القدماء إسم نبوخذنصر كرمز القومي))، احمد سوسە ـ لەکتێبی( تاريخ حضارة وادي الرافدين) بەتەقەلای ناشیۆنالیستە عەرەبەکان نەوەستاوە، کە هەوڵیان داوە عروبە بگێرنەوە بۆ سەر ئەمەوی، ئەو تەقەلای داوە تۆخمی عروبە لە سۆمەری و بابلیەکان بدۆزێتەوە، ئەو تەقەلایانە بۆ ئەوەی بیری نەتەوایەتی ڕەسەنایەتی وەرگرێ، چونکە زۆر دەست کورت و لاوازە و دەکرێ بڵێین هەر بیر و ئایدۆلۆژیا نیە، ئەگەریش ببێ ئەوا ڕەگەز پەرستیەکی وای لێ دەردەچێ لە سەر شێوەی شۆڤینی فرنسی،

فاشی ئیتالی، نازی ئەلمانی، ڤالانژیسی سیپانی. تورانی تورکی، بەعسی عەرەبی...بۆیە بە ناچار پشتیوانی مێژوویی بۆ دەدۆزنەوە کە نیشە[١١٣]، هەرچی کوردە تەقەلایەکی تری هاوتەریبی ئەوانە دەدا، بەلاّم زۆر بە چەوتی، ئەو مەینەتیەکەی تەئسیل دەکا، تەیاری عەلمانی ئێستای کورد بە دووئاڕستەی ترسناك کاردەکا، یەکیان لە رووی سیاسی وکرداری دەیەوێ ئایدیۆلۆژیای نەتەوەیی پیادەبکا بەفت کردنی ئاین ومێژوو وسومبلە سەرکردەکانی، ئەوانە دەڵێن : ئاین بۆ هەموولایەك بە سود بوە تەنها بۆ کورد نەبێ، زیاتر لەوەش دەڵێن باکوردایەتی وئاین لێك جیا کەینەوە، لە جیاتی هاوئاینی با هاو ولاّتی پیادەبکەین[١١٤] نەتەوەیی، ئاین دوورکەوێتەوە لە کۆمەڵگەو ببێتە کێشەی تاکە کەسی،...لەو لایەش هەولّ دەدا مێژوو وا پیشان بدا کەمیللەتی کورد هەر ژێر دەستەو دوا کەوتەو داگیر کراو بوەو مێژووی کورد مێژووی گریان ونوزەو پاڕانەوە بوە...، سەرکردە روحیەکانی وەك سلاح الدین وشیخ ئیدریسی بدلیسی وشیخ عبیداللە وشیخ سلام وشیخ سعید وقازی تا مەلا مستەفا بە نەزان وخزمەتکاری ئەولاو ئەملای پۆلین بکەن...، جا کارە سەرسامیەکە لەوەیە کەبەو کارەیان دەیانەوێ بینای ئایدیۆلۆژیای نەتەوەیی دابڕێژن، ئێ باشە هەمولایەك دەزانن کۆلەگەکانی نەتەوەیی بریتیە لە: مێژوو وئاین وسەرکردەو زمان و نیشتمان، ئەگەر سێ کۆڵەگە خۆت تەرتووێرانی بکەی چۆن بە دوو کۆڵەگە بینای نەتەوایەتی ڕادەوەستێ، خۆ دلنیام ئەگەر ئەو دوو کۆلەگەیەی زمان ونیشتمان ئاوا لە قەپان بدرێ ئەویش ویرانکراوە، بەلاّم ئەودووە بۆ پسپۆری خۆی بە جێ دێڵین، دووەمیان نەزدریەو سەرسام ترە لەوی تر هەولّدەدا مێژووی داگیرکاری وژێر دەستەی قوول بکاتەوە بۆ هەزاران سالّ یاخود بە لای کەم بۆ یەکەم فەتحی کوردستان لە لایەن ئاینی ئیسلامەوە، ئەگەر بە ووردی سەرنج بدەین دەبینین دیاردەکانی وەك تەعریب یان داگیرکاری یان ئەنفال...ڕەگەکەی بۆ ئەو کاتی دەگێڕنەوە... بریا هەروەك ئەوانە هەولّی ئەوەی بدابووایە

---

[١١٣]ـ لە ڕاستیدا مێژووی شارستانی عەرەب لەکەورەترین قەیران دایە، چونکە شارستانی ئیسلامی وەك ئیبن خەلدوون دەلێ کەمی جێ پەنجەی عەرەبی تێدایە بۆیە عروبیەکان ویستویانە زاناو ناودارانی ئیسلامی تەعریب بکەن ونەکرا، ئیتر ئەو مێژوە شارستانی ئیسلامە نەك عەرەب ، شارستانی عەرەبی پەتی وڕاستەقینە لەدوای سەدەی ٢٠ دەست پێ دەکا ئەویش جێی شانازی نیە لە هیچ روویەکی تکنۆلۆژی وسیاسی وفەرهەنگی وزانستی

[١١٤]ـ ئەو تەقەلایە لەلایەن توێژینەوەیەکی گرنگی (پشتیوان سادق) بە سەرپەرشتی د محمد شریف بەناوی(موسوعە الإرهاب ج٣ الإرهاب فی کوردستان ص٢٣٥)هاتووە دەلێت: ((العمل علی إفهام الناس بأن العلاقة بین المواطنین هی المواطنة وحدها ولیست الدین)) ئەوەش بەدەق وکت ومت مادەی (٣)ی دەستوری حزبی بەعسە.

ڕەگ و ڕیشەی کوردایەتی و نەتەوایەتی قوڵ دایە بۆ مێژوو، تـا کوردایـەتی ڕەسـەنایەتی وەرگرێ بە ناسنامەی مێژوویی و ئایینی...، بەڵام وا ناکەن، هەڵساون لـە تەقەلایـەکی بێ ووچاندان تا مەینەتی کورد قوڵ بکەنـەوەو بـە ڕەسـەنی بکـەن، ئـەو دوو تەقەلایـەی (ڕەوشـەنبیرانی عـەلمانی کـورد) و(ناشـیۆنالیزمانی داگیرکـەر) لـە شـێوە یـەکن، هەردوولاچەوت وساختەیە، بەڵام لە ناوەڕۆك و ئەنجام زۆر لێك جیان، بۆیـە دەبـێ جـارێ ئەو هەڵەو چەوتیانە ڕاست بکەینەوە، لە پێش هەموانـدا ئـەو فەرمایـشتە ڕاسـتکەینەوە کەگوایە: کورد هەزاران ساڵە دەچەوسێتەوە، هیچ میللەتێك لەو جیهانە لەوانەی ئێستاش ژێر دەستن وەك باسك و ئیرلەندو بەربەر و چیچانی و کشمیری و....... هـەزاران سـاڵ نیـە بچەوسێنەوە، بەڵکو ڕاستیەکەی ئەوەیە چەوسانەوە هەبوە بەڵام چەوسانەوەی نەتەوەیەتی لە دوو سەدە تێناپەڕێ، چەوسانەوەی نەتەوەیی کوردیش خەریکە بگاتە سەدەیەك، ئەگـەر ساڵی ١٩٠٨ بە سـەرەتای سـەرهەڵدانی کوردایـەتی دابنـێین، ئـەگینا مێـژووی سیاسـی کوردسـتان زیـاتر سـەربەخۆیی بـوە نـەك داگیرکـاری وەك لـەکتێبی (الملـل والنحـل والاعراق)[115] دەڵێت: کوردستان بۆ ماوەی ١٣ سەدە یەکپارچە بو تا لە ڕێکەوتنی سایکس پیکۆ پارچە پارچە کرا، دوای بە درێژی باسی ئەو بابەتە دەکەین، لـە ڕاسـتێدا مەینـەتی کورد لە نێوان ١٩٠٨ ـ ١٩٢٤دروست بووە، بۆیە ئەو فەترەیە پڕە لە ڕووداوی وەك:

١ـ ١٩٠٨ ئنقلابەکە..

٢ـ ١٩٠٩ لادانی سوڵتان عبدالحمید.

٣ـ سەرهەڵدانی دەستە و کۆمەڵەیەکی سیاسی کوردستانی زۆرو زنجـیرە شۆڕشـەکانی کورد.

٤ـ ١٩١٤ هەڵگیرسانی جەنگی جیهانی.

٥ـ ڕێکەوتنی سایکس بیکۆ ١٩١٦

٦ـ لە ١٩١٨ کۆتای جەنگ و داگیرکردنی ناوچەکە لە لایەن هاوپەیمانەوە.

٧ـ کۆنگرەی پاریس

٨ـ کۆنگرەی سیڤەر ١٩٢٠

---

ـ سعدالدین ابراهیم ص٢١٣

٩ـ دابەش کردنی عوسمانی و سەرهەڵدانی دەوڵەتە نەتەوەییەکان لە ناوچەکە و دروست بونی (عصبە الامم)

١٠ـ ڕووبەڕووبونەوەی دەسەڵاتی عەلمانی لە ئەنقەرەو دەسەڵاتی عوسمانی لە ئەستەمبۆڵ و شکستی ئەستەمبۆڵ.

١١ـ لە دوای ١٩٢٠ ئەو دەوڵەتانەی وەك تورکیاوعیراق و سوریا وئوردەن و..هتد دروست بون.

١٢ـ لە ١٩٢٤/٣/٣ بە یەکجاری خیلافەتی عوسمانی لە لایەن ئەتاتورك[١١٦] هەڵوەشایەوە.

لەو نێوانەش مەینەتی کورد دروست بوو، بۆیە پێویستە هەڵوەستەیەکی وورد بۆ ئەو ماوە مێژووییە بکەین، شتێکمان تا کۆتایی جەنگی جیهانی باس کرد، ئەوەی زۆر پەیوەستە بە چارەنووسی کورد و دروست بونی مەینەتیەکەی سەرەنجامی ئەو ململانێیەی نێوان دەسەڵاتی عەلمانی کەمالی لە ئەنقەرە بوو لە گەڵ دەسەڵاتی سوڵتان لە ئەستەمبۆڵ و سەربردەی هەردوو ڕێکەوتنی سیڤەر ١٩٢٠ و لۆزان ١٩٢٣

## کورد لە ململانێ ی (ئەنقەرەی عەلمانی) و (ئەستەمبۆڵی ئاینی):

هەڵبەتە ڕەگ و ڕیشەی ئەو ململانێ یە قوڵ دەبێتەوە بۆ سەردتای سەدەی (١٩)، بەراییەکەی لەوانە دەستی پێکرد کە کۆمەڵە خەڵکێك پێیان وابوو گواستنەوەی ئەزموونی ڕۆژئاوا و شۆڕشی فرنسی بۆ ناو عوسمانی لە جیاتی شریعەتی ئیسلامی و ئەزموونی ڕۆژهەڵاتی چارەسەرە بۆ کێشەکانی نێو عوسمانی، لە ١٨٦٥ ئەو بیر و بۆچوونانە لە بزوتنەوەی عوسمانی لاودا سەری هەڵدا، دوای کۆمەڵێك لە نێو ئەوانە بە پان عوسمانی (پان ئیسلام) قایل نەبون و بانگەشەی ئەوەیان کرد، کە تورك لە نێو هاوکێشەی عوسمانی مەغدورە، بۆیە عوسمانی لاویان بە لای تورکیای لاو(جوان تورك) هەڵبڕی، لە ساڵی ١٨٩٩ز بەبۆنەی یادی ١٠٠ ساڵەی شۆڕشی فرنسی ئتحاد الترقیان لێ ڕاگەیاند.

---

[١١٦]ـ ئەمیل لۆدفیغ دەڵێ: ئەتاتورك لە ناپلیۆن بە هیزترە چونکە ناپلیۆن نەیتوانی خیلافەت بڕوخێنی بەڵام ئەتاتورك توانی- الصحوة.الرجل المرض بنی مرجة ص٢٦٨ سەرجەم سێ نازناوی درایێ (ئەتاتورك) باوکی تورك، (میلکیف)سەرکردەی هەمیشەیی، (غازی)سەرکەوتووی مەیدان.

له ساڵی ١٩٠٨ ئنقلابیان کرد، له ١٩١٤ هەر ئەوانە عوسمانیان پاڵدا بۆ ناو ئەو جەنگە و له ساڵی ١٩١٨ شکستیان هێنا، ناوچەکانی عوسمانی و ئەنادۆڵیش داگیرکراو نۆرەی مستەفا کەمال هات، ئەو وا دەرکەوت بە بزوتنەوەیەکی ڕزگاری هەستا و ئەنادۆڵی لە یۆنانیەکان پاك کردەوە، پایتەختی خستە ئەنقەرە و پایتەختی عوسمانیش هەر لە ئەستەمبۆڵ بە لاوازی مابون، کەواتە ئێستا لە دەوروبەری ساڵی ١٩٢٠ ئێمە باس لە دوو حکومەت و دوو هەڵوێست و دوو ناوەندی زۆر لێکجیا دەکەین، حکومەتێك لە ئەنقەرە کە پێك هاتووە لە سەرۆکەکەی مستەفا کەمال ئەتاتورك و جێگرەکەی عصمت ئینینۆ ئەنجومەنێکی مەزنی تورکیاشیان پێك هێناوە، حکومەتەکەی عوسمانیش بەسەرۆکایەتی فرید پاشایە و سوڵتانیش (محمد واحدالدین)ە لەئەستەمبۆل، ئەو دوو حکومەتە هەڵوێست و ئامانجیان زۆر لێك جیایە بە شێوەیەك ئەنقەرە نوێنەرایەتی باڵی عەلمانی تورکچیایەتی دەکا، دەیەوێ دەوڵەتێك بۆ تورك لە سەر ترازی مۆدێرن بە دەستوری ڕۆژئاوایی سنورێکی دیایکراو و...دروست بکا، خۆی لەو بەرپرسیاریەتەی ئیسلامی بە تەواوی دەربکا، هەرچی ئەستەمبۆڵیشە دەیەوێ درێژە بە دەسەڵاتی کلاسیکی عوسمانی بدا، بابزانین ناوەرۆکی ئەو ناکۆکیە چیە؟ ڕەوتی بەچی دەگاو سەرنجامەکانی چیە؟ کام لایان لەقازانجی کوردە؟ کورد هەلویستی چی بوو؟ بەتایبەتی باڵی عەلمانی کورد وباڵی زانایانی ئاینی؟...لەگەڵ زۆر پرسیاری تر.

هێشتا مستەفا کەمال لەسەرەتا بوو زۆری پەنای دەهێنایە بەر کوردەکان، بەپێی ڕای (تۆماس بوا) و (ڕۆبەرت ئۆلسن ) و زۆربەی ڕۆژهەڵاتناسەکان ئەگەر کوردەکان ـ عەشایرو ئەفەندیەکان ـ یارمەتیان نەدابوایە ئەتاتورك بەسەر ئەستەمبۆڵ زال نە دەبوو[117]، لە کتێبی(دراسات فی الحرکه الکوردیه المعاصره) هاتوە: ئەوسوپایەی ئەنقەرەی گرت زۆربەی هەرەزۆری کوردبون[118]، زیاتر لەوەش بەپێی بەڵگەنامەیەکی بەریتانی دەگمەن باس لەوە دەکات، کە کوردەکانی ئەوروپا مانگانە یارمەتیان کۆکردۆتەوەو بۆ ئەتاتورکیان ناردوە[119]، تەنانەت خودی ئیحسان نوری پاشای سەرۆکی شۆرشی کوردی

---

[117] ـ ڕۆبەرت ئۆلسن ـ ڕاپەرینی شیخ سعید ل٦٨

[118] ـ د. عثمان علی ص٣٢٠

F.O [119] رقم"٢١" سري ديترويت، مشيغان ١٨ نيسان ١٩٢٩

سيدي، أوستن شامبرلين، وزير الشؤون الخارجية بريطانية، لندن. يشرفني ان اعلمكم....

ـگری داخ ئەوکاتی سەرگوردی عەسکەری هەمو ئەستەمبۆل بوو ئەو ئەستەمبۆلی دا ـەدەست ئەتاتورك، وای لێهات بەشێك لە شێخ و مەلای سادەش بەناوی(گوایە ئەتاتورك دژ بە ئینگلیز وئەرمەنەو رزگارکەری دار الإسلامەولە سەرکەوتنا بوخاری دەخوێنی) بونە پـشتی، هەر لە بنەچەشدا ئەتاتورك دوو کۆنگرەی خۆ دروستکردنی ئەنجامدا لەژێر پـرێزگاری دەسەلاتی عەشایەرە کوردەکان*، یەکەمیان لە ئەرزەرۆم لە ١٩١٩/٧/٢٣ و دووەمیان لە ٤ ـ ١٩١٩/٩/١١ لە سیواس، رێکەوتنی سیواس بنەمای زۆر ترسناکی تیادا هاتبو، کە کوردستان بە تێکرایی بەشێکی جیا نەکراوەی تورکیای نوێ بێت، ئەوەش خوردکردنەوەی بیری عەلمانیەتی کوردی ئەوسا بو بەتایبەتی دعبدالله جودت، تەنها بەرامبەر بەلێنێکی زارەکی ئەتاتورك گوایە برانەو مافی جیای بۆچیە، خالید بەگ یەکێك لەو سەرۆك عەشیرەتانە بو کە لەو مەجلیسە دانیشتبو گوی لەمستەفا ئەتاتورك گرتوو هەر بەلینی دەداو لەولایەش لەپیلان بوو لە کورد [120]، بیریکی قوولی کردەوە بینی دەسەلاتی ئەستەمبۆڵ زۆرشتی بۆ کورد کردووە تارادەی سەربەخۆ بۆچی ئێمە (حازر بەقەرز) بگۆرینەوە*، ئینجا حازردکەش لەقەرزەکە زیاتر بی، سەری لەبن گوێی (حسن خەیری) ناو پێی ووت من وا دەبینم ئەو ئیشەی ئێمە و پشتیوانیمان لەئەتاتورك لەدژی سولتان تیغە بۆ ملی خۆمان تیژ دەکەین، چونکە لەو کاتی سولتان لەگەل کورد رێکەوت بۆ سەربەخۆیی پی دان و مۆرکرا لەنێوان هادی پاشا و شیخ عبدالقادر و شریف پاشا دوای دوو وەفد پێك هات لە هەردوولا، نوێنەرانی کورد پێك هاتبوو لە: عبدالقادر شمزینی (سەرۆك)، ئەمین عالی بدرخان، مراد بدرخان، مەولان زادە رفعت بەگ، لە لایەن نوێنەرانی عوسمانیش پێك هاتبوو لە: دووەمین کەسایەتی نێو عوسمانی شیخ الإسلام صبری زادە(سەرۆك)، ئەحمەد عبوق پاشا، عونی پاشا لە چوارچێوەی جامیعەی ئیسلامی بەهۆی ئەو دوودڵیە و گومانانە بوو سەرۆك عەشیرەتەکانی لایەنگری ئەتاتورك لە

---

أن خويبون (جمعية أستقلال كردستان) هي التي بعثه بسورية بدرخان الى الولايات المتحدة الأميركية. أن الكرد في السابق كانوا يرسلون سنويا ٥٠ الى ٦٠ ألف دولار أميركي الى مصطفى كمال. و لكن سورية أقنعهم بأيقاف ذلك و أتفقوا بأنهم سيدخرون كل أسبوع دولا ر لهم بمجهود أستقلال...

دکمال مزهر لەوەڵامی نوسەری نازربیجاننی (نالیف) شانازی بەوە دەکات کە بزوتنەوەی کوردایەتی ئەوکاتە پتەو بووکە بوە هۆی سەرکەوتنی شۆرشی ئیتحادیەکان.

[120] ـ ئیحسان نوری پاشا لە ل٢٠ی کتێبەکەی خۆی (شۆرشی نەتەوەیی کورد لە تورکیا) دەلێ تورکەکان لە کاتی لێدانی ئەرمەنەکان دەیان گووت با لە (زۆ ـ ئەرمەن)تەواو بین نۆرەی (لۆ ـ کورد) دێت.

١٩١٧/١١/١٥ كۆبونەوە بە ناوی (هاوپەیمانی هۆزەکان)[*]، نامەیەکی (٥) پرسیاریان بۆ ئەتاتورك نووسی، تیایدا داوایان کردبوو بۆیان ڕوون بکاتەوە ئاخۆ ئەویش وەك سولتان ئامادەیە بەتەواوی دان بە سەر بەخۆیی کوردستان بنێت[١٢١]، بۆیە زۆربەی سەرکردە کوردەکان دژ بەهاوکاری ئەتاتورك بون، تەنانەت یەکێکی وەك مستەفا پاشای یامۆلکیش لەنامەکەی بۆ کورەکەی کە لە بەڵگەنامەی بەریتانی بڵاوبویتەوە لەبەر کەمیك هاریکاری سمکۆ لەگەل کەمالی ئومێدی پێ نامێنێ وگومانی لێدەکا، کە مار شمعونیشی بە رینمای ئەوان کوشتبێ[١٢٢]، لێرەوە پیویست دەکا بەراوردێك لە نێوان هەلویستی هەردوولایان(ئەنقەرەو ئەستەمبۆل) تۆمار بکەین بەرامبەر بەکێشەی کورد لەدوای سالی ١٩٢٠، بەم شیوەی خوارەوە بوو:

یەکەم ـ هەلوێستی عوسمانی بەرامبەر کورد: باسمان کرد لەسەرەتا بەپێی ڕێکەوتنی شیخ ئیدریس بەدلیسی وسولتان سەلیم لە١٥١٤ لەگەل (٢٣) میرنیشنی کوردی ڕیك کەوتن هەردوولا یارمەتی یەکتر بدەن، ئەو ڕێکەوتنە جار جار پێشێل کرابو، بەلآم دەتوانری بگوتری هەتا سەرەتا سەدەی (١٩) بەردەوام بوو، لەکتێبی (سياسة البريطانية العظمى تجاة مستقبل كردستان ص٢٤) کە لە سەرچاوە جیهانیەکانی وەرگێڕاوەو دەڵێ: ئەو ڕێکەوتنە ٤ سەدەی خایاندو کوردیش زۆر قازانجیان لێکرد، لەراپۆرتی بەریتانی ـ کۆلۆنیل ئیفلینستۆن هاتووە ودەڵێ: ئەو ڕێکەوتنەی کوردو عوسمانی تا سالی ١٨٢٦ی خایاند وە بووە هۆی دروست بونی ١١ ئیمارەتی تر[١٢٣]

لەدوای ئەوە هەلویستی عوسمانی بەرە بەرە خراپ بوو، سەرە ڕای ئەوەش ئاخۆ بزانین لەو کاتەی کەئێمە وەسفی بەخراپی دەکەین چۆن بووە:

[*] پەیمانی عەشیرەتەکان ئەوەبرونەکەر سێریان کەرت بکردبایە وهەریەکە پارچەکی بخواردبایە ئەوە پەیان بوو.

[١٢١] هەر (٥) پرسیار لە کتێبەکانی: كوردستان من بداية الحرب العالمية الأولى الى نهاية مشكلة الموصل ص٢٠٩، هەروەها لە کتێبی جلیلی جەلیل و لازاریف وبەیتار نوری دەرسیمی وزۆر سەرچاوەی تر هەیە.دەقی پرسیارەکان لە(خوێندوەیەکی تری سێڤەر بلاومان کردۆتەوە).

[١٢٢] رقم الوثيقة FO ٣٧١/٧٧٨١ سليمانية - ١٢/كانون الثاني/١٩٢١

ملاحظة: ابني العزيز إن هؤلاء الكرد الغير المنظمين لا يستطيعون تحقيق التطور وبتعبير آخر إن سمكو جاهل وأنه على علاقة وطيدة بالقوميين الترك بسبب الأسلحة والعتاد التي يتلاقاه منهم باختصار إن مسالة سمكو أمر ميؤوس منه.

[١٢٣] ـ کەمال مەزهەرـ کوردوکوردستان لەبەلگەنامە نهێنیەکانی بەریتانی ل٢٢٢

١ـ سوڵتان عبدالحميد قايل بوو به پرۆژەکەی شێخ سەعید نەورەسی و جمال الدين ئەفغانی بۆ پیدانی مافی چارەنووسی بە هەمو میللەتان لەچوار چێوەی (جامیعەی ئیسلامی)، هەرلەسەر ئەو بنچینەیەش بوو لە٩/٢/ ١٩٠٢ کۆنگرەیەك لەپاریس کراکورد[١٢٤] و ئەرمەن وعەرەب و ئیتحادیەکانیش لەو گۆنگرە بەشداربون دانیان نا بەمافی کورد ئەرمەن و عەرەب[١٢٥]

٢ ـ پیش ئەوەی بنەماکانی مافی چارەنووسی بیتە نیو رۆژ هەلاتیش و بنەماکانی (١٤ بنەماکەی) ویلسون له ١٩١٨ دوایش لیدوانە هاوبەشە بەناو بانگەکەی فرنساو بەریتانیا (French pederation ـ Anglo)لە ١٩١٨/١٠/٧، ئنجا جاری مافی گەلان ئەشۆرشی ئۆکتۆبەری١٩١٧..، سولتانی عوسمانی (هادی پاشای) به نوێنەری خۆی ناردە لای سەرکردە کوردەکان و پی وتن: مادام میللەتان وا بەرە بەرە سەربەخۆیی خۆیان وەردەگرت و دەوڵەتی سەربەخۆ دروست دەکەن (هێشتا لەو ناوه هیچ دەوڵەتێك دروست نەببو، تەنها رێکەوتنامەی سایکس بیکۆ بە نەهێنی لە ١٩١٦ گری درابوو) وەرن با ئێمە وەك عوسمانی ئەو مافه بەکورد بدەین، دوای ئەوەك میژوو بەهەلە لەسەر ئێمە بنووسی و بلێن: خیلافەت و ئیسلام زوڵمی لەکورد کردووە، بەو شێوە هادی پاشای نارد لەگەل هەردوو سەرکردەی کورد (شیخ عبدالقادر شمزینی و شریف پاشا) مۆریان کرد کەسەزبەخۆیی بدەنه کورد.

٣ـ هەمان ئەو پرۆژە رێکەوتنەی نێوان هادی پاشا (نوێنەری سولتان) و کوردەکان بردرا بۆ کۆنگرەی سیڤەر١٩٢٠، بەشێکی زۆر لەمیژوو نوسی و سیاسەتمەدار دەسکەوتەکانی پەیمانی سیڤەر دەدەنه پال بەزەیی و مرۆڤایەتی رۆژ ئاوا، کەچی ئەگەر بەووردی سەرنجی بدەینە دەبینین ئەو کۆنگرەیە تاکانه بوو لەنێوان کۆنگرەکانی سایکس بیکۆ ١٩١٦، پاریس ١٩١٩،... کۆنگرەی قاهیرە، ١٩٢١ تا دەگاتە لۆزانی ١٩٢٣ تەنها ئەو کۆنگرەیە زۆر خاڵی چاکی تێدابووە (کە لەدوایی زیاتر باسی دەکەین)،

[١٢٤]ـ له کتێبی: دراسات فی الحرکه الکوردیه المعاصره ناوی ئەو کوردانەی بەشدار بوو لەو کۆنگرەیە لە ص١٤٧ بریتین لە:حکمت بابان ، عبدالرحمن بدر خان. له سەرەتا زۆربەی کوردەکان لەو ئیتحادە بوون دوای کشانەوە

[١٢٥]ـ به پێی (موسوعة السفير التاريخ الإسلامی): ((أول مؤتمر لتقسيم الدولة العثمانية الذي شارك فيه معارضون للدولة العثمانية هومؤتمر باريس الذي عقد في ٤-٩/فبراير/ ١٩٠٢ وعلى رأس المشاركين: الإتحاد والترقي، ومن أهم قراراته كان تقسيم الدولة العثمانية الى حكومات مستقلة على أساس عرقي وقومي) ).

هەرچەندە هەندی لای لێڵی تێدایە، بەڵام ئەوەی کرنگە سەرکردەکانی کورد پیشنیاریان کرد ئەو ڕێکەوتنەی عوسمانی و کورد بۆ سەربەخۆیی کوردستان مۆرکیکی نێودەوڵەتی هەبێ و سولتانیش لاری نەبو، بۆیە هادی پاشا هەڵبژێردرا بەسەرۆکی وەفدی عوسمانی لەو کۆنگرەیە لەسەر ئەو مادانەی (٦٢، ٦٣، ٦٤)ی سیڤەر مۆر کرد بەسانایی[١٢٦]، بەپی ی هەندێك توێژەر قایل بونی هادی پاشا بۆ ولاتانی عەرەبی ئاوا بەئاسانی نەبوە.

دووەم ـ هەلویستی عەلمانی تورك بەرامبەر کورد بۆ زیاتر چەند بەراوردێکی خێرا لەنێوان باری سیاسی کورد لە سەردەمی خیلافەت و دوای هاتنی عەلمانیەت بەکورتی دەنووسینەوە:

أـ کورد وەك میللەتێکی ڕەسەن لەگەڵ کاروانی میللەتانی ناوچەکە بو، ئەگەر لەپێشتریش نەبوبێ، لەدوای خیلافەت وهاتنی عەلمانیەت لە کاروان بەجێما.

ب ـ بەدرێژایی خیلافەت خاوەن دەوڵەت و میرنشینی بەهێز و مەزن بووینە و جار جار حوکمیان پەڕیتەوە بەغدا و شام و هەتا لبنانیش، جگە لە ئەیوبیەکان کە میسر و شام و لیبیا و یەمەن و ناوچەکانی نێوانیشیان حوکم کردوە، کورد لەبەر لێهاتوویی و دەسەڵاتیان بەپانتایی نیشتمانی ئیسلام لەجیهان سەرکردە و والییان لێ هەبوە، تا ئەو دواییەش لە سەردەمی حوکمی عبدالرحمن بابان والی بەغد لەلایەن خۆی دیاری دەکرا، بۆیە ئێستاش لە هەمو جیهانی ئیسلامی بنەماڵەکانیان ماون، هەتا لە دواساتی خیلافەتیش کەچی سەرۆکی ئەنجومەنی دەوڵەت، سەرۆکی ئەنجومەنی ئەعیان، وەزیری دەرەوە، هەریەکە لە (سید عبدالقادر شەمزینی، شیخ عبیداللە، شەریف پاشا...) هەروەها شیخ الإسلام کە دووەم دەسەڵات بوە لەدوای خەلیفە بەزۆری لەدەست کورد بوە

کەچی لەدوای دارمانی خیلافەت و سەردەمی عەلمانیەت، کوردستان پارچەپارچە کراو ڕۆژی ڕەشی هات و هەر بەشی سوتان و وێران و... تا ئەنفال و کیمیایش.

ـ بڕوانە: دەقەکانی سیڤەرو خوێندنەوەیەکی تر، وەرگێرانی دەق: پ ی سەلام ناوخۆش ـ خوێندنەوەیەکی تر: مسعود عبدالخالق.

ج ـ بۆ یەکەمجار دیاردەی تەعریب، تەتریك[127] و ڕاگوازتنەوەی نەتەوەیی، جینۆسـاید، قەدەغەکردنی زمان، بەسەریدا سەپێنرا، ئەو کوردستانە فراوانەی سەردەمی خیلافەت کەمە نزیك کەنداوی فارسی دەستی پێدەکرد بەخوار (جبل حمرین) ـ یان وەك ئیبن خەلـدون ـە جبل الاکراد ناوی بردووە ـ بەڕووباری فرات بەرەو دەریـای سـپی دەڕوا هـەتا ئـەنادۆڵ، ـوێش بەرەو ئەرمینیا[128]، ئەو نەخشەیە هەتا لەدواساتی مەرگی کوردستانیش لە سیڤەر ـ دوایش لە لیژنەی (تەحکیمی موسڵ) هەروا بە فراوانی هاتبوو، کەچی لەدوای خیلافەت ـ هاتنی عەلمانیەت و داگیرکردنی ناوچەکە لەلایەن بەریتانیا و فەرەنـسا و لـە سەرووشـی ـلایەن ڕووسیا و دابەشکردنی میراتی خیلافەت و بێ بەش کردنی کـورد، ئـەوا سـنووری کوردستان[129] هەروا بچووك دەبێتەوە، ئێستا لەنیوەی ئەو کوردستانەی ئەوسـا بـچوکترە، تەنانەت لە بەشی عێراقی حکومەتی بەعس لە ساڵانی دوای هەشتاکان هەمو کوردستانی ـە ٩٠کم[2] کۆکردبۆوە، تا ئەو ساتەش هەروا بچوك بونەوە بەردەوامە.

ئەوپرۆسەیە لەهەر چوار پارچەی کوردستان بە ڕوونی بـەدی دەکـرێ، لـە ئەرشـیڤێکی ـاری نانتی فەرەنسی سالی ١٩٣٥ زانیاری سەبارەت بە پێکهاتەو ژمارەی دانیشتوانی

---

[127] ـ یەکەم پروسەی باکتاوی ڕەگەزی لە لایەن أنور باشای(اتحاد الترقی) کرا.

[128] ـ بۆ زیاتر لەو نەخشەیە بڕوانە (شەرەفنامە) ل١١٧ - ١٢٨، هەروەها سەرنجی نەخشەی کوردستان لە (شەرەفنامە) ل١٢٨، هەروەها کتێبی (کوردو کوردستان- محمد أمین زەکی بەگ).هەروەها بەندی ٦٢ی سیفر.هەروەها بنواردە:قاموس الأعلام، سیاحەتنامە، ابن بەتوتە، ( معجم البلدان)ی یاقووت حموی...هەروەها بڕوانە: بەشی یەکەمی ڕێکەوتنی ئەرزەڕۆم، هەروەها دوا نەخشەی ئیدارەی عوسمانی بەشی ئاسیا سالی ١٨٩٣ تیایدا دەردەکەوێ کوردستان چەند جار لە عێراقی عەرەبی گەورەترە.

[129] ـ سنوری کوردستان ئەو کاتی دووقاتی ئیستا بوو لە زۆر سەرچاوە پیشانی داوە بەلام لەو دێرە شیعرەی قانیع دەری دەبڕین:

بەڵێ سنوری بەبێ زیادو کەم
بۆت بەیان دەکەم بەبێ دەردوخەم
بە پێی نوسینی جوگرافیاکان
تەرەفی غەربی بۆت ئەکەم بەیان
لە کێوی تۆرۆس تا ئەسکەندەروون
هەتا بەحری ڕەش بێ چەندو چوون
تەرەفی شمال هەر لەبەحری ڕەش
هەتا ئەردەهان بەبێ غەل وغەش
لە ئاردەهان بۆ ناوی ئاراس
ئەمە شیماڵە بە عیلمی قیاس
تەرەفی شەرقی لە کێوی ئەلوەند
تا گۆلی وورمی بەبێ چوون وچەند
لەکێوی ئەلوەند تا جەبەل حەمرین
ئەهواز وشەنگار پارچەی ئەبین
ئەمە جنوبە چاکی بزانە
ناو ئەو سنورە خاکی کوردستانە

د ـ لە سەردەمی خیلافەت ڕەگەز و نەتەوەی تر لەناو کورد دەتوایەوە، هەروەك (تۆماس بوا) لە ل١٩٧ کتێبی (تأریخ الأکراد) و ڕاپۆرتی لیژنەی (تەحکیمی موصلّ ص١٤٨) هاتوە: تورك و عەرەب و ڕەگەزەکانی تر هاتونە لەناو کورد توانیەوە، هەروەها، لە ڕاپۆرتەکانی بەریتانیش ئەوە دەردەخا کە لەسەردەمی عوسمانی تورك لەناو کورد توانیەوە [130] سەرنج بدە (سەید) ڕەچەڵەك عەرەبن، لەنێو هەمو میللەتان بە ئیمتیازەوە ماون، بەڵام لەناو کورد توانیەوەو، تەنانەت زۆربەی سەرچاوەکان بنەماڵەی بەدرخانەکان دەدەونەوە سەر خالید کوڕی وەلید [131]، زۆر عەشیرەتی تری کوردی لەبنەچەدا عەرەب بووینە لە نێو کورد توانیەوە، باری سیاسی کورد وابوە شانازی بەخۆی کردووە ووەك لە (تقریرولایە الموصل ص١٤٨ ) هەروەها لەزۆر سەرچاوەی تریش د کمال مەزهەریش [132] نقلی کردوەبە پالپشت بەبەلگەنامەی بەریتانی ژ:٢٨٩٧/١٣٠١/٨٩ (W S )کە لە٢١/٤/١٩٤٧ نوسراوە بۆوەزارەتی دەردوە هاتوە کورد جێی شانازی بووینەو پرۆسەی بەکورد بون هەبوە، خودی تورك لەسەردەمی عوسمانی لەناو کورد توانیەوە، لەسەر ئەو بنچینە قوولە قانیع دەڵێ:

بەدەستی خۆم نیە وەڵا لە دیوانی خوا کوردم
لە ناو شێخ وبەگ ومیرو مەلا وشاهو گەدا کوردم
تەماشای جەوهەری من کەی ئەزانی ئاشکرا کوردم

کەچی ئێستا هەم خاك و هەم تاکی کوردە دەتوێتەوە هەتا لەناوچەرگەی کوردستانیش، لەژێر سایەی فەرهەنگی شکست و (تقزم الثقافي)دا کورد توایتەوە، وا مەسیحیە کوردەکانیش بەرەو جیابونەوەی فەرهەنگ و ئینتما بەڕێوەن بۆ سەر فەرهەنگی

---

[130] ـ تقرير المفتش العام الأول حول الأوضاع السياسية الداخلية في ولاية دياربكر، بتليس، وان، هكاري، موش، وماردين، و ورفة و سعرد FO. ٣٧١/١٢٢٥٥ يمكن ان نستنتج من قانون الأستيطان الخاص بالمنطقة و تصريحات و آراء قادتنا و المسؤولين الذين زاروا المنطقة ولهم آراء حول الكرد، بان سكان المنطقة تصنف الى صنفين. الصنف الأول هم الكرد الذي لا نعرف و كيف و متى ضهروا. و الصنف الثاني هم الأتراك الذين حسب المصادر و الوثائق التاريخية المتوفرة فقدوا هويتهم القومية و تكردوا.

رغم ان هذا التمييز هو مهم جدا في عملية بناء المشروع القومي و لكن ليس هناك بيانات محدودة عن نسبة الكرد و الترك المتالكردين ضمن ٧٦٥٠٠ انسان الذين عرفوا انفسهم كاكراد...و استنادا الى احصائيات نفوس عام ١٩٢٧ كان هناك ١٢٥٠٢٧٤ كردي في ٥٣ ولاية في تركية. ان اتراك الذين كانوا في السابق ينتقلون الى المناطق الداخلية في تركية و يعيشون هناك و(معروفين) كالترك يسجلون كالكرد.

[131] ـ بۆ زیاتر بڕوانە: ڕۆژنامەی( نۆبیل)، هەروەها کەمال مەزهەر –کوردو کوردستان لەبەلگەنامە نهێنیەکانی بەریتانی ل١٠٣

[132] ـ کوردو کوردستان... ل٢٢٦

ترن، که جاران هەروەك لە ڕاپۆرتی لیژنەی (تحکیمی موصلّ ل٥٢) هـاتووە ((کەمایەتیـە ئاینیەکان لەنێو کوردان لە هەمو میللەتانی تر بە ئاسایی تردەژین و بەشێکن لێیان)).

هـ ـ دەسەلاتی کورد لـە سـەردەمی خیلافـەت گـەلێ زۆر بـوە، جگـە لـەوەی والی و سـەرکردە و بەرپرسـان لـەوان بـوە، ئینجـا وەك میللـەتیش قورسـاییەکی زیاتریـان لـە میللەتانی تورك و عەرەب و ئـیتر هـەبووە، هـەتا لەدواسـاتەکانیش، سـەرنج بـدە: دوای ئەوەی لە کۆنگرەکانی (بەرلین) و (سان ستیڤانۆ) ١٨٧٨ز لە بەندەکانی ١٦ ـ ٦١) بەسەر عوسمانلی سەپێنرا، کە مافی سەربەخۆیی بدرێتە ئەرمەنی، ئـەوا سـەرکردەکانی ئەرمـەن گەڕانەوە بۆ کۆنگرە و پێیان ڕاگەیانـدن ئەگـەر سـەرانی کـوردیش قایـل نـەبێ، بەتـەنها عوسمانلی ناتوانێ سەربەخۆییمان بدەنێ، چونکە زیاتر کـورد لـەنێو دەسـەلاتی خیلافـەت دەسەلاتدارن، هەتا (معارەزە)ی عوسمانلیش هـەر زۆربـەی کـورد بوینـە، دامەزرێنـەرانی (ئیتحادالترقی) زۆربەی کورد بوینە، ئەوە نیشانەی ئەوەیە کە کـورد دەسـەلاتدار بوینـە، بۆیە هەم لەناو عوسمانلی و هەم لە دەرەوەیان سەرکردە بوینە.

جا بڕوانە ئەوکاتی خەلکی تر داوای مـافی نەتەوایـەتی و سیاسـیان لـەکورد کـردوە، کەچی لە سەردەمی عەلمانی و فکری نەتەوەگەری هـەر کـوردە و مـافی خورایـە و هـەتا زمانیشی لێ قەدەغەکراوە و لێقەوماوە و بە (یتیم الامة الاسلامیة) نـاوبراون، لـەکاتێکا لە سەردەمی خەلافە لەبەر ڕێزی کورد بە (قوڕەیشی عەجەم)[١٣٣] بەناوبانگ بوو. کەی ئەو دوو دۆخە وەك یەکە.. (هل یستویان)؟

و ـ ئەوکاتی لەبەر بە هیـزی دەسـەلاتی کـوردی عەشـایرە عەرەبـەکانی وەك شـەمەر وعەنزەو..چەکیان بۆ کورد هەلگرتوەو ناویان(سواریچە) بـوە، کەچـی لـەدوای خیلافـەت وهاتنی عەلمانی هەر خەلکی ترە بارێك چەکی جاشایەتی خستۆتە سەر پشتی کورد

[١٣٣] ـ شفاء العلیل ل٣، هەروەها شەرەفنامە ل١٣٢ پێشەکی.

## خشتەی بەراوردعەلمانی تورك وعوسمانی سەبارەت بەكورد

| دەسەڵاتی خیلافەت لە ئەستەمبۆل | دەسەڵاتی ئەنقەرە ی عەلمانی(ئەتاتورك) |
| --- | --- |
| ١ـ بیرێکی ئیسلامی عوسمانی بەلاوازی. | ١ ـ بیرێکی عەلمانی نەتەوەگەری تۆرانی. |
| ٢ـ نەخشەی سیاسی کوردستان زۆر گەورەبوو | ٢ ـ ناوی نەماوکوردستان نیوە ماوە |
| ٣ ـ دژایەتی کوردی تیا نەبوو. | ٣ ـ بنەماکانیان دژ بە ئیسلام و کورد بوو |
| ٤ـ سیڤەرو مادەکانی ٦٢ و٦٣ و ٦٤مۆرکرد | ٤ ـ سیڤەری بە مەرگی تورکیای نوێ ژمێرکردوە |
| ٥ـ ڕێکەوتنی دووبەدوو و نێودەوڵەتیشی مۆرکردبوو بۆ سەربەخۆیی کوردستان | ٥ـ هیچ ڕێکەوتنێکی مۆرکراوی نەبوو لەگەڵ کورد، هەر بەڵێنی زارەکی بوو. |
| ٦ـ چالاکی سیاسی و ڕەوشەنبیری حزبی هەمو لە ئەستامبۆل بوو | ٦ـ بواری هیچ چالاکیەکی سیاسی و ڕەوشەنبیری کوردی نەدەدا. |
| ٧ـ بەشداری لۆزان نەبوو تەنها لەسیفەر بەشداری کرد | ٧ـ لۆزانی هێنادی. |
| ٨ـ حزب وکۆمەڵەوچالاکیە کوردیەکان لە ئەستەمبۆل بوو | ٨ـ لەگەڵ کەوتنی ئەستەمبۆڵ هەمو ی قەدەغە کرد دوای قڕانەکوردی جاڕدا. ڕۆژنامە و ناوەندە کوردیەکانی لێ داخرا |
| ٩ـ لەماوەی خیلافەت ٦٤دەوڵەت وحوکمداری کوردپەیابوو، ئەگەر خیلافەت سەرکەوتبایا ئێستا کوردستان لەرێزی میللەتان بوو. | ٩ ـ سەرەنجام ئەنقەرە سەرکەوت و میللەتی کورد کەوتە ئەو مەینەتیە تا ئێستایەك دەسەڵاتی بۆ دروست نەبوە. |
| ١٠ ـ نەك ویلایەت هەتا ئیالەتیش بە ناوی کوردستان بووە[١٣٤] | ١٠ ـ ناو وزمانی کوردو کوردستانی قەدەغە کرا |
| ١١ـ دەستوری عوسمانی(مەشروتیە) جێی هەموانی تێدا بوو | ١١ـ دەستوری تورکیا(ئەنا یاسا) تەنها جێی تورکی تێدایەو نکولی لە بونی کورد دەکا |

[١٣٤] ـ بڕوانە: نەخشەی عوسمانی سالی ١٨٩٣ـ ویلایەتەکانی بەشی ئاسیا.

## سەرەنجامی ململانێ ئەنقەرە و ئەستەمبۆل

ئــەوەی زۆر بــەووردی شــارەزای دیــوی نــاوەوەی ڕێکەوتنامــەکانی نێودەوڵــەتی و مەبەستەکانی ڕۆژ ئاوا لەجەنگی جیهانی و چالاکیەکانی لە) ڕۆژهەلات(نـەبێ بەسـادەیی شرۆڤەی سەرکەوتنی ئەتاتورك و عەلمانیەتی ئەنقەرە بەسەر سـولتان و ئەسـتەمبوڵ دەکـا، نەراسـتێدا کۆمــەڵێك سـیناریۆی زۆر ئـالۆز ڕوویـدا لەناوچـەکە بـەهاریکاری زۆر لای سەرەکی، لەوانـە: هێزەکـانی هاوپـەیمانان، ئاژانسـە ئـابووری و سیاسـیەکانی زایـۆنی، بەلشەفیەکان، دۆستەکانی ڕۆژئاوا لە ناشـیۆنایزم و عەلمانیـەکان، تیایـدا ئـەتاتورك وەك پالەوانێکی ڕزگارکەرو شۆرشگێر و ئاین پەروەر ناسێندرا، سی نازناوی پێدرا (غـازی ـ جەنگاوەر)، (میللی چـیف ـ سـەرکردەی هەمیـشەیی)، (ئـەتاتورك ـ بـاوکی تـورك)، هەست پێدەکرا ئەوە کاریکی زۆر مەزنی پێدەکەن کەبریتیـە لەهەڵوەشـانەوەی خیلافـەت لەئەستەمبوڵ، ئەو سەردەمی بەریتانیا زۆر شارەزا بو(شەڕی دووماسی دەریا دەگێـردراوە بۆدەستی ئینگلیـز)، دەیزانـی ئەگـەر هاوپـەیمانان وئاژانسـەکانی زایـۆن خۆیـان کۆتـایی بەخیلافەت بهێنن زیندوو دەبیتەوە، بۆیـە زۆر وەسـتایانە لـەڕێی ئـەتاتورك خیلافـەتیان هەڵوەشاندەوە، خودی ئەتاتورکیش زۆر داناو بوێر و شارەزا بـوو، لەسـەرەتا بـەگوتارێکی ئاینی هاتە مەیدان و لەگەڵ هەرسەرکەوتنێك بە خوێنـدنی (بوخـاری) دەسـتی پێـدەکرد، ئنجـا بانگێـشەی ئـەوەی کـرد کەخیلافـەت تێـك نـادا، ئـەو (شـەریعەتی ئیـسلامی) دەهێلیتەوە، لە ژێرەوەش دام و دەزگای بەدیلی دروست دەکرد، لە سـەر ئاسـتی ئیقلیمـی وجیهانیش ئەتاتورك دەستی کرد بە سەودا و ڕێکەوتن و چارەسـەری کێـشەی سـنور، لـە ١٩٢١/٣/١٣ لەگەڵ ئیتالیا ڕێکەوتن، لـە ١٩٢١/٣/١٦ قرمـی دا بـە ڕوسـیا، لەگـەڵ فەرەنسا لە ٢٠/ ١٩٢١/١٠ ڕێکەوتن و کلیلکاشی دا بە فەرەنسا، لە ١٩٢٠/٥/٣٠، لە هەمان کاتدا بە مادەی (٢٢)ی عوصبەالامم ومەرجەکانی ئینتدابی لەسـەر میراتـەکانی قایـل بـوو..، بـۆ بـە شـەرعی کردنـی هـەمو ئـەو هەنگاوانـە هەلـسا لـە نیسانی١٩٢٠ئەنجومەنی مەزنی تورکیا(بێوج تورك مجلـسی) دروسـتکرد، لـەو مەجلیـسە (٧٢) کوردی تێدا بوو، لەسەر فەرمانی ئەتاتورك بەجل و بەرگی کوردی دەوامیان دەکـرد ، بەدوای ئەوانە ئەو هەنگاوانەی تری نا:

+ لە ١/ ١٩٢٠/٧/ یاسای باری کەسیتی و سنورەکانی شەریعەتی هەڵوەشاندەوە و یاسای تاوانی هینا جیٚ ی.

+ لە ١٦/٣/ ١٩٢١ لەناوچەی (قرم) خۆش بوو لەقازانجی ڕووسیا، لە ١٩٢١/١٠/٢٠ لە ناوچەی (کلیکیا) خۆش بوو لەقازانجی فرنسی و... هتد

+ لە ١/ ١١/ ١٩٢٢ سەلتەنەتی هەڵوەشاندوەوە و (سوڵتان محمد واحد الدین) یشی لادا.

+ لە ٢٩ /١٠ / ١٩٢٣ خیلافەتی وەچەرخاندە کۆماری و خۆشی بووە سەرۆك کۆمار.

+ لە ٣/ ٣ /١٩٢٤ خیلافەتی بەیەکجاری هەڵوەشاندەوە.

+ لە ٢٨/ ٤ /١٩٢٤ داد گای شەرعی هەڵوەشاندەوە.

+ لە ١٠/٤ /١٩٢٤ بریار درا یاسای مەدەنی سویسری پەیرەو بکریٚ.

+ لە ١٠/ ٤/ ١٩٢٨ مادەی(ئاینی ڕەسمی دەوڵەت ئیسلامە) لەدەستور هەڵوەشاندەوە.

+ لە ١/ ١٩٢٨/١١ هەمو پیتە ئیسلامیەکانی گۆری بەپیتی لاتینی...لەگەڵ زۆر هەنگاوی تر تا لەسالی١٩٣١ بەبیانوی ئەوەی تورکیا دەوڵەتی ئیسلام نیە ئامادە نەبو بچێتە کۆنگرەیەکی سەرانی ئیسلامی لە قودس، لەگەل ئەو هەنگاوانەش لەبەڵێنەکانی بۆ عەلمانی و عەشایرە کوردەکان پەشیمان دەبۆوە، تا تورکیای نویٚ بەو دەستوورو ڕەوتە لەدایك بوو لەجیاتی عوسمانی، زال بونی ئەنقەرە بەسەر ئەستەمبۆڵ بەرە بەرە مەینەتی کوردیش دروست بوو، تانیوەی ئەو هەنگاوانەی سەروش عەلمانیەتی کوردی لەگەڵ بووە، ناوەکانیان لەخوارەوە تۆمار دەکەین هەمو ئەوانەی چ بەهەڵە چ بەخیانەت هاریکاری خەتی عەلمانی ـ تۆرانی تورکیان کرد:

١ د. عبدالله جودت ـ یەکێکە لەو چوار کەسەی دامەزرینەری (اتحاد الترقی تورکی)، یەکەم کەسیش بوو پیتی لاتینی هێنا ناو عوسمانی، زۆربەی پیادەکردن وداهێنان لەتورکیای نویٚ بۆ ئەو ژیرە پیاوە (بیٚ کەلك بۆکورد) دەگەڕێتەوە.

٢. د. اسحاق سکوتلی، یەکیٚ لە دامەزرێنەرانی ئیتحادولتەرەقی بوو.

٣. زیا ئەلب کۆك بەرپەرسی لقی اتحاد الترقی دیاربەکر بون، شاعری تورانی بـو، ئەوە وەك ئەو دوو زاتەی سەرەوە نەبوو کەزانیان ئـەو کارەیـان دەبیتـە هـۆی مەینەتی کوردی و بە خێرایی وازیان لەو ڕێبازە هێناو دانیان بەهەڵەی خۆیان هێنا هەرچـەندە کاریگـەری ئـەو هەڵانـەی بـوە هـۆی مەینەتیەکـە، هەڵـەو خیانەت لێك جیایە، بەڵام زیاکۆك وازی نەهێنا و تاکۆتایی.

٤. حسن خیری: سەرۆکی فراکسیونی کوردی بوو لەئەنجومەنی مەزن.

٥. عسمت ئینینۆ جێگری ئەتاتورك بوو دوای بوە سـەرۆکیش، سـەرۆکی وەفـدی تورکیاش بوو لە لۆزان.

٦ برنجی زادە، زولفی بەگزادە ئەو دوە بەناوی کورد چونەکۆنگرەی لۆزان و وتیان سـیڤەرمان نـاوێ لۆزانـان دەوێ، ئەسـتەمبۆلمان نـاوێ ئەنقـەرەمان دەوێ، شریعەتی ئیسلامان ناوێ عەلمانیەتی ئەتاتورکیمان دەوێ.

٧. سـلیمان نـەزیفی والی موسـل کـە هەڵـسا بەشـەهید کردنـی (شـیخ عبدالسلام)بارزانی کورد، بە پێی (یاداشتی)[١٣٥] رەفیق حلمی (علی سـائیب)ی سەرۆکی دادگای بکوژی گەورە کوردەکانیش هەر کورد بوە..

٨. لـوتفی فکـری مونـەزیری تـۆرانی بـوو، هەرچـەندە دژی ئیتحادیـەکان بـو سەرۆکایەتی (حزبی ئیئتلاف الحریە)ی دەکرد، لازاریف دەڵێ: ئـەوە سـەرۆکی حزبی(نوێخواز)بو، داوای هەڵوەشانەوەی خیلافەتی دەکرد وزۆربەی رەوشەنبیرە کوردەکانی ئەستەمبۆلی لەگەل خۆی کۆکردبونـەوە..هـەروەها کەسـانی تـری وەك سەقیفە فەندی سەرۆکی دادگا وعبدالحق تۆفیق و.. لە دەورە بوە.

٩. کۆمەڵێك کەسایەتی سـەرۆك عەشـیرەتی وەك: دیـاب ئاغـە، مەچـۆ ئاغـە، مستەفا دەرسیمی، ئەحمەد رامز، مراد پاشا، رەهبەری برازای سیدرەزا...

١٠. ئەو کۆمەڵە سەرۆك عەشیرەتانەی بەهیزی خۆیان یارمەتی ئـەتاتورکیان دا زال بێ بەسەر ئەستەمبۆڵ، لەوانە: قاسـم بـك جـوبرانلی، حـاجی شـکری بەگ، مستەفازکی بەگ، رامزبەگ،

---

[١٣٥]- یاداشت ـ ب٣ ل١٥٠

١١ لەخوارووی کوردستانیش وەك: ئایبزادە نوری ئەفەندی، رفیق حلمی، سلیمان فهمی ئەفەندی، محمد نوری ئەفندی نەفتچی زادە، نازم بەگ، فتاح بەگ...ئەوانە رۆڵی گرنگیان پی بینرا بۆتەقەلای گێرانەوەی ویلایەتی موسل بۆ سەر تورکیا.

تبینی بکە هەڵەو خیانەتی عەلمانی کورد چۆن تیکەل بوە، هەمویان هەرکورد بوینە، بەڵام دەبێ ئەوەش بڵێین بەشێکیان لەدوایدا گەڕانەوە.

## مناقەشەکەی هەڵوەشاندنەوەی خیلافەت:

رۆژی ١ ـ ٣ ـ ١٩٢٤، شوێن ئەنقەرەیە، لە ئەنجومەنی گەورەی تورکیا (پەرلەمان) ئەو گفتوگۆیە دەستی پێکرد سەبارەت بەهەڵوەشاندنەوەی خیلافەت، یەکەم جار ئەندامان سەریان سوڕما و ئۆپۆزسیۆن زۆرایەتی بو لەنیو پەرلەمان، بەڵام کەمال ئەتاتورك زۆر لێزان وکاریزمی بو، (٣) رۆژ بەردەوام دمەتەقێ و گوتارو گوتاری پێچەوانەو گفتوگۆ بوو، تا لەکۆتایی گەڵاڵەکەی ئەتاتورك سەرکەوتوو بو، لەوتارەکانی دەوەستا لەسەر دوو کۆلەگەی سەرەکی:

١ دەیوت: شریعەتی ئیسلامی چەسپاوە کۆمەڵگەش دەگۆری و بەرەو پێش دەچی، ئەو شەریعەتەش بۆ کۆمەڵگەیەکی بیابانی نەفام هاتوە لە رەگەزو زەمان و زەمینێکی جیا لەئێمە، ئەوشەریعەتە لەدوای ١٣ سەدە بۆکۆمەڵگەیەکی نەجیب زادە و پێشکەوتوی وەك تورك ناشیت، بۆیە مانەوەی ئەو شەریعەتە لەنێوماندا وامان لێدەکا لەوڵاتانی شارستانی ئەوروپی دامان کەلێنێ بەپاشمان بخا، بۆ ئەوەی پێشکەوین و ببینە وڵاتێکی پیشەسازو مەدەنی و مۆدیرن پیویستە ئەو شریعەتە لادەین و دەستورێکی عەلمانی، کۆمەڵگەو دەولەتێکی مۆدێرن دروست بکەین، ووتیشی بەڵێنتان پێدەدەم پەیڕەوی بۆچونەکەم بکەن، خۆتان لەو ئاینە دوور خەنەوە بەماوەی ٢٠ ساڵ تورکیا دەچێتە رێز فرنسا و بەریتانیاو ئیتالیاو ژاپۆن...، ئەو ئەوروپایەش بەهۆی دوور خستنەوەو جیاکردنەوەی ئاین لە دەولەت واپێشکەوتن.

٢ خاڵی دووەم لە پاساوو گوتارەکانی ئەتاتورك ئەوە بو دەیوت: خوا توخمی توركی بۆ دواکەوتوویی و ژێردەستەیی و پەراویزی دروست نەکردووە، هەروەك لەناو عوسمانی وایە، بەڵکو تورك توخمێکە هەمو جیهان پیویستی پێیە بۆ پیشرەوایەتی، وەك پیویستیەکی میژوویی پیویستە لەدەوڵەتیکی سەبەرخۆیی توركی بخرێتە ئەزموون، زۆری ئەو فەرمایشتە دووبارە دەکردەوە دەیوت، تورك لەنیو عوسمانی زۆر مەغدور بو، زیاتر کوردو چەرکەسی و ئەرنائووت دەسەلاتدار بوو، وەبیری دەهینانەوەکە چۆن لە سەردەمی عوسمانی بە(تورك) دەگوترا بیٚ ئیدراك، گێل، اعرابی تورك، ئەحمەق، .....) زیاتر لەوەش باسی ئەوەی دەکرد ئەوەی خوێن دەرێژی تورکەو سودەکەش بۆ خەڵکی ترە، باسی لەوە دەکرد ئێمە چیتر خۆمان ناکەین بەراگێڕی خەڵکی تر بەناوی (ئومەی ئیسلامی – یان میللەتی عوسمانی)، لێرە بەولاوە تەنها خزمەتی خۆمان دەکەین و تورکیا یەکی مۆدێرن و مەدەنی بنیات دەنێین. واتە دەیویست بلێت ئێمە لە ئاستی ئومەمی دادەبەزین بۆ ئاستی نیشتمانی[١٣٦]، وەك مەسەلەی ریفۆرمخوازەکانی ئیرانی ئێستا.

بەوەو چەند تەورەیکی تری پاساوی وروژینەر، توانی لەدوای (٣) رۆژ دەمە تەقی رایەکانی خۆی بە (ترهیب) و (ترغیب) زاڵ بکاو، قایل بون بەدەنگ دان خیلافەتیان لەرۆژی ٣ ـ ٣ ـ ١٩٢١ هەڵوەشاندەوە.

بەو شێوەیە تورکیای نویٚ لەدایك بوو بەناسنامەیەکی نویی توركی لەسەر بنەمای دەستورێك کەناوی کوردو کوردستان و ناوی عەرەب چەرکەس..... هیچ لایەکی تێدانەما، لە مادەکانی ١ تا ٣ و لە ٦٤ تا ٦٨(بە تایبەتی مادەی ٦٦ لە بارەی تورك ڤەتەنلەر) هەمو دانیشتوانی تورکیای بە تورك لەقەلەمدا وەك مادەی ٤ی بەرنامەی نازی ئەلمانی، بەوشێوەیە نکولی لەبونی کورد کراو مەینەت و رۆژی رەش چاوەروانی میللەتی کورد بوو.

---

[١٣٦] ـ لەسەر ئەو بنچینەیە ئیتحادولتەرەقی دروست بوو، ئەو بیرەی دەولەتێکی ناشیۆنالیزمی لە جیاتی دەولەتێکی ئیمپراتۆری ئیسلامی لە ووتارەکەی ئیمپراتۆر(فالهایم)ی ئەلمانی دێت لەکاتی سەردانی بۆ ئەستەمبۆل و وتی: ئیوە ئەو بەرپرسیا،بەتەی ئیسلام لە خۆ بکەنەوەو دەولەتێکی تورکی دروست بکەن سنوری لەناوەراستی ئاسیا تا دەریای ناوەراست بیت.

## کورد لەو وەچەرخانە زەرەری بوو یان قازانج؟

مەبەست لەوەیە ئاخۆ کورد قازانجی کرد یان زەرەر لە وەچەرخانی سیستەمی خیلافەت بۆ سیستەمی عەلمانی، هەرچەندە پرسیارەکە زۆر نامەنتیقیە بەلاّم بەشێکی زۆری ڕەوشەنبیرانی نوێ، بەتایبەتی ئەوانەی زانیاریەکانیان سەرچیخە، لەلایەکی تریش بەشێك بە هەنگاوەکانی ئەتاتورك وبلیمەتایەتیەکەی سەرسامن، هەربۆیەش لەسەرەتادا ئەتاتورك (بەناوی مستەفا کمال پاشا) ناوبانگی دەرکرد، دوای نیازەکانی ئاشکرابون، ئەو پیاوە بەرپرسە لەتێك دانی خیلافەت و مەینەتی کورد پێکەوە، سەرەرای ئەوەش هێشتا بەباش باسی دەکری تەنانەت لەلایەن کوردانیش، هەربەنمونە بە پێنوسی وەزیری ڕەوشەنبیری حکومەتی کوردستان (سلام عبداللە) لەگۆڤاری گولان ژ: ٢٦٨ بەسەردیرەکی مەزن هاتووە: ئەتاتورك تورکیای لەتاریکیەوە گواستەوە ڕوناکی، کەواتە ئەو دوو ڕایە زۆر لێك جیان، بەڕایەك بەرپرس بێت لەمەینەتی کوردو تاریکایی هینابی و بەرای بەشێکیش ڕووناکی بێت، کەواتە ئەو پرسیارە ئێستا لۆژیکیەو بابزانین کورد چ ڕووناکیەکی بەرکەوت وقازانجی کرد بە نەمانی خیلافەت و هاتنی عەلمانیەت یاخود پیچەوانە:

هەڵبەتە لەپێش ئەوەی وەلاّم بدەینەوە، ئەوە مانای وانیە لێرە دیفاع لەخراپە و خراپەکاری سولّتان و والیەکان بکەین، بەلّکو بەراوردێکی گشتیە ئاخۆ بزانین باری سیاسی کورد لەکام لا باشتر بوو؟ لەسەروو هەندێ لایەنی گشتیمان لەوبارەیەوە باس کرد، لەوەی خوارەوە بە وردترو خالّی نوێ تر باس دەکەین:

١ یەك بەدریژایی خیلافەت نزیکەی ٦٤ میرنیشن و دەولّەتی کوردی دروستبو، لەوانە: حسنوی، مەروانی، شەدادی، ئەردەلان، سۆران، یابان، یونان... هتد، کەچی بۆ هەمو عەرەب تەنها ٦٣ میرنیشین دروست بون[١٣٧]، بۆیە دەلّێین میرنیشن و دەولّەتی کوردی چونکە هەندێکیان لەئاستی دەولّەت بونە، خاوەنی سکەو ئالاّی تایبەتی بونە، لەنوێژی هەینی دوعا بۆ سولّتان و خەلیفە نەکراوە بۆ (میر)ی کورد کراوە، هەریەکە لە (سکە) و (ئالاّ) و (دوعا) ی هەینی نیشانەی سەربەخۆیی تەواو و ئاستی دەولّەتی بوە، جار وابو دەسەلاّتی

[١٣٧]- بروانە سيارالجميل - بقايا وجذور تكوينات العربية ص٤١٧

ئەو دەوڵەتانە دەگەیشتە دەرەوەی کوردستانیش، بنەماڵەی گیان پۆلاکان (جونبلات)ی ئێستا لەشام و لوبنان و دروزو دەسەلاتی بنەماڵەی محمد علی پاشاو ـ جگە لەدەسەلاتی صلاح الدین ـ ئەوە لەسەردەمی خیلافەتی ئەی کوا لەدوای ئەوەی لە (١٨٤٠)ەوە لاوازکرا و لە ١٩٢٤ ڕووخێنرا، کوا لەدوای ئەو مێژووە سەروەری کورد چیە؟ کوا دەسەلاتیان؟ کوا میرنیشین و دەوڵەت؟ کوا کەسیەتی کورد... کوا.. کوا؟وەلامەکەی مەینەت وسوتان وکیمیایی وئەنفال و وێران بوە.

٢. لەسەردەمی عەلمانی کوردستان دابەش وداگیر کرا لە ڕەوڕەوەی پێشکەوتنی میللەتان داکەلێندراو بێ بەشیان کرد لەبون بەدەوڵەت، لەسەردەمی خیلافەت لەمیللەتانی تر کەمتر نەبوو، تەنانەت زۆربەی جار لەعەرەب چاکتر بوو، دەسەلاتی کوردی بەسەر عەرەب زاڵتر بووە، بۆیە بە جیا لەلایەن تۆماس بوا و ڕاپۆرتی لیژنەی (تەحکیمی موصڵ) هاتوە: تورك و عەرەب و ڕەگەزەکانی تر هاتوونە لەناو کورد تواینەوە[١٣٨]، ئەو بۆچوونە پیوانەیەکی گرنگە بۆ بەهیزی کەسیەتی کورد، هەر بۆ ئەو رایەی تۆماس بوا ئەگەر بەوردی سەرنج بدەینە مێژوو دەبینین لەکاتی راوەدونانی (بنەماڵەی پێغەمبەر د.خ) لەلایەن ئەمەویەکان، سەیدەکان لەجیهان پەرش و بلاو بون، لەزۆربەی ولاتان ئینتمای ڕەچەلەکیان پارستووە، لەهەندی شوێنی وەك ناوچەی فارسی بە ئیمتیازەوە پارستوویانە، تا ئەو ساتەش لەئێران کەسی یەکەم دەبێ لەرەچەلەکی سید بێ، مرجع و ودلی ئەمر دەبێ سەید بێ، لەناو کورد ڕێزی سەید گیراوە بەلام لەبەر بەهێزی کەسیەتی کورد سەید لەڕەچەلەك تواینەوە بووینە کورد، زیاتر لەوەش زۆربەی پێشڕەوانی کوردایەتی لەوان بووە، ئەوە لەڕووی کوردۆلۆجی و مرۆڤناسیەوە بەلگەی چاکبونی باری سیاسی و کەلتوری فەرهەنگ و کۆمەلایەتی کوردە، کەچی ئەو دۆخە بە پێچەوانە دەبینین لەدوای هاتنی عەلمانیەت هەر کوردە لەنێو میللەتانی سەردەستە توایتەوە، تەنانەت لەناو کوردستانیش ئەو دۆخە بەدی دەکرێ، دەبینین شاری هەولێر لەسەرەتایی

---

[١٣٨]ـ تأريخ الاكراد ص١٩٧، هەروەها بروانە: راپۆرتی لیژنەی نێوبژی ویلایەتی موسل

هـاتنی عەلمانیـەت (١٪) ی ناوشـار تورکمـان بونـە کەچـی تاگەیـشتینە پـەنجاکانی سـەدەی (٢٠) بـووە لـە ٤٠ ٪ تورکمـان، بەشـی هـەرە زۆری بەرەچەلەك کوردن... هەروەها کوردێکی زۆری تری ناوچەی موسل و بەغـداو حلەو[١٣٩] بووینە عەرەب.

٣. ئەگـەر بـەوردی سـەرنج بدەینـە نەخـشەکانی کوردسـتان لەسـەرەتاوە، لەوەسفەکانی شەرەفنامە، لەگەرانەکانی ئیبن بەتووتە لە کتیبی (تحفة النـضار فی غرائب الأمـصار) دەلی کە لەبەسرە بـەرەو شـیراز رۆیـشتم لەسـەر رێگـا لامدا میوانی خێلە مەرلەوەرێنە کوردەکان بووم، ئیبن خەلدوون لە(تاریخ)باس لـە جبـل اکـراد دەکـا لـە نزیـك کەنـداوی فـارس[١٤٠] بەهـەمان شـێوەش ئەولیاچەلەبی سنوری کوردستان تا کەنداو دەبا[١٤١]، واتە ئەو نەخـشەیەی کـە لەسەر دەریای (کەنداو) دیایکراوە بۆسەر دەریای سپی ئەسلی خـۆی هەیـە و زیادەرەوی تێدا نیە، لە (معجم البلدان)ی یاقوت حموی، لە سیاحەتنامە، لـە شەرەفنامە، لە ئەنسیکلۆبیدیای عوسمانی بەناوی (قاموس الاعلام) هـەروەها لەنەخشەکانی جوگرافی ناسی ئیسلامی...، لەجوگرافی ناسەکانی بیـانی تـر نەخشەی کوردستان هەر مەزن بوە، جوت بوە لەگەل ئەو نەخـشەیەی لەسـالی ١٨٩٣ و ١٨٩٦ی سەردەمی عبدالحمید کە کوردسـتانی لەسـەر دیـایکراوە، لەبەشـی یەکـەمی رێکەوتنامـەی ئـەرزەرۆمی ١٨٢٣/٧/٢٨، هـەروەها تـا مادەی (٦٢)ی سیڤەر کەسنوری کوردستانی لەرۆژهەلات فرات دەست نیـشان کردووە، هەمو ئەوانـە لەسـەردەم وکۆتـایی خیلافـەت بـوە، واتـە نەخـشەی کوردستان لەسەردەمی خیلافەت زۆر مـەزن بـوو، دەگەیـشتە سـەرووی ٥٠٠٠٠ کم[٢]، لەدوای ئەوەی عەلمانیەت هات نەخشەی کوردسـتان هـەم بـچووك

---

[١٣٩]ـ بروانە یاقوت حەمەوی وزۆربەی کتێبە ئیسلامیەکانی گەرێدە باس لە پێکهاتەی شاری (حلە)دەکەن و دەلێن دوو چینی لێ ژیاوە کوردو بەشێکی تر پێیان ووتراوە ئەهلی جامیعەو باس لە کەمێك ناکۆکیش کراوە لە نێوانیان... هەتا لە( تاریخ أبی الفداء ـ الملك المؤید إسماعیل بن أبي الفداء ج١ ص٤٧٣) لە سەردەمی سولتان محمودی عوسمانی وا باسی حلە دەکا:
وفیها سار الأمیر دبیس بن صدقة إلی الحلة بإذن السلطان محمود وکان دبیس معتقلاً مع السلطان محمد من حین قتل أبوه صدقة إلی الان فلما أطلق توجه إلی الحلة واجتمعت علیه العرب والاکراد ...نەی کوا نیستا؟.
[١٤٠]ـ وفي شرقي بلاد خوزستان جبال الاکراد متصلة إلی نواحي أصبهان وبها مساکنهم ومجالاتهم وراءها في ارض فارس... تاریخ ابن خلدون ص٨١. لە( مقدمة ص٦٣ ) دووبارەی کردۆتەوە
١٤١ـ سیاحتنامە ج٤ص٧٥

بۆوە، هەم لەسەر نەخشەی نەتلەسەکانیش نەما، تەنانەت ئێستا ڕووبەری کوردستان لەسەردەمی عەلمانی نیوەی ڕووبەری کوردستانە لەسەردەمی خیلافەت.

٤. هەڵبەتە بەڕوونی دەردەکەوێ کەکورد لە وەرچەرخانی خیلافەت بۆ عەلمانیەت زەردرمەندی هەرە گەورەیە، زیاتر لەوەش تا ناوچەکە هەنگاوی زیاتر نا لە: مەلەکی بۆکۆماری، بۆمەدەنیەت، بۆ دەستوریەت، بۆ مۆدیرنیەت.. مەینەتی کورد زیارتر بوو، یان بەواتایەکی تر ئەو نەخشە نوێیەی عەلمانیەت لەناوچەکە جێ گیرتر دەبوو مەینەتی کورد تۆکمە تردەبوو،

هەربۆیەش دەبینین سەرکردە دلسۆزەکانی کورد لە (ملاسلیم، شیخ عبدالسلام بارزانی، شیخ سعید پیران، شیخ سعید نەورسی، ...)، هەمو ئەوانە خواستیان دروشمەکەی شێخ سعیدی پیران بولەشۆرشەکەی سالی ١٩٢٥ دا، کە بریتی بو لە: یان گەرانەوەی خیلافەتی یان کوردستانیکی سەربەخۆ، کەواتە خیلافەت بۆکورد باش تر بووە.

٥. لەپێشوتر لە چوار چێوەی ڕێکەوتنامەی سوڵتان و بەدلیسی ئەوا گەلێ جارکورد هاریکاری سوپای عوسمانیان کردو سەریان خستن، ئەگەرچی هەندێ جارهەلەش بوبن وەك گوزارشەکانی سوارەی حەمیدی، بەلاّم هەرگیز نەگەیشتە ئەوەی تاوان بکەن و جینۆساید بکەن وەك ئەوەی ڕوویدا بەرامبەر ئەرمەنیەکان لەسەر دەستی سوپای ئیتحادیەکان و کوردە کرێگرتەکانی ئەوان[142]، ئەوەش بەڕونی لە مادەی (١٤٢)ی سیڤەر ڕونکراوەتەوە لە ئەستۆی کورد نەبوە، هەروەك دوای لە ڕێکەوتنی تاشناقی ئەرمەنی وخۆیبونی کوردی ڕۆژی ١٩٢٧/١٠/٢٩زیاتر ڕوون کرایەوە[143]

٦ ئنجا ئەگەر بێین ساتە کۆتاییەکانی خیلافەت و سەرەتای عەلمانیەت بەراورد بکەین، ئەو سەردەمەیە کەفەترەی سەلبی عوسمانیەکانە بەرامبەر بەکورد،

[142] ـ یەکێ لەو کوردانەی تاوانبار بورن بەو جینۆسایدە (زولفی بەگزادە) بو، کە لەلایەن بەریتانیاوە فەرمانی دەستگیر کردنی هەبوو، لەسەرتاوانی ئەرمەنی کوشتن ئینگلیزەکان لەسالی ١٩١٩ لەکەمپێکا دەست بەسەریان کردبوو، هەر ئەویش بوو بە هاوەلی عیصمەت ئینینۆ چوو لۆزانی مۆر کرد بەناوی کورد، لە قازانجی تورکیاو مالی کوردی وێران کرد

[143] ـ ئەو ڕێکەوتنە لە ١٩ مادە پێکهاتبو.

سەرەرای ئەوەش هێشتا چەندە لەفەترەی دوای خۆی عەلمانی چاکتر بووە، بەو نمونانەی خوارەوە:

أـ لەدەسەلاتی عوسمانیدا کورد زۆر دەسەلاتدار بووە، مەبەستمان میرنشین و دەسەلات و کیانە کوردیەکانە نیە، مەبەستمان ناوبەیکەری عوسمانیـە، شـێخ عبداللـه بەکەسێتی دووەمـی نێـو عوسمـانی پـۆلێن کـراوە، گولـە بەندەکـەی شـیخ عبیداللـه لای سـولتان عبدالحمید، دوای شیخ عبدالقادری شمزینـی سـەرۆکی ئەنجومـەنی دەولـەت بـوو، سـعید پاشای باوکی شـریف وەزیـری دەرەوە بـووە، لـەوەو پـێش نـاوی بەشـێك لـەو بەرپرسـە مەزنانەمان تۆمار کرد، دووەمین دەولەمەندی نیو عوسمانی (ابراهیم ملی پاشـا)ی کـورد بووە، ... یەکێ لەو پینج دامەزرینەرەی جامیعەی ئیسلامی (شـیخ سـعیدی نەورەسـی) کورد بووە....، زۆربەی شێخە ئیسلامەکان لەکورد بووینە، هەروەك لەوەو پێش ناوەکانمان تۆمار کرد، دەسەلاتی شیخ الاسلام دەگەیشتە رادەی لادانی خەلیفەش، هـەروەك هـەردوو سولتان عبدالحمید ومرادیان لادا، ئنجا لەبەرامبەریشدا چونکە شەخسیەتی کـورد بـەهێز بوو لەبەرەی کەسایەتیە کوردەکان زیاتر ئەوان بووینە، چوار کەس ئتحاد الترقیان دروسـت کرد لە ١٨٨٩ هیچیان تورك نەبون برتیـی بـون لـە: د. عدباللـه جـودت، د. ئیسحاق سکوتلی، محمد رشید چەرکەس، ئیبراهیم تەمۆ، دوانی پیشەوە کورد بون...، ئەی لەدوای هاتنی عەلمانی کوا کورد رۆلی چی هەبوو، جگە لەوەی ئەگەر بوبێ لەخزمەت تورکایـەتی عەرەبایەتی بوە، کۆتاییەکەشی بە مەرگەساتی خۆیان ومیللەتەکەیان هاتوە، کاتێ کمـال ئەتاتورك خۆی دروستکرد بەهۆی عەلمانی و عەشـیرەتە کوردەکـان سـەرکردە کوردەکـانی لەسێدارە دا (کە لەدوای باسی دەکەین)، هەتا ئەوانەی دۆستی بون و یارمەتیان دا لەسەر کەوتنی.

ب ـ ئەستەمبۆل بەرەسمی دانی نابو بەمافی چارەی خونوسی کورد، تـارادەی دەولـەتی سەرەبەخۆ دروستکردن، هەر لەجامیعەی ئیسلامی و مافی میللـەتانی عوسمـانی و دوای رێکەوتنی سولتان و شیخ عبدالقادر شمزینی[١٤٤]

[١٤٤]ـ لە رێکەوتننامەکانی عوسمانی و کوردا لەسالآنی ١٩١٢ـ١٩٢٠ دووبارە مافی سەربەخۆیی کوردستان بەتەواوی هاتبوو لە رێکەوتنێکی نێوان نوێنەرانی کورد وعوسمانی لە چوارچێوەی جامیعەی ئیسلامی

ج ـ لەهەموی گرنگتر مۆر کردنی سیڤەر لەلایەن ئەستەمبۆڵ و عوسمانیەکانەوە دژایەتیکردنی لەلایەن ئەنقەرە و کەمالیەکان لەبەر گرنگی بە هەلوەستەیەك دەیکەنە سەردیریك.

لە سەردەمی خیلافە لەبەر ڕێزی کورد بە (قورەیشی عەجەم)[١٤٥] بەناوبانگ بوو..کەچی ئێستا لە سەردەمی عەلمانیەت. بە (یتیم الامه الاسلامیه) ناو دەبرێ هەل بستویان؟

## لەخیلافەت بۆ عەلمانیەت لەسیڤەر بۆ لۆزان:

لەنێوان ئەو هەمو ڕێکەوتن و پەیماننامانەی بەسترا لەکاتی جەنگی جهانی یەکەم ١٩١٤ ـ ١٩١٨، وەك لیژنەی بنسن لە ١٩١٥، پەیماننامەکانی: سایکس بیکۆ لە ١٩١٦، فرسای لە ١٩١٩، سان ڕیمو لە ١٩٢٠، سیڤەر لە ١٩٢٠، قاهرە لە ١٩٢١، لۆزان لە ١٩٢٣ بۆچی تەنها سیڤەر بۆکورد چاك بوە؟ پرسیارێکە کەمتر هەلوەستەی لەسەرکراوە، ئەو پەیماننامەیە تایبەمەندی خۆی هەیە وەك ئەوانی تر نەبوە، لەودوە کۆمەلێك نهێنی نوێمان بۆ ئاشکرا دەبێ، ئەویش ئەوەیە لەو ڕێکەوتنە ڕەهەندی تری تیابوە، هەر ڕۆژئاوا بەتەنهانەبووە، بە پیچەوانەی ئەوەی زۆربەی ڕۆشنبیرو نووسەرو سیاسەتمەدارانی کورد واتێگە یشتون، کە چاکەی سیڤەر لەڕۆژ ئاواوە بۆ کورد هاتوە، کەچی وانیە، جاری لەپیشدا سیڤەریش سەلبیاتی خۆی هەیە، ئنجا سیڤەر زیاتر لەلای عوسمانی هاتوە[١٤٦]، دەولەتی عوسمان ئەستەمبۆڵ دروستیکردو دەولەتی کەمالی عەلمانی ئەنقەرەش لەدژی وەستا، ئەو ڕێکەوتنە یەکێك بوولەو(٧) ڕێکەوتنامەی لەگەل ولاتانی دۆڕاو کرا بەو شێوەیە:

ڕێکەوتنی فرسای بۆ ئەلمانیا سازدرا لە ٢٨ـ٧ـ١٩١٩، سان جرمان بۆ نەمسا سازدرا لە١٠ـ٩ـ١٩١٩، (نەوی) بۆ بولگاریا سازدرا لە ٢٧ ـ تشرینی دووەم ـ ١٩١٩، تەربانۆ بۆ مەجەر سازدرا لە ٦ـ ٧ـ١٩١٩، (رابالۆ) لەنێوان یوکسلافیاو ئیتالیا لە ١٢ـ تشرینی دووەم ـ ١٩٢٠، ڕێك لەنێوان سۆڤیەت و پۆلۆنیا لە ١٨ـ ٣ـ ١٩٢١، ڕێکەوتنامەی

---

[١٤٥] ـ شفاء العلیل ل٣ هەروەها شەرەفنامە ل١٣٢ پێشەکی.

[١٤٦] ـ بڕوانە: دەقەکانی سیڤەر وخوێندنەوەیەکی تر...

سیڤەریش بۆعوسمانی لە ١٠ـ ٨ ١٩٢٠سازدرا، ڕێکەوتنی سیڤەر پێك هاتبوو لە ٤٣٣ مادە، تایبەت بوو بەو ولاّتانەی ژێر دەستی عوسمانی بون و سەربەخۆیی پێ دابون، ناوی کوردستان ومادەکانی٦٢، ٦٣، ٦٤ بەڕوونی لەدوای ئەرمینیا هاتبوو لە بەشی سێیەم، ناوی عێراق بەڕاستە و خۆ نەهاتبوو بەناوی (میزۆ بۆتومیای عەرەبی)[١٤٧] لەمادەی (٩٤)هاتبوو، سەرۆکی وەفدی عوسمانی (هادی پاشا) مۆری کردووە و، بناغەی بەهێزەکەی یاسای و سیاسی ئەو ڕێکەوتنە ئەوە دێت کە سولّتان لەگەل کورد ڕێکەوت بۆ سەربەخۆیی پێدان و مۆرکرا لەنێوان هادی پاشا و شیخ عبدالقادر و شریف پاشا دوای دوو وەفد پێك هات لە هەردوولا، نوێنەرانی کورد پێك هاتبوو لە: عبدالقادر شەمزینی (سەرۆك)، ئەمین عالی بدرخان، مراد بدرخان، مەولان زادە رفعت بەگ، لە لایەن نوێنەرانی عوسمانیش پێك هاتبوو لە: دووەمین کەسایەتی نێو عوسمانی شیخ الإسلام صبری زادە(سەرۆك)، ئەحمەد عبوق پاشا، عونی پاشا لە چوارچێوەی جامیعەی ئیسلامی

لەسەر ڕەزامەندی هەردوولا سولّتان قایل بو کە ئەو ڕێکەوتنە ببێتە بەلّگەنامەیەکی جهانی و بۆیە ناوەرۆکی ئەو ڕێکەوتنە لە١٠/٨/١٩٢٠ لەسیڤەریش بەرجەستەکرا، ئەگەر بەوردتریش بچینە نێو بابەتەکە دەبینین ئەو ناوەرۆکە یاسایی و سیاسیەی لە سیڤەر هاتووە، هەمان نەخشە و پلانی سەرکردە کوردەکانی ئەوسایە، بەتایبەتی شێخ عبدالقادری شەمزینی و مالّی بەدرخانیەکان (ئەمین عالی بەدرخان)[١٤٨] کە بەداخەوە بەشێك بەشێوەیەکی تری لێ تێگەیشتوون، پێیان وایە ئەوە لە دەسکەوتی عەلمانیەتی کوردەو مانیعەکەی شیخ عبدالقادرو ئاینیەکانی تر بوە، ڕوونیان نەکردۆتەوە کە ئەو ڕێکەوتنە لە لایەن عوسمانی مۆرکراوە نەك کەمالیەکان، لەوانە مێژوونوسی کورد د.کەمال مەزهەر[١٤٩]، هەروەها بڕوانە نارازیەکانی تر لە (ل٧٦ی کتێبی مالمیسانژ: القومیە الکوردیە ود. عبدالله جودت)، هەروەها کریس کۆچیراش وای بۆچوە...بەلاّم هەر هەمان کتێبی (د.کەمال) دەقی گفتوگۆیەکەی (شێخ عبدالقادر) لەگەلّ ڕۆژنامەی

---

[١٤٧] ـ بەداخەوە مێژوو نوسی عەرەب فێلیان لەکورد کردوو، لەتەرجەمەی ئینگلیزیەکە میزۆ بۆتامیان کردووەتە (العراق) کەلێك جیان، بۆتەوەی رەسەنایەتیەك بەو عیراقەی ئێستا بدەن.

[١٤٨] ـ بڕوانە: (فایلی دوارۆژی کوردستان ـ بەریتانی) لە ل٨٢، (کوردوکوردستان لە بەلگەنامەی بەریتانی ـ کەمال مەزهەر)

[١٤٩] ـ بڕوانە: (د.کەمال ـ کورد و کوردستان...) ل٧٦

(ئیقدام) تۆمارکردووە بەجوانی ئەوە ڕونکراوەتەوە کە شێخ عبدالقادر و ئاینیەکان چیان دەوێ، پێیان وابوو لە چوارچێوەی دەوڵەتی عوسمانی ئۆتۆنۆمی وەرگیرێ بۆ ماوەیەك وەری دەچەرخێننە سەربەخۆیی تەواوی کوردستان[١٥٠]، بۆ زیاتریش بڕوانە دەقی نامەکەی شێخ عبدالقادر بۆ فەڕەنسا کە لە ١٩٢٠/٦/٢٥ نوسیتی[١٥١]، ئەو پڕۆژەیە لەلایەن فرید پاشای سەرۆکوەزیرانی دەوڵەتی عوسمانی (ئەستەمبۆل ـ سوڵتان واحدالدین) بە فەرمی مۆرکراوە[١٥٢]، دیڤید ماکدۆناڵدیش هەر وای بۆچوە لە کتێبەکەی خۆی و ئۆتۆنۆمی مەرەتای سەربەخۆیی بوە چ لە ڕێی ئینتداب چ لە ڕێی ئۆتۆنۆمی، لە میساقی (کۆمەڵەی نەتەوەکان ـ عصبة الامم)لە مادەی (٢٢)ش هەر واهاتبوو کە سیستەمی ئینتداب (گروپیA)* دەبێ لەدوای ئینتداب ئۆتۆنۆمی محەلی وەرگرن بۆئەوەی لە داهاتوەکی نزیك سەربەخۆ بن، هەروەهاش بۆ وەرگرتن و بون بە ئەندام لە (عصبة) سێ پۆلی وەردەگرت موستەعمەرە و دۆمینیۆ و ئەوانەی ئۆتۆنۆمیدارن[١٥٣]، ئەوەش دەقا و دەق خوردکراوەتەوە لە سیڤەر، لێرەوە چاکتر بۆمان دەردەکەوێ کە ئیجابیەکانی سیڤەر بۆ کورد لەوە دێت، کە وەفدی عوسمانی بەشدار بووە نەك وەفدی تورکیا، وەفدی عوسمانی بریتی بوو لە (هادی پاشا ود.ڕەزا تۆفیق)، هادی پاشاش ئەو کەسەیە بە نوێنەرایەتی سوڵتان محەمەد واحدالدین وفرید پاشای سەدری ئەعزەمی عوسمانی ڕێکەوتنی سەربەخۆیی کوردستانیان بەو قۆناغانە لەگەڵ شێخ عبدالقادر شەمزینی و شەریف پاشاو ئەمین عالی بدرخان مۆرکرد، لەبەڵگەنامەیەکی تریی بەریتانی (FO.٣٧١/٥٠٦٧) کە لە ل٣٢٦ی هەمان سەرچاوە هاتوە دەڵێ: فەریدپاشا لایەنگیری دروست بونی دەوڵەتی کوردی کردوە لەڕێی ئۆتۆنۆمی ناوەخۆ، ئینجا دەبێ ئەوەش وەبیر بهێنینەوە کە(سوڵتانی عوسمانی وفرید پاشا) علی ئیحسان پاشایان ڕاسپارد بە بروسکەیەکی فەرمی لە ١٩١٩/١٠/٣٠ مومتەلەکاتی عوسمانیان تەسلیمی حکومەتی شێخ محمود کردو دانیشیان پێدا هێنا،

---

[١٥٠] ـ بۆ ئەم مەبەستە بڕوانە کورد لە بەڵگەنامەی بەریتانیا ژمارە: ٤٠، f٠,٣٧١/٥٠٦٨ بۆ وەزارەتی دەرەوە ١٩٢٠/٤/٨

[١٥١] ـ کۆمەڵەڕێکخراوەکوردیەکان لەبەڵگەنامەکانی بەریتانیاوفرنسالەبەلگەنامەی ژ:٤٤ و ل١٥٩ بڵاوکراوەتەوە

[١٥٢] د عثمان علی ـ دراسات فی الحرکة الکوردیة المعاصرة ص٣٢٥، هەروەها بڕوانە: بە لگەنامەی بریتانی Air٥١٢ تەلەگرام لە ١٩١٩./٤/١٨

* سیستەمی ئینتداب کرابووە سێ گرووپ:A، B، C. ئەوەی عوسمانی گروپی A بوو چونکە ئاستی بە دەولەت بوونیان بەرز تر بوو لە گروپەکانی تر.

[١٥٣] ـ الأمم المتحدة فی نصف القرن ص٢٥

ئەوەش پەیڕەوکردنی ڕێکـەوتنێکی تـری عوسمـانی و کـورد بـووە لـەبارەی سـەربەخۆیی کوردستان، لەلایەن عوسمانی وەفـدێك کـە پێـك هـاتبوو لـە شـیخ الإسـلام صـبری زادە (سەرۆك)، وەزیری کار ئەحمەد دەبوق، وەزیری دەریـایی عـەونی پاشـا، وەفـدی کـوردیش بەسەرۆکایەتی عبدالقادر شمزینی و مەولانە ڕەفعـەت بـەگ وئـەمین بـەگ، کەواتـە هـەر هەمان ڕێڕەوە لەسیڤەریش ڕەنگی داوەتەوە.

ئەو ڕێکەوتنە بۆکورد وەك بەڵگەنامەیەکی دەگمەن مایتـەوە، لـەدوای تـەواو بـونی ئەوڕێکەوتنەوە دەست نیشانکردنی سنوری کوردستان بـەپێی مـادەی (٦٢) ڕۆژ هـەلاتی فراتی دەگرتەوە.

دەسەلاتی عەلمانی ئەنقەرە بە سـەرۆکایەتی ئـەتاتورك ئـەو ڕێکەوتنـەی بـە (مـەرگی تورکیا) زانی، دەستی بەکارو چالاکی هەمە لایەن کرد بۆ لەبار بردنی، بـووە هـۆی زیـاتر ناکۆکی لەنێوان ئەنقـەرە و ئەسـتەمبۆل، بەشـێوەیەك ئەسـتەمبۆڵ دانـی نـا لـەناوەخۆو لەدەروە بەسەربەخۆیی کوردستـان و ئەنقەرەش لەدژ بـوو، لـەوەوە سـەرۆك عەشـیرەتەکان کۆبونەوە و بە ناوی (هاوپەیمانی هۆزەکان) لە ١٩١٧/١١/١٥ نامەیـەکی (٥) پرسـیاریان بۆ ئەتاتورك نووسی، تیایدا داوایان کردبوو بۆیان ڕوون بکاتەوە ئاخۆ ئەویش وەك سـوڵتان ئامادەیە بەتەواوی دان بە سەر بەخۆیی کوردستان بنێت؟

بەرە بەرە ئەنقەرە لەهەوڵ و تەقەلاکانی تاکتیکی و ستراتیژی خۆی لەهەمو بەرەکانی جەنگی و سیاسی و دبلوماسی دەست پێکـرد، کـوردێکی زۆری عـەلمانیش بـۆلای خـۆی ڕاکێشا، تاوای لێهات بەپـشتیوانی ئـەو کوردانـە وەك (ڕائـول ویلـسن) گۆتـەنی بەسـەر ئەستەمبۆڵ زال بوو، ئینجـا سـیڤەریش هەڵوەشـاندەوەو لـۆزانی ١٩٢٣ ی هینـا جێـی، کەلەنێوان١٤٣مـادە١٢٨ جـار نـاوی تـورکی تیـا هـاتبوو نـاوێکی کـوردو کوردسـتانی تێدانەبون.

## هەڵوێستی کورد

لەو وەچـەرخانە عـەلمانی کـوردیش ڕۆڵێکـی زۆریـان بینـی، لـەو بـاوەرە دابـون کـە چارەنووسی کورد بەعەلمانی چاتر دەبی نەك ئیسلامی، لایەنگری ئەتاتورکیان کرد لە دژی

سیڤەر و عوسمانی، بۆیە لەنێو کوردیش بەوهۆیەوە بونە دوو بەش، لە ڕاستێدا سەرچاوەی بەشبونیان لەوەوە دێت ئاینیەکان بانگێشەی برایەتی تورك و کوردیان لە چوارچێوەی جامیعەی ئیسلامی دەکرد، هەرچی ئەو بەشە عەلمانیە کوردە بوو بانگێشەی برایەتی کورد و تورکیان لە چوارچێوەی دەولەتی مۆدێرنی تورکیا بە سەرکردایەتی ئەتاتورك دەکرد[١٥٤]، هەریەکە لە شێخ عبدالقادر شمزینی و شریف پاشا[١٥٥] و شێخ سەعید پیران و نەورەسی و هەندێ لە بەدرخانیەکان و هەندێ دەستەی تری کوردی و ئاینیەکان[١٥٦] پێیان وابوو ئەوەی مستەفا ئەتاتورك دە یکا فروفێڵ و تاکتیکە و دەستکەوتەکانی کورد لە ئەستەمبۆل و پەیماننامەی سیڤەر هەڵدەوەشێنێتەوە[١٥٧]، دوای ئەوەی عوسمانی بەرەو هەلوەشانەوە ڕۆیشت ئاینیەکان دروشمی سەربەخۆییان هەڵگرت، هەروەك لە ئەرشیفی وەزارەتی دەرەوەی بەریتانی یاداشتی (یانەی ناوەندی کوردستان) تێدایە لە بەرواری ٢٠/٣/ ١٩٢٠ داوای سەربەخۆیی تەواوی کوردستان دەکا و نارەزایش دەردەبرن دژ بە فراوان کردنی سنوری ئەرمەن لە سەر حیسابی کورد[١٥٨]، بە پێی بەڵگەنامە بەریتانیەکان کە لەسەر زاری(بیرترام دیکسۆن) وەرگیراوە لە سەرانسەری کوردستان لەتبەتلیس وجزیرەو وان و دیاربەکرو سەعەرتەوبادینان وسلێمانی وخۆی وماکۆو سەلماس وموکریان و.. لە هەلچوون بووینە دژ بە ئیتحادی و زالکردنی تورکایەتی ودابەشی کوردستان، بە

---

[١٥٤] ـ بۆ تێگەیشتن زیاتر بە ووردی مێژووی دعبدالله جودت بخوێننەوە لەکتێبی: (القومیە الکردیە ود عبدالله جودت) خۆی بە نازناوی کوردی- تورکی ناوزەد کردووە.

[١٥٥] ـ بەشێك لەکوردە نیشتمان پەروەرو بیر تیژەکان زوو تر هەستیان بەوە کرد کەنەوەی ئەتاتورك دەیکا ماڵ وێرانیە بۆ کورد زوو لێی هەلکەڕانەوە ، شریف پاشا لە سەرەتا زۆر بەلای پرۆژەکانی ئاینی ونەستەمبۆل دا نەبوو دوای ئەو هەلویستەی وەرگرت کە بینی هادی پاشای نوێنەری سولتان ئامادەیە بچێتە سیڤەر لەسەر مافی تەواوی کوردستان مۆری بکا ، ئینجا لە ٢٣/٤/ ١٩٢٠شەریف پاشا بروسکەی رێزی بۆ سولتان لێدا لە بەرامبەر هەلوێستی چاکی بەرامبەر کورد.

[١٥٦] ـ دیڤید ماکدۆنال ناوی لەوانە نابرو کوردی ئەستەمبۆلی.

[١٥٧] ـ بۆ وورد تر بڕوانە ئەو بەلگەنامەیەی بریتانی چۆن عبدالقادر شەمزینی ئامۆژگاری ئەفەندی وسەرۆك عەشیرەتەکان دەکا کە دوای ئەتاتورك نەکەون: مذکرة حول السید عبدالقادر الشمزینی وسمکو
من المندوب السامي البریطاني / القسطنطینیة (٢٠ مایس ١٩٢٢)
وأشتکی السید عبدالقادر بأن کل المناشدات التي قدمها للحکومة صاحب الجلالة لم تلق آذاناً صاغیة و أنه فشل في کسب ثقة جلالته. وکرّر، کما فعل ذلك عدة مرات، بأنه کان في موقع یساعده علی السیطرة علی الکرد في الولایات الشمالیة الشرقیة، لو أعطیت له الفرصة للتحرك. وأکد هذه المرة وبثقة علی قدرته بإقناع سمکو للعمل وفق مصالحنا وأضاف أنه لا طائل من الاعتماد علی أشخاص مثل مصطفی باشا وآخرین الذین یحومون هنا وهناك. هؤلاء لیس لهم تأثیر حقیقي علی الکرد.

[١٥٨] ـ بڕوانە: کورد و کوردستان لە بەلگەنامە نهێنییەکانی حکومەتی بەریتانیا- د.کمال مەزهەر ل٨٢

سەرکردایەتی ئەو (٦) سەرکردە ئاینیە( مەلا سلیم بدلیس، رشید ئاغەی سلێڤانی، عبدالرحمن شرناخی، شێخ نوری بریفکانی، شێخ عبدالسلام بارزانی، شیخ سعید الحفید)[١٥٩]

بەشەکەی تر(لائیکیەکان) وەك لە بەڵگەنامەی بەریتانی لەلایەن جێگری مەندوبی سامی بەریتانی لە١٨/ مایس/١٩٢٠ ناردوە و دەڵێ (ناحەزانی سەید عبدالقادر) بریتین لە دەستەیەکی زۆر لەیەك نەچوو هی ئەوتۆیان تێدایە زۆر حەزیان لە سەربەخۆیی کورد نیە، زیاتر لەگەڵ ئەتاتورك رۆیشتون[١٦٠]، بەشێکی تریش سیخوریان دەکرد وەك ئەو کۆمەڵە رەوشەنبیرە کوردەی لەدەوری (مێجەر سۆن) لە هەوڵی ئەوە بون بەریتانیا لە شێخ محمود برەنجێنن بەناوی ئەوەی شێخ ئاینیە[١٦١]، (وەك لازاریف)دەڵێت: هەندێك لە بنەماڵەی بەدرخانیەکانیش (لائیکیەکانیان) خەریکی دانوستان بون لەگەڵ ئیتیحادیەکان داوای پارچە زەوی گەورەو ٢٠ لیرەیان کردبوو[١٦٢]، رەفیق حلمی فەرودیەکی بەدیاری لەلایەن شێخ محمود بۆ سوڵتان لەئەستەمبوڵ بردبوو، لەرێگا رای گۆری و کردیە دیاری بۆ ئەتاتورکیەکان لەئەنقەرە[١٦٣]، ئەو دەردە گەیشتبوە کوردەکانی دەرەوەی وڵات، لە بەڵگەنامەی بەریتانی ژ:٢١ لە ١٩٢٩/٤/١٨ بۆ وەزیری دەرەوەی بەریتانیا نوسراوە دەڵێ: مانگانە یارمەتی٦٠,٠٠٠$ یان بۆ ئەتاتورك دەنارد تا بزوتنەوەی خۆیبون تێیانیگەیاند کە ئەتاتورك چیە و یارمەتیەکەی پێ وەستاندن، تەنانەت ئیحسان پاشاش کە لەدواییدا لە ١٩٢٧بە شۆرشی ئاگریداغ هەڵسا، لایەنگیری ئەتاتورکی کرد و ئەفسەری بەرپرس بوو لە سەربازگەی ئەستەمبوڵ و تەسلیمی ئەتاتورکی کرد لە دژی سوڵتان[١٦٤]، بەو شێوەیە کوردە رۆشنبیر و لائیك (عەلمانی) و سەرۆك عەشیرەتەکان

---

[١٥٩] ـ دراسات فی الحرکة الکوردیة المعاصرة ص١٥٤

[١٦٠] ـ دەقی ئەوبەڵگەنامەیە لە(ئیجابیەکانی سیڤەر ـ دەقەکانی سیڤەر وخوێندنەوەیەکی تر) بڵاوکرایتەوە.

[١٦١] ـ بڕوانە: ا حمد تەقی ـ خەباتی کورد ل٩٢ هەروەها (دراسات فی الحرکة اکوردیة المعاصرة ص٢٧٤ )

[١٦٢] ـ دراسات فی الحرکة الکوردیة المعاصرة ص٢٥٢

[١٦٣] ـ بڕوانە: یاداشت سەربردەی دیاری فەرودکە.

ـ بڕوانە: شۆڕشی ئاگری داغ ـ نوسینی ئیحسان نوری پاشا ـ ل٢٢

بەشداریی و پشت گیریان لە دام و دەزگا و حکومەت و پەرلەمانی ئـەتاتورك کـرد لـەژێر ناوی (برایەتی کورد و تورك لە دەوڵەتی تورکیای نوێ).

حسن خەیری سەرۆکی فراکسیونی کورد بون لە ئەنجوومەنی مەزنی تورکیا لە ئەنقـەرە کە ئەتاتورك دروستی کردبـوو، ٧٢ ئەنـدامی کـوردی تێـدابو، ئـەتاتورك وەفـدێکی لـێ ڕێکخستن بەسەرۆکایەتی عـصمت ئینینـۆ، دووکوردیـشی بەگـەردا (برنجـی زادەو زولفـی بەگزادە)، ئەوان لەوێ چوونە لۆزان بەناوی کورد قسـەیان کرد، وتیان: ئێمە و تورك بـراین، دەمانەوێ پێکەوە بژین، نامانەوێ جیاببینەوە مادەکانی ٦٢ـ٦٤ دەبێ هەڵگیرێ، (حـسن خەیری) لە ئەنجومەنی ئەنقەرە بروسـکەی بەناوی هەمو کورد بۆکـۆنگرەی لـۆزان دەکـرد، دەیان ووت: سیڤەر و سوڵتان و ئەستەمبۆڵمان ناوێ، شریف پاشامان ناوی، جیابونەوەمان ناوێ، بەڵکو لۆزان و ئـەتاتورك و ئەنقـەرەو برایـەتی تورکمـان دەوێ[١٦٥]، تـاوای لێهـات وەفدی ئەنقەرە بەشداری پی کراو وەفدی عوسمانی دەرکران لەو کۆنگرەیە، لەلای عیراقیش وەفدی لۆزان کورد بوە، بەریتانیا(بەسەرکردایەتی کیرزۆن) سەرپەرشتی دەکردن بەشداربوان جعفر عـسکری(کوردە) وتوفیق سوێدی، بەوشێوەیە ڕێکەوتنی سیڤەر گۆڕا بەلۆزان کە پیك هاتبە لە ١٤٣مادە ١٢٨جار ناوی تورکیای لێ هاتوە تاکە ناوێکی کوردی تێدا نەهات*

لەومیانەدا زانایانی ئاینی کوردستان لەوانە شیخ عبدالقادر، شیخ سعیدی نەوردسـی، شیخ سعیدی پـیران، شـیخ محمـود، ... زۆر ناقایـل بـون بـەو هـەنگاوە، بـەڵام چـینی عەلمانیەتی کورد داوایان لەوانە کرد ئەو هەنگاوەیان رزگاری کوردەو دەوڵەتێکی عـەلمانی تورکی مافی کورد مسۆگەر دەکا، لەلای ئەو زانایانـە لەسـلێمانی و کوردسـتانی سـەروو بەبەیانی ڕەسمی لە گەرمەی کێشەی ویلایەتی موسل لە سالی ١٩٢٤ دەرچوو، کۆپیـشیان نارد بۆ (عصمە الامم)تیایدا هاتبوو کە کوردو تورك هیچ پەیوەندیەك یـەکیان نابەسـتەوە جگە لەئاین، ئاینیش نەما لەسەردەسـتی ئـەتاتورك ئـیتر کـوا برایـەتی کـورد و تـورك،

---

- بەیتار دەرسیمی لە ل٢٢١ی کتێبەکەی خۆی(دەرسیم لە مێژووی کوردستان) دەلێ حسن خەیری بە خۆی هەمو ئەو قسانەی بۆ کێڕامەوە کە چۆن بروسکەیان بۆ کۆنگرەی مەسەلەتی لۆزان لێداوە

*لە هەندێ سەرچاوەی وەك د.محمد شەزینی لە کتێبی (جوڵانەوەی رزگاری نیشتمانی) محمد شێرزاد لەکتێبی (نضال الاکراد)، سەلام ناوخۆش لە کتێبی (احتلال وتقسیم کوردستان)، د.قاسملو و چەندین کتێبی تر ئاماژەیان بە ماددەکانی (٣٨، ٣٩، ٤٠)ی لۆزان کردووە گوایە مافو ناوی کوردی تیاهاتووە، دوای ئەوەی بەوردی بەراوردمان کرد لەگەڵ دەقی ڕێکەوتننامەی لۆزان بە ئینگلیزیەکەی دەرکەوت ناوی کوردی تیا نەهاتوە. بەڵام لە کتێبی (الحرکة الکردیة في العصر الحدیث- لازاریف وجلیلي -ص١١٧)، ماددەکانی ٣٨، ٣٩ یان وەك خۆی گواستۆتەوە بێ ناوی کورد.

بۆیـەزانایانی ئـاینی ڕەوشـەنبیر داوای سـەربەخۆیی کوردسـتانیان کـرد، کۆمـەڵێك لـە ڕەوشەنبیران و نیشتمان پەروەرانیش لاگیری ئەو ڕایەی زانایانی ئاینی بوو، بەڵام ئەوانەی بەناوی مۆدیرنی و سیکولاری بانگێشەیان دەکردو سور بون لەسـەر ڕای خۆیـان، زانایـانی ئاینیش بواریان پی دان تا گەیشتنە بنبەست، بەڵام چ بنبەستێك؟ دوای ئەوەی ئـەتاتورك زال بوو بەسەر ئەستەمبۆڵ و بەیەکجاری خیلافەتی هەڵوەشـاندەوە و کۆمـاریکی تـورکی عەلمانی لەسەر بنچینەی تورکایەتی دامەزراند لـە ١٩٢٣، لـە دەسـتور (ANA YASA) نکۆلی لە کورد کرا و دەستی بـە داخسـتن و قـەلا چـۆکردنی دام و دەزگـاو فەرهـەنگ و کەلتووری و سیاسی کرد، کە پێشتربەئازادانە لەئەستەمبۆڵ ئیشیان دەکـرد، محمـد زەکـی بەك دەڵێت(هەمو ئەو جەمعیەت وحزبە کوردیانەی کورد دروستی کردبون لە ژێـر سـایەی خیلافەت ئازاد بون، بـەڵام ..لەگـەل تـسـلیم بـونی ئەسـتەمبۆل بـە حکومـەتی کمـالی هەموی داخسـتن)[١٦٧]، بەرنامەیەکی ترسناکیش دارشرا بـۆ قەدەغـەکردنی زمـان و جـل و بەرگی و تەواى فەرهەنگی کوردی... بەوانەش نەوەسـتا هەڵسا بەگرتنی هـەمو ئەوانـەی یارمەتیان دا، دادگایەکی ریك خست بەسـەرۆکایەتی (صـائب پاشـا) بـۆ لەسـێدارەدانی سەرکردە کوردەکان، ئەو دادگایە گەیـشتە هاریکارەکـانی ئـەتاتورکیش، لەوانـە (حـسن خەیری) بە تۆمـەتی ئەوەی جلی کوردی لەبەر بووە لەنێو (ئەنجومـەنی تورکیـا) فـەرمانی سێدارەی دەرچوو، هەرچەندە هاواری کرد وتی بەفەرمانی ئەتاتورك ئێمـە جلـی کوردیـمان لەبەر دەکرد، صائب پاشا وتی ئەو جۆرە جلانەی چ کـورد چ عـەرەبی و چ چـەرکەس و چ فارس چ ئیسلامی هەموی قەدەغەیە، بەهەمان شیوە تیغەکە گەیشتە ملـی (برنجـی زادە و زولفـی بـەگزادە) و هـەتا خالیـد پاشـا کـە پیـشبینی کردبـوو، هـەمو ئەوانـەی بەشداربون لەمەینەتی کورد، هەریەکە وەسیەتی خۆش خۆشیان هەیە لەوەبارەیەوە، برنجـی زادە دەڵێت تەرمەکەم ببەنەوە سەر ڕێی دیار بـەکرو لـەوی بشـارنەوە، لەسـەر کێلەکـەم بنووسن هەرکوردێك بێرەداڕەت بـوو لـەپای ئـەو خیانەتـەی کـردم بابـەردێکم لەگۆرەکـە بدا[١٦٨]، ئەوانی تریش وەسیەتی وایان هەیە کە هەرگیز باوەر بەتورك نەکەن، وەسیەتیشیان کرد کەئێمە زوڵمان کرد لەزانایانی ئاینی کردو بەگوێی ئـەوانمان نـەکرد بـەدوای ئـەتاتورك

---

[١٦٧] ـ خولاسە.. ل٣١٤ لە ل٣١٥ باس لە داخستنی رۆژنامەکوردیەکانیش بە هەمان شێوە دەکا

[١٦٨] ـ زانیاری لای د. جبار قادر زیاترە بەشێکی لە کەنالی (میدیا) باس کرد.

هەڵخەڵەتاین، لەدوای هەمو ئەو ڕوداوانە ئنجا زانایانی ئاینی بەخۆ کەوتن و خۆیان بۆ شۆرش ئامادەکرد، پێشتر بۆ تەبایی و هەڵنەگیرسانی برا کوژی مەیدانیان بۆ چینی عەلمانی کوردی بەجێ هێشت و ئەزمونەکەیان گەیشتە ئەوەی کورد لەنزیکی سەربەخۆییەوە دوور خستەوە بەرەو هەڵدێر.... ئنجا شیخ سعیدی جاری شۆری (١٩٢٥) داو، دروشمی یان گەڕانەوەی خیلافەت یان ئێمەش کوردستانیکی سەربەخۆمان دەوێ، لەو دروشمە دا زۆر ووردەکاری بەهێزی یاسایی و سیاسی و ئاینی لی بەدی دەکری، خەڵکێکی عاقل دایان ڕشتبوو، چونکە گەڕانەوەی خیلافەت مانای تۆماتیکیانە جێ بەجێکردنی سیڤەر بوو، هەروەهاش بەووردی بۆیان دەرکەوت ئەو قۆناغەی واهاتە پێش لەڕۆژهەلاتی ناوەڕاست بریتیە لە گۆڕنانی کورد، هەرچۆنیك بێت لەخراپ ترین دۆخی عوسمانی هەر باشترە لەوەی وادێتە پێش، بۆیە دروشم و داواکاریەکەی بوە مایەی ئەوەی زانایانی ئاینی سەرانسەری جهانی ئیسلامی پالپشتی بکەن، ولاتانی ڕوسیاو بەریتانیاو فرنساش پالپشتی تورکیایان کرد، خەریك بو شێخ سعید سەرکەوی دوای شکستی هێناو بەیەکجاری مەینەتی کوردی بەرجەستە بوو.

بەو شێوەیە دەوڵەتی تورکیا لەبەشی باکووری کوردستان دروست بوو لەسەر بناغەی ڕەگەزی، بەشێکی فراوانی کوردو کوردستانیش بەگەر خۆداوە بی ئەوەی بونێکی سیاسی و فەرهەنگی بۆحساب بکری، خەلەلی هەرە مەزن ئەوەیە کورد لەو ناوچەیە کۆنترین میللەتن بەرەهایی کەچی ڕەگەزی تورك تەمەنیان لەتورکیای ئێستا لە (٧) سەدە تێناپەری [١٦٩]، کەچی ئەو نەتەوەی سەردەستەو کوردیش بن دەستە، لە ڕاپۆرتی ئەنجومەنی نوێنەرانی ئەمریکی ڕۆژی ١٩٩١/٣/٢٠بەناونیشانی (ولاتێك بۆ کوردان)باسی لەو بەراوردەی دانیشمەندی کورد وتورك کردوە بۆ یەکەم جار، ئەو حسابە لەدەوڵەتی عوسمانی نایەتە گۆڕەپان بەلام لەدەوڵەتی تورکیا کەلەسەر بنچینەی ڕەگەزیە دێتە گۆڕی، یەکێ لە خەلەلە کانی سەرهەلدانی دەوڵەتی هاوچەرخ ئەو کێشەیە، زۆربەی ئەوانەی کێشەیان هەیە و بونەتە نەتەوەی بن دەست لەنەتەوەی سەردەست ڕەسەن ترن لەناوچەکە، ئیرلەندیەکان لە ئینگلیزەکان ڕەسەن ترن لەئیرلەندا، گەلی باسك ڕەسەن ترن لە ئیسپان،

[١٦٩] ـ بروانە: نیساعیل بیشکچی-النظام فی اناضول الشرقیة ص ٣٥٢، تیایدا دەلێ تورك لەسالی ١٢٠٨هاتنە ئەو ناوچەیە.

بەر بەر رەسەن ترن لەعەرەب، قیبتی(EGIPTY یانی قیبتـی) ڕەسـن تـرن لـە عـەرەبی میسرو، بەو شێوەیەش تامیل و کشمیر تیبیـت....، بەهـەمان شـێوەش کـورد لـەخاکی خۆیی نەك هەر لەمیللەتانی ناوچەکە، بەڵکو لەهەمو میللەتانی جهان رەسەن تـرە مـادام لانکی دووەمی مرۆڤایەتی لەجوودیە.

# بەشی سێیەم

# لەمەینەتیەکەوە بۆ مەینەتیەکی تر

## باشوری کوردستان و دروست بونی دەوڵەتی عیراق

### مێژووەکی بەخێرایی عیراق:

وا مەزەندە دەکری ئەوناوچەیەی ئێستا پێی دەووتری عیراق لەسەروڕا لەنێوان (دووزێ) ئاوەدان کرابێتەوە، کەواتە بابزانین ئەو وەسفانەی گوایە کۆنترین شارستانی لە عیراق سەری هەڵداوە چەندە ڕاستە؟ کێشەیەکی زۆر ئالۆز هەیە، زۆریش بەزەحمەت خوێنەرت پێ تێدەگەیەنرێ، با بزانین ئەو کێشەیە چیە؟ کێشەکە لەوە سەر هەڵدەدا بەشی زۆری خەڵکی ئاسایی بەپێی واقعی ئێستا حوکم لەسەر مێژوو دەدا لەلایەکە تریشەوە دەسەلاتی عیراق مێژووشی بە چەواشەیی لەسەر بنچینەی واقعی ئێستا نووسیوەتەوە، بەکورتی وسادەیی ئەوەیە ئەو دەوڵەتانەی بەو سنورە ناسروشتیە دروستکراون، هەڵساون لەچوار چیوەی (دارِشنتەوەی مێژوو) هەمو ئەو ڕوداوانەی لەسەر ئەو سنورە دەستکردە ڕویداوە لەتۆمارگای مێژوی سیاسی عێراقی دەنوسن، ئەوەش هەڵەیەکی ئەکادیمیە پێش سیاسیەکەی، لەسەر ئەو بنچینە بێ بنچینەیە شارستانی ئاشوری و کلدانی و سۆمەری و بابلی و هیلینستی و فارسی ئەمەوی و عەباسی... دەکەنە مولکی عیراق، لەوێشەوە بۆ مولکی عەرەبی عێراقی، کەچی ئەو عێراقە سیاسیەی ئێستا مێژوەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٩٢١ و بەس، لە پێشتر نەك ویلایەت تەنانەت جهانی ئیسلامی دابەشکرابو بۆ ٢٠ ئیقلیم، کوردستان وعیراق سەر بەیەك ئیقلیمیش نەبوینە[١٧٠]، حەنا بەتاتۆ دەڵێ:

---

[١٧٠]ـ لە ( الموسوعە العربیە العالمیە مادە: علوم عندالعرب والمسلمین) لەکۆی ئەو وولآتانەی هەبوینە لە کتێبە مێژوویەکانی ئیسلامی کۆی کردۆتەوەو هاتوە:

.. وقسم الأقاليم الإسلامية المعروفة على عهده إلى عشرين إقليمًا هي: ديار العرب" ويضم شبه الجزيرة العربية وبادية الشام. بحر فارس" ويضم الخليج العربي والبحر الأحمر. ديار المغرب" ويضم بلاد الأندلس وأقطار المغرب العربي والصحراء الكبرى. ديار مصر" وتضم مصر وبلاد البجة (شرق السودان). أرض الشام. بحر الروم" ويضم شرقي البحر الأبيض المتوسط وبحر مرمرة وجزره. أرض الجزيرة" ويضم منطقة الجزيرة في العراق وبعضًا من البادية الشمالية. العراق" ويمتد من تكريت إلى عبدان وما بين النهرين. خوزستان. بلاد فارس. بلاد كرمان ويضم القسم الجنوبي الشرقي من إيران وبلاد السند. أرمينيا والران وأذربيجان. إقليم الجبال ويضم بلاد كردستان. الديلم" ويضم البلاد الواقعة على سهول بحر الخزر

بەغدا مەڵبەندی ویلایەتی موسل وبەسرە نەبوە، بۆیە ئاماری ساڵی ۱۹۰۸ی عوسمانی تەنها ویلایەتی بەغدای ژماردوە کەبریتی بوە لە ۱۵۰ کەس[۱۷۱]، کارەساتی گەورەتر ئەوەیە مێژوونووس و سیاسەتمەدارو پرۆگرامی ئەکادیمی باڵاو ناوەندی کوردستانیش کەوتوونە داوی ئەو هەڵە زانستیەوسەردیری وادەبینی: عیراق لەسەردەمی عوسمانی (۳) ویلایەت بووە، کۆنترین نەخشەی عێراق، عێراق لە سەردەمی عەباسی..... هەمو ئەو دەستەواژانە هەڵەن، وەك ئەوە وایە عێراقی سیاسی هەبووبێ ئینجا عوسمانی بۆ (۳) ویلایەتی بەسرە و بەغداو موسڵی دابەشکردبێ، نەخێر لەسەر دەمی عوسمانی ۳۲ ویلایەت هەبووە دوایی بەریتانیا لەساڵی ۱۹۲۱ عیراقی لەو ۳ ویلایەتە دروستکرد، ئەو دوو دەستە واژە زۆر جیاوازن، ڕاستەوخۆش پەیوەندی بە ئاسایشی نەتەوەی کورد هەیە، ئەو ناوچەیەی ئێستای عیراق زیاتر لەژێر دەستی فارس بووە، زۆربەی هەرە زۆری شارەکانی وەك بابل و بەغداو سەلمان پاك و سامرا... لەلایەن ئەوانەوە دروستکراون، زۆربەی شارو ناوچەکانیش لەبنەچەدا ناوی فارسین دوای گۆڕاوون، خودی ناوی عیراق لە (ئەراك) ی فارس هاتووە بەمانای شاری شاهان[۱۷۲]، بابل لە باڤیل هاتووە، بەغدا لە باخی داد هاتووە، یاقوت حموی لە (معجم البادان ج۱ص٤٥٦ ) دەڵێ بەغدا هەرموڵکی عەجەم بوە، سامرا لە (سام – ری) هاتووە موصل لەبنەچەدا ناوی (نو ئەردشیر)، حدیسە (نۆدێ) [۱۷۳] هتد، هەموشی لەلایەن عەجەم دروست کراون وەك ئیبن خەلدوون دەڵێ: عەرەب (مەبەستی عەرەبی ڕەسەن، بەددوی) شارستانیان تێکداوەو عەجەمیش بینای کردووە[۱۷٤]، لە کتێبە کۆنەکان عیراق لەسەر عەرەب پۆلین نەکراوە[۱۷٥]، ئیبن بەتوتە

---

الجنوبية. بحر الخزر" ويضم منطقة بحر الخزر. مفازة خراسان" ويضم منطقة صحراء شرقي إيران. سجستان ويضم جزءًا من أفغانستان. خراسان" ويضم شمال غرب أفغانستان وشمال شرق إيران. ما وراء النهر" ويضم منطقة سهول نهري سيحون وجيحون.

[۱۷۱]- حنا بطاطو – العراق ج۱ص٤٤

[۱۷۲]- ئەلرازی ـ صحاح ب ـ معجم البلدان ـ یاقوت حموی ج ـ لسان العرب.... زۆر سەرچاوەی تر.

[۱۷۳]- بروانە (توژینەوەی ماجستیری) بەندە: الاسلام و العلمانية واثرهما في نشأة الدولة العراقية الحديثة ص ۱۹٥ ـ۲۰۰ هەروەها بروانە: ابن بەتورتە، معجم البلدان،

[۱۷٤]- بێجگە لە ساسانیەکان هەریەکە لە: ئەکەدی (۲۳۳٤-۲۱٥٤ق.م)، ئۆر( ۲۱۱۲-۲۰۰٤ ق.م)، بابلی کۆن( ۲۰۰٤-۱۱٦۲ ق.م)، ئاشوری (۲۰ -٦۱۲ ق.م)، بابلی دواتر (٦۲٦-٥۳۹ ق.م)، ئەخمینی (٥۳۹-۳۳۰ ق.م)، هیلنستی( ۳۳۱-۱۲٦ ق.م)، فەرس(۲۲۷-۱۲٦) ق.م داگیریان کردوە.

[۱۷٥]- کتێبەکانی: ( معجم البلدان) و (قاموس الأعلام)و (سیاحتنامە) و(شرفنامە) کە لەسەدەی (۱٦)دەرچوە: (اشار الى بلاد الفارس، وجاء فيه انها تشمل: عراق العجم، أذربيجان، أرمينيا، عراق العرب) .

له(الكتاب الروض المعطار فى خبرالأقطار ص١٦٣مادة: بلاد العرب) ناوى عيراق لـه بـلاد العرب تيا نەهاتوه، لەنامە وەڵامەكەى ئەرستۆش بۆ ئەسكەندەرى مەقدۆنى ناوچەى بابل بە ئيرانشار وعەجەم دەبا[١٧٦]

ئەو ناوچەيە لەميژوودا كۆمەڵيك ناوى جوگرافى شارستانى هەلگرتووه لەوانـه، بـلاد سومر(بروانە نەخشەى: هيكاتابۆس)، بلادكلد (بروانە نەخشەى هيرۆ دۆتس)، بلاد بابل و بلاد ئاشـوور (بروانـه: نەخـشەكانى ئيرانتينيـتس، هـەروەها نەخـشەى هيكاتاپۆسـى)، ميزۆبۆتاميا بروانە: (نەخشەكانى يۆنانى كۆن و نەخشەكانى تر له كتيبى: تـاريخ العـالم ـ dtv ـ هيرتمان) هـاتوه، بـلاد مـابين النهـرين، وادى الرافـدين، الـسواد، بەشـيكى لاى رۆژئاواش بە (باديةالـشام) نـاوزدە بـووە، لـەخواروو رۆژ ئـاواش بـە (نەجـد) نـاودەبرا، لەخوارەوەش لەو دواييە پى دەوترا (منتفك) و جزيرە، بەشى سەرووش بە ئيقلـيم جبـال و بلاد الكورد و بلاد جزيرە و كوردستان ناوزەد دەكرا، هەموش لەچوار چيوەى زاراوەيـەكى گشتگيرتر بە (هلال الخصيب) ناوزەد دەكرا. هەريەكە لەوانە سنوريك دەگريتـەوە هيـچيان لەگەل ئەو عيراقە سياسيەى ئيستاجووت نابيت، بلاد السومر، بلاد الأكـد، بـلاد الأشـور، بلاد الكلد، ميزوبوتاميا، وادى الرافدين، السواد، المنتفك، باديە الـشام، الجزيـرە، أقلـيم الجبال، كوردستان، الهلال الخصيب، العراق العربى، العراق العجمى، بەو شيوەى خوارەوە:

١ ـ ناوى سۆمەر وئەكەدوئاشورلە هەر سێ نەخـشەى(ئيرانتـويتنس ـ ١٩٦) پ ز.[١٧٧] (هيكاتابوسى ـ ٤٧٥ پ ز)، (هيرودوتس ـ ٤،٥قرن پ ز)[١٧٨]

٢ـ هەريەكە لەوانەش لە نەخشەى (هيرۆدتس) هاتوە لەيەك كاتدا لە شوينى جياجياى عيراقى ئيستا، فۆرستەر دەڵێ: كلد لە دەورو بەرى بەسراو ئەو شوينەى ئيستا شيعەى لێ نيشتەجێن و دواى ناونرا عيراقى عەرەبى[١٧٩]

---

[١٧٦] ـ ئەوە نامەى ئەسكەندەرە:... آنّه شاهد بايرانشهر رجالا ذوي أصالة في الرأي، وجمال في الوجوه، لهم مع ذلك صرامة وشجاعة ئەوەش نامە وەڵامى ئەرستۆيە بۆ ئەسكەندەر كە هەردووكيان لەكتيبى (ابن مسكوية -تجارب الامم ج١ )وەرمانگرتوە:

فهمت كتابك في رجال فارس. فأما قتلهم فهو من الفساد في الأرض ولو قتلتهم لأنبت البلد أمثالهم لأنّ إقليم بابل يولّد أمثال هؤلاء الرجال، من أهل العقول والسداد في الرأي، والاعتدال في التركيب...

[١٧٧] هەمان سەرچاوە "خريطة رقم (٩).

[١٧٨] ـ بروانە: العراق في خوارط القديمة ـ جمع وحققها ـ الدكتور احمد سوسة، مطبوعات المجمع العلمى العراقى ١٩٥٩ـ مطبعة معارف ـ بغداد " خريطة رقم (٦)

[١٧٩] ـ هـ س ـ خارطة رقم ـ ٣.

٣ـ هەر لە نێوانی(٤ ـ ٢)پ ز یۆنانی ورۆمانیەکان ناویان لە سەرووی بەغدا ناوە میزۆپۆتامیاو ئەو ناوە بۆ ئەو ناوچە بەکارهاتوە لە هەمو دونیا، بە خوار بەغداش ووتراوە میزۆپۆتامیای خواروو[١٨٠]

٤ـ بلاد مابین النهرین: زۆربەی وا تیگەیشتون کە ئەوە تەرجەمەی میزۆپۆتامیا، ڕاست نیە، یاقووت حەمەوی لە (معجم البلدان) ڕونی کردۆتەوە و دەڵێ: بلادمابین النهرین تەرجەمەی(میان ڕۆزان)ی فارسیە[١٨١]، هەرچی میزۆپۆتامیایە وا پێدەچی لە ناوی سوڕدراوی (جەزیرەو بۆتان) هاتبێ لەو کاتەی کە سوپاکەی زەینەفۆن بەو ناوچەیە ڕەت بوە.

٥ـ وادی الرافدین نزیکە لە بلاد مابین النهرین بەڵام کەمێك فراوانترە.

٦ـ عیراقی عەرەبی وعیراقی عەجەمی بە پێی: لسان العرب، وقاموس المحیط و سیاحتنامە ونەخشەی ئیبن الحوقل و نەخشەکانی عوسمانی وزۆری تر عیراقی عەرەبی دەورو بەری بەسرای[١٨٢] گرتۆتەوە تا نزیك کوفە، لەوێ تا نزیك هند عیراقی عەجەمی پێ ووتراوە

٧ـ لەو شوێنانەی کەناوی عێراق بەگشتی هاتوە وفراوانترین سنوری پێ دراوە، بریتیە لە سنوری بەغداو بەسرە، لەکاتی دروستکردنی عیراق لەلایەن بەریتانیا و وەزارەتی هندی بەریتانی هەر لەزوەوە تێبینی جیایی ویلایەتەکانی موسل و بەغداو بەسرەی لە(یاسای عوسمانی) کردبوو[١٨٣]، دەلیلی عێراقیشیان هەر بەغداو بەسرەی گرتبۆوە.

٨ـ بەو شێوەش ناوی تری وەك سەواد وبادیەونەجدومونتەفەك وجەزیرەو..زۆر ناوی تری هەڵگرتوە

ئەو ناوانەش بەزنجیرەی مێژووی یەك لەدوای یەك نایەت، هەرودك بەشێك لە مێژوو نووسە عەرەبە ڕەگەزپەرستەکان دەیانەوی وای پیشان بدەن، تا بیسەلمێنن ئەو عیراقە

---

[١٨٠]ـ فورستر... المصدر السابق ج١ ص١٣.

[١٨١]ـ یاقوت حموي ـ معجم بلدان... المصدر السابق ج٢ـ ص٢٧٢

[١٨٢]ـ لەزۆربەی کتێبە کۆنەکان ولە خودی نەخشەی ئیبن حوقل عیراق وبەسرە بە جیا ناویان هاتوە ئەوە(تارخ جرجانی)یە یەکێ لەو نمونانەیە...أبو عمرو أحمد بن عمر بن أحمد المطرز البكرآباذي كان قد كتب الكثير وأنفق مالا عظيما في الحديث وسافر إلى سجستان وبست وهراة ونيسابور وأصبهان والعراق والبصرة وبغداد واليمن كتب عن أبي عبد الله النقوي باليمن بصنعاء وحمل لي عنه إجازة مات يوم الأحد النصف من جمادى الأولى من سنة إحدى وأربعمائة - تاريخ جرجان{ ١٠١ }

[١٨٣] سیاسة البریطانیا العظمی تجاه مستقبل کردستان ص٢٠١

سیاسیەی ئێستا ڕەسەنایەتی میژوویی و جوکرافی و شارستانی هەیە، نەخێر لەهیچ سەردەمیك یەك (وحدە ئیداری یان سیاسی یان جوگرافی یان رەگەزی یان ئاینی.... هتد)نەبووە، تەنها لە سەردەمی ئیداری عەباسی ویلایەتی عیراق هەبوە لەسەڕوی بەسرە تا سامەردو تکریت، بەدەگمەن لە کتێبی (العبر فی خبر من غبر ـ الإمام الذهبي ج١ ص٦٦٨) باس لە دەسەڵاتی (قائم بأمر الله )دەکا بەو شێوەی خوارەوە: وأما دست السلطنة بالعراق فكان لجلال الدَّولة: بغداد وواسط والبطائح وبعض السَّواد وليس له من ذلك أيضًا إلا الخطبة فأما الأموال والأعمال فمنقسمة بين الأعراب والأكراد والأتراك مع ضعف ارتفاع الخراج والوزارة خالية من كبس والوقت هرج ومرج والناس بلا رأس.

لەو باسانەی عیراق بەگشتی بوە بیّ ئەوەی عەجەمی وعەرەبیەکەی لێك بکەنەوە، جار جار کەگوێمان لیّ دەبیّ باس لەوالی عیراق یان اهل العراق یان... دەبیّ ئەوا لەگەڵ کوفەیتی، چونکە لەدوای سەدەی (١٢) ناوی عیراق سەری هەلدا، هەربە مانا فارسیەکەی، سەرەتاعیراق هەمو ناوچەکانی ژێردەسەڵاتی فارسی دەرگرتەوە، بۆیە ئەوکەسایەتیانەی لەقەبی (العراقی) هەڵگرتوە زیاتر کورد و عەجەم بووینە، دوای لە کۆتایی سەدەی ١١ کوفەو بەسرە بونە (العراقان)، بە شێوەیەك بەسرە (العراق العربی) پیّ دەگوترا و (کوفە)ش العراق العجمی[١٨٤]، کەناوی عیراق لەمێژوهات نابیّ ئەو سنورەی ئێستامان بیتە پیش چاو، پیویستە وەك خۆی لەرەوتی میژوویی خۆی لامان بەرجەستەبێت.

سەرهەلدانی ناوی عیراق:

لەلای ئەهلی فیقە کەباسی زانایانی عیراقی کرابیّ مەبەستی (اهل الرأی) یە، اهل العراقیش زیاتر مەبەستی خەڵکی کووفەیە، زۆر جار لەجیاتی والی کوفە وتراوە والی عراق لەبەرامبەر والی شام، کە لەکێشەی نێوان بنەماڵەی ئەبو سوفیان و بنەماڵەی محمد

[١٨٤] ـ بروانە: الصحاحی الرازی، (معجم البلدان)ی یاقوت حموی، لسان العربی فیروز نابادی، هەروەها شەرەفنامەو سیاحەتنامەو..

(د.خ) ئەو دوو ناوو ناوچەیەی گرتەوە، بەشێوەیەك (شام) زیاتر بەلایەنگرانی ئومەوی، (کوفەو ـ عراق)یش بە (اهل البیت)، ڕەنگە ئەو فەرمودانەش کەدروستکراون لەبارەی مەدحی شام و زەمی عیراق لەچوارچیوەی ئەو مل ملانێیە سیاسیە هاتبێ، ئەگینا چۆن فەرمودە حوکم بەچاکەو خراپە لەسەر بنچینەی جوگرافی دەدا، لیرەدا وشەی عیراق لەبەرامبەر شام بەرە بەرە لەو مل ملانی یە سەری هەلّدا، بەپی (هنری فورستر) ناوی عیراق لە سەدەی (٧) سەری هەلدا[١٨٤]، لە گەرمەی کێشەی ویلایەتی موسلیش ناوی عیراقیان بۆ سەدەی (١١) گیرایەوە، بەلاّم مێژونوسە عروبیەکان عیراق دەگێرنەوە بۆ سەدەی ١٢ پ م، گوایە بەناوی (اریقا) ناوزەدکراوە[١٨٦]، بەلاّم کەس ناتوانی نکۆلّی لەوە بکا ناوی عیراقیش وەك ناوەکانی تر پانتاییەکی بچوکی لەخوارووی بەغدا گوزارش کردوە، نەخشەی ابن حوقل جوانتر ئەو ناوچەیەی دیایکردوەکە لەسەروی بەسرە بوە، تانەخشەی ١٨٩٣ی تیداری عوسمانیش هەرلەو ناوچەیە دیاریکراوە، ڕەنگە ناوەکانی تر بە جۆریك لە جۆرەکان مێژودیەکی سیاسی وشارستانیان هەبێ، بەلاّم عیراق نیەتی، تەنانەت لەسەردەمی عوسمانیش لەنێوان٣٢ویلایەت ویلایەتێك نەبوە بەناوی عیراق، زیاتر ئەو ناوچەیە بە میزۆپۆتۆمیا ناوبراوە، ئەو ناوەش یونانیە یەکەم جار پۆلیوس (٢ پ ـ ز) و دوایی سترابۆ (١ی پ ـ ز) بەکاریان هیناوە، تەرجەمەی ئەو ناوەش (بلاد مابین النهرین)ە، بۆ ئەو مەبەستەش پالپشت دەکەینە سەر (تەورات) کە بە (ارام النهرین) ناوی هێناوە[١٨٧]، بەلاّم یاقوت حەمەوی جوانتر روونی کردۆتەوە کە وادی الرافدین و(بلاد مابین النهرین) ...لە میزۆپۆتامیانە هاتوە وەك واباوە، بەلّکو (مابین النهرین) لە تەرجەمەی (میان رۆزان) ی عەجەمی هاتووە، زیاتر وا پی دەچێ میزۆپۆتۆمیا لە (جزیرە) و (بۆتان) هاتبێ، کە لەسەر دەمی سوپایەکەی (زەینفۆن) بەو ناوچە ڕەتبون ڕوبەڕوی کوردان لەو ناوچەیە بون و ناوەکەیان بە (میزرا بۆتۆنیا) و دوای بە (میزا بۆتۆمیا) وەچەرخابێ، لەو بارەیە کتیبێ (اكراد سوريا موعد من تاريخ) لەنوسینی د. ریزوان بادینی لایەنگری ئەو بۆچونەیە، ئەو ناوە یۆنانیەولەلایەن ڕوسیاو ئەوروپا و عوسمانی و هەمو لایەك بەکار

---

[١٨٤] ـ بروانە: سیاحتنامە ـ اولیا چەلەبی، شەرەفنامە ـ شەرەفخانی بدلیسی، معجم البلدان ـ یاقوت حموی، الصحاح ـ الرازی،
ـ نشاة الدولة العراقية ـ ج١ ص ١٣.
[١٨٦] ـ حظارة العراق ج١ص١٤
[١٨٧] ـ كتاب المقدس ـ العهدالقديم سفر التكوين ، اصحاح٢٤ـ ١٠

دەهات، تەنانەت خەڵکی ناوچەکەش ناوی (عراق) یان نەبیستبو، لەکێشەی ویلایەتی موسل لیژنەکەی (عصبة الامم) لەخەڵکی خواروی موسلی پرسی بوو ئێوە عیراقین یان عوسمانی، لەوەڵامدا وتیان هەرگیز ناوی عیراقمان نەبیستوە[188]، بۆ گەران بەدوای ناوێك کە ئەو ناوچانەی عەرەبی سەر سنوری کوردستان چ ناوێکی هەڵگرتووە، تەنها لەکۆنەوە ناوێك هەبو بەناوی بلاد ئاشوور وەك لە راپۆرتی لیژنەی (عصبە الامم)بۆ ویلایەتی موسل هاتوە، ئەگینا لەسامرا هەتا سەر سنوری کوردستان هیچ ناوێکی نیشتمانی هەڵنەگرتووە، بەڵام میژوو نوسە عروبیەکان دیسان فێلێکی زانستی زۆر گەورەیان کردوە، هەلساون لەتەرجەمەی مێژویی بەڵگە نامەکانی سەبارەت بەو ناوچەیە هەرچی (میزۆپۆتۆمیا) یە بە (عیراق) یان وەرگێراوە، با سەرنج بدەینە وەرگێراوی ماددەی (١)ی سایکس ـ بیکۆ* لە دەقە ئینگلیزیەکەی و عەرەبیەکەی چەندە جیاوازە بۆ خوێنەروو هەتا بۆ خەڵکێکی پسپۆریش دەشێویٚ وچەواشە دەبیٚ:

١. That France and Great Britain are prepared to recognize and protect an independent Arab State or a Confederation of Arab States under the ،in the areas (A) and (B) marked on the annexed map and in area (B) ،suzerainty of an Arab chief. That in area (A) France shall have priority of right of enterprise and local loans. ،Great Britain shall alone and in area (B) Great Britain،That in area (A) France supply advisers or foreign functionaries at the request of the Arab State or Confederation of Arab States.

المادة الأولى: إن فرنسا وبريطانيا العظمى مستعدتان أن تعترفا وتحميا دولة عربية برئاسة رئيس عربي في المنطقتين "آ" (داخلية سوريا) و"ب" (داخلية العراق) المبينة في الخريطة الملحقة بهذا الاتفاق. يكون لفرنسا في منطقة (آ) ولإنكلترا في منطقة (ب) حق الأولوية في المشروعات والقروض الحلية، وتنفرد فرنسا في منطقة (آ) وإنكلترا في منطقة (ب) بتقديم المستشارين والموظفين الأجانب بناء على طلب الحكومة العربية أو حلف الحكومات العربية.

بیٚ هیچ بناغەیەك ناوی عیراقیان هێناوەتە ناوی، عیراقیان رەسەن کردووە، بە شێوەیەکی تر ویستراوە عیراق رەسەن بکرێت، با نمونەی تر وەرگرین، بابروانینە تویژینەوەی (العراق و الحرکە الکمالیە–ل٢٨) تیایدا هاتوە: عیراق(٣ نوێنەری لە

---

[188] ـ بروانه: تقرير لجنة عصبة الأمم الخاصة بحل النزاع التركي البريطاني حولة ولاية الموصل ص٢١٩

* دەقی رێکەوتنامەی سایکس پیکۆ لەل١٤٤ی ئەو کتێبە.

(مەبعوسـان ـ پەرلـەمان کـە لـە ١٨٧٧/٣/١٩ دامـەزراوە) هـەبوە، لـە مەبعوسـانی دووەمیش (٦) نوێنەری هەبوە، هەلبەتە ئەوە هەڵەیە، وادێنێتە پیش چاو کـە عیراقێکـی وەك ئێستا هەبوبێ، کەچی ئەو توێژەرە لەسـەر بنـچینەی واقیعـی ئێـستای عـیراق ئـەو حوکمەی داوەتە سەر میژو، کـە ئـەو کـاتی نـەبووە، واتـە هەلـساوە هەرسـێ ویلایـەتی نوێنەرەکانی(بەسردو بەغداو موسلی ـ کە عیراقی ئێـستای لـێ پیـك هـاتووە) کردوویـە بەمولکی عیراق، لەڕاستیدا نوێنەری عیراق و سوریاو ئوردەن... هەرنـەبوە، چـونکە ئـەو ولاتانە بونیان نەبوە، ئینجا سەرەرای ئەوەش نوێنەر لە عوسمـانی بـەپێی مـادەی (٧١)ی دەستوری عوسمانی (مەشروتیە) هەر مەبعوسێك (پەرلـەمان تاریـك) نوێنەرایـەتی تـەنها ویلایەتەکەی نەدەکرد، بەڵکو نوێنەری هەمو میللەتی عوسمانی بوو.

ڕاپۆرتەکانی بەریتانیا سەبارەت بەناوچەی عیراقی ئێـستا بـەناوی میزۆپۆتۆمیـا بـوە، بەشی هـەرە زۆری کراوەتـە (عـیراق)، بۆنمونـە بروانـە راپۆرتـەکانی بـەریتانی کەبـەناوی (review of the civil admunstraion of mesopotam) دانەری کتیبی (احـوال العـراق فـی المرحلـة المشروطیة الثانیـة) هـەمو میزۆپۆتۆمیاکـانی بەعیراق تەرجەمە کردووە، هەمو راپۆرتەکان و کۆنگرەکـان بـەناوی میزۆپۆتامیـا بـووە، کەچی لە تەرجەمەدا وشەی میزۆپۆتامیایان کردوە بـە عـیراق، هـەر لـەو ڕاپۆرتانـە بـەو عنوانە ئینگلیزیەی کردوویە بەکتێب، بەلام (جعفر خیاط) تەرجەمـەی عـەرەبی کـردووە بەو عنوانە: (فصول من تاریخ العـراق القریـب)، هـەروەها ناوبراولـە پـەراوێزی ل٢٥٣ی کتێبی (رسائل مس بیل) دان بەوە دەنێ، کە عیراقی لە جێی میزۆپۆتامیا داناوە، بەوەش نەوەستاون لەسەر نەخشەش میزۆپۆتۆمیاکانی وەرگێراوە بۆ عیراق، بۆنمونە ئەونەخشـەیەی کەبابلیەکان پێش ٤٠٠٠ سال لەمەوبەر (واتە ٢٣٠٠پ ز) دایان ناوە، تیایدا شوینی بابلی و ئاشوریان دیاریکردووە، د.احمد سوسە هەلساوە کردوویە بەعینوانی (اقدم خارطـة للعـالم توضع فی العـراق)، هەروەها کتێبی (العراق فی التاریخ ص٩١)دەڵێت: حمورابی دەیویسـت عـراق یـەکبخا !!، بەهـەمان شـیوەش دەسـتکاری میزۆپۆتۆمیـا کـراوە لەرێکـەوتن و دیکۆمینتەکان، دیسان بەنموونە لەرێکەوتنامەی سـیڤەر هـیچ نـاوێکی عیراقـی لەبەشـە

ئینگلیزەکەی نیە (کەچی سێ جار ناوی کوردستانی تیـا هـاتووە)، لەبـەر نـەبونی نـاوی عیراق ئەو کاتی لەمادەی (٩٤) بـەناوی (میزۆپۆتۆمیـا العربیـە) هـاتوە، لەتەرجەمـەدا کردوویانە بەعیراق، هـەر بەهـەمان شـێوەش لەبـەر نـەبونی نـاوی عـیراق و ئـەو ولاتـە دەستکردانە لەرێکەوتنامەی سایکس بیکۆ ١٩١٦ پیتی B، A ڕەنگەکانیان بۆ دابەشـی ناوچەکە بەکار هینا، هەتا دروست بـونی دەوڵـەتی عیراقـیش لـە سـالی ١٩٢١ هێـشتا بەتەواوی ئەو ناوەی نەبووە، زۆر بەوردی لێ کۆلینەوەمان کـرد نەگەیـشتینە ئـەنجامێکی بەرجەستە تابزانین ئەو پیشنیارە لەکام لا هات و ناوی ئەو دەوڵەتەی (کەبەریتانیا بریـاری دروستکردنی دا) بووە عیراق و نەبووە میزۆپۆتۆمیا، دوای ئاماژەیەکی ڕووغان دۆزیەوە لە ڕاپۆرتی (ویلایەتی موسل) دەڵێ: بەریتانیا نـاوی عیراقـی بـۆ ئـەو ناوچـە نوێیـە دانـا، ئینگلیز زۆر بەمەبەست بوو ناوی ناوچەکە عربی بێت، هەر خـۆی ڕۆژنامەیـەکی بـەناوی (العراق) و یەکێکیش بەناوی (العرب)[189] دامەزراند لەگـەڵ داگیرکردنـی بەغـداو تیایـدا هانی بلاوکردنەوەی بیری عروبی دەدا[190]

ناوی عیراق لە ڕێکەوتنامەکانیش نەدەهات تا کۆنگرەی لۆزانی ١٩٢٣ بۆ یەکەم جار دوو جار ناوی عیراق لە مادەی (٣) هاتوە، لە راپۆرتی (کێـشەی ویلایـەتی موسـل)یـش دەڵـێ خـەڵکی ناوچـەی موسـل نـاوی عیراقیـان نەبیـستبوو، بـەریتانیا نـاوی عیراقـی هەڵبژارد[191]، بەهەرحال ئێمەش لەونووسینە هەمو جار ناتوانین لەهەر نـاوێکی مێـژوویی عیراق ڕوونکردنەوەکی لەپال بنووسین، ناچار بەهەڵە وەك باوە ناوی عـیراق دەنووسـین بـێ گوێدانە زنجیرەی میژوویی خۆی.

---

[189] ـ ئەورۆژنامەیە یەکەم ژمارەی لە١٩١٧/٧/٤ دەرچوو دروشمەکەی خاکی عەرەب بۆعەرەبە، نابێ شتێکەو سیاسـەتیش شتێکی ترە

[190] ـ لەکتێبی: العراق في دوري الإحتلال والإنتداب عـبدالرزاق الحسـنی ج١ ص ٦٧ وا هاتوە: جاء في جريدة (العرب) عـدد (١٤) مـصادف ١٦/ /١٩١٨: ((الحکومة البريطانية ترمی دائماً الی تنشيط الروح الوطنية-القومية- والإستقلال في حدود نفوذها)).

[191] ـ بروانە: تقرير ولايە موصل ص٦٦(ئەوە راپۆرتە ئەسلیەکەیە).

## دەوڵەتی عێراقی لە پلانی نیو دەوڵەتی:

مەبەست لەنێودەوڵەتی لەوسەردەمی هیزە جهانیەکانی وەك رووسیاو بەریتانیا و فرنساو ئەمریکاو ئەڵمانیاو ئیتالیاو ئیاپانیاو پرتغال و... ئەو ولاتانەی لەدەوری عوسمانی دەسورانەوە بۆدابەشکردنی، ئەو تەقەلایانە لەوەوە هات، کەچۆن جهانی ئیسلامی پر لەسامان دابەش بکەن و یەکێتیەکەی نێوانیان (کەبەهۆی ئاین وەستاوە) نەهێلن، لە ئەوروپا ئەوکێشەیە بەناوی (مسألە الشرقیە)ناوزەد دەکرا، پلانی رێك وپێك و توێژراو لەسەدەی (١٨) رادەستی پێکردووە، کەلەناوچوونی خیلافەتی ئیسلامی بەدروستکردنی دەوڵەتی نەتەوەیی کۆتایی بێت، ئیتر هەرچی کراوە لەشەرو شۆر چالاکی تری دبلۆماسی و پەیوەندی و.. لەپێناو ئەوە بووە، کەواتە ئێستا ئەو پرسیارانە روونتر وەڵامی دەبێ: ئاخۆ ئەو وڵاتە عەرەبیانەی وەك سوریا و عیراق و کویت و سعودیە و قەتەر و ئوردەن و... بەخواست و ئەرك و ماندوو بونی عەرەب دروست بوونە؟ یاخود لەچوارچێوەی پلانی ئیمپریالیزم و زایۆنی و بۆ دابەشکردن و زال بون؟ ئایا ئەو هەنگاوەی دروستکردنی عێراق و ئەوانی تریش پاداشە یان سزایە؟ وەڵامی مێژوونووس و سیاسەتمەدارانی عروبی ئەوەیە کەئەو عێراقە بەهۆی خەباتی نیشتمانی و شۆرش دروستبووە، کەچی لێرە بەولاوە پێچەوانەییەکەمان بۆ دەردەکەوێ.

هەر لەو کاتەی عوسمانی کەوتە قۆناغی(دەوڵەتە نەخۆشەکە) بەرتانیا لە هەموان زیاتر هەوڵی دەدا ئەو نێچیرە گەوردیە بەتەنها بۆ ئەو بێت، ئەوە کارکەرێکی گەورە بو بۆ شکستی میری سۆران بەرامبەر نەخشەی کوردستانێك لە ناودڕاستی ئیرانەوە تا سەر دەریای سپی* وبەغداو تاخۆزستانیش، ئەوەبوو بەریتانیا ئەو هاوپەیمانیەی نێوان محمد علی پاشا ومیری سۆرانی (بۆ دابەشی عوسمانی)لە ١٨٣٣ی کۆتاهیەوکۆنگرەی ١٨٤٠ی لەندەن تێك داو نەیهێشت عوسمانی شکست بهێنێ، لەو کاتیەوە بە ووردی کاری بۆ ئەو نەخشەیەی خۆی زیاتر چڕ کردوە، (لورانس ـ دۆستی عەرەب)لەکتیبی(اعمدە الحکمە السبع٧pillars of wisdom ـ) دەلی بەریتانیا لەسەدەی (١٨) وە خەریکە عوسمانی

* لە ل٢٩ی (رحلة طه الکردی البالیسانی فی العراق وبلاد الشام والأناضول ومصر وحجاز) باس لەحەلەب دەکا دەلێ: دانیشتوانی هەموی کورد بوون

دابەش بکاو دەوڵەتی نەتەوەیی ـ وەك عیراق دروست بکاو بۆ ئـەوەی جێـی ئیـسرائیلیش ببێتـەوە، ئیـشێکی زۆریـشیان بەهەمەچەشـن لـەپێناو کـردووە، لـە ١٣/ ٦/ ١٨٥٣ (ولنسۆن) دۆسیەیەکی ووردی بۆ بەریتانیا ناردو تیایدا هاتبوو کەئێـستا وەختـی دابـەش کردنی عوسمانی هاتوە و دەکری بەریتانیا هیرشی بۆ بکاو داگیری بکا لـەدەریای سـپیەوە تازابی خواروو[192]، لەسالی ١٩٠٥ لـە لەنـدەن نوێنـەرانی (بـەریتانیا، فرنـسا، بلجیکـا، هۆلندا، پرتغال، ئیتالیا، ئیـسپانیا، ) کۆبونـەوە بڕیاریـان دا جهـانی ئیـسلامی (بەشـی ئـەفریقی و ئاسـیایی) لێـك جـودا بکەنـەوە بـەهۆی دروسـتکردنی دەوڵـەتی ئیـسرائیل نەفەلەستین[193]، لەسالی ١٩٠٧ ڕوسیاو بەریتانیا ڕێك کەوتن کە کوردسـتان و ویلایەتـە تورکیەکان و سەرووی وڵاتی فارس بدریتە ڕوسیا، شـامیش بەویلایـەتی موسلیـشەوە بـۆ فرنسا، لەوسەریشەوە تابەغدا بەجزیرەی عەرەبەوە بۆ بەریتانیا، چەند ڕێکەوتیکی تـریش بـەدوای داهـات لـە ١٩١٥/٣/١٨ لـەنێوان فەرەنـساو بـەریتانیاو روسـیا، ڕێکـەوتنی قوستەنتینیە، ١٩١٥ لەندەن، ١٩١٥ سـازانۆف ـ بالبـاخ لـە ١٩١٦/٤/٢٦ تاگەیـشتە سـایکس بیکۆ ١٩١٦، یەکەم گۆنگرەی رەسمیش لەپیناو ئەوە و هاندانی گەلانی ناوچـەکە لە پاریس لە (٤ ـ ٩)/ ٢ / ١٩٠٢ گرێدرا، بەشدار بوان بریتی بـون لـەمعارزەکانی نێـو عوسمانی وەك: ئتحاد الترقی لەتورك، کورد، ئەرمەن، عەرەب، بۆ سـەربەخۆیی بونیـان، دوای لەسالی ١٩١٣ جارێکی تر عـەرەب بەتـەنها لـەپاریس کۆکرانـەوە بـۆ هانـدانیانی سەربەخۆیی، یەکەم ڕێکەوتنی فەرمی لیژنـەی (بنـسن) ی سـالی ١٩١٥ بـوو[194]، بـەڵام لەهەموان ترسناك تر ڕێکەوتنی (سایکس بیکۆ ـ سـازانوف) ی ١٩١٦ بـوو، لەولایـەش لەدوای هەلگیرسانی جەنگی جهانی یەکەم لە ١٩١٤ دوای ماوەیەکی کورت لـە دوودڵـی (ئەنوەر پاشای) دەسەڵاتدار لەعوسمانی لە ٥/ ١١/ ١٩١٤ بڕیاری چوونە نیـو جـەنگی دا لەپاڵ ئەلمانیا، بەریتانیا هێزی ئامادەی هەبوو لە کەنداو بۆ ماوەیەکی کورت هێرش کردو فاوو ناوچەی بەسرەی گرت و سەرەتای جێبەجێ کردنی نەخشەکان لێرەوە دەسـت پێـدەکاو عیراق لێ هاتە دی.

[192] ـ بروانه: التغلغل النفوذ البريطاني في العراق.. ص ٦٢
[193] ـ بروانه: عبدالرزاق الحسني ـ تاريخ الوزاد العراق ج ٢ ص ٢٤٩
[194] ـ بروانة: سياسة البريطانية...سعدبشير اسكندر

مەبەستە شاردراوەکانی سایکس بیکۆ دروست کردنی ئەو دەوڵەتانە(عیراق بە نمونە):

بەریتانیا رابەری ئیستعمارو خاوەنی هەڵگری وەسفی هندی (ئەگەر دووماسی لەدەریا بەشەر هاتن دەستی ئینگلیزی لەگەڵە)، لەئەوروپا بێت (سالانەی جەنگەکەیان ٣٥ ملیۆن جونیەی تێبچێت) و خوێنێکی زۆر برێژی (تەنها لەعیراق ١ کوژراوی هەبوو)[١٩٥]، بێت کۆمەڵە دەوڵەتیك دروست بکا ناوی بنی عیراق و ئوردەن و ....، خۆی مەسروفی وەزارەتەکان و سوپاو حکومەت دابین بکا.... و بگەڕێتەوە شوێنی خۆی..، حەتمەن ئەو هەنگاوە دەیان مەبەستی شاردراوەی لەپشتە، بەتایبەتی، ئەگەر مەرج و پیشنیارەکانی رۆژئاوا بۆدروست کردنی تورکیا لەجیاتی عوسمانی بخوینینەوە لەمادەی (١١) ی (١٤) بنەماکانی ویلسون[١٩٦] و لۆزانی ١٩٢٣

بیرۆکەی دروست کردنی ئەو دەوڵەتۆکانە لەجیاتی (خیلافەت) کۆنە، بە پێی کتێبی لۆرانس(7 p of w) دو تەقەلایانە بۆ سەدەی ١٨ دەگەڕێتەوە[١٩٧]، بەڵام نوێکردنەوەکەی دەگەڕێتەوە بۆ(کیشنەر) ی بەریتانی و یەکەم تەقەلایەکانی لەگەڵ شریف حسین لە ١٤/ ٢/ ١٩١٤، لەپێشتر لەکۆتایی سەدەی (١٩) بەقازانجی رۆژ ئاوابوو هەندێ میرنیشینی بۆ شێخەکانی عەرەبی کەنداوی وەك مەسقەت و عەمان و قەتەر و بەحرەین و عەدەن دروستکران، بەکورتی نەخشەی ستراتیژی رۆژ ئاوا ئەوەبوو چەند دەوڵەتۆکەیەکی عەلمانی نەتەوەگەری بۆجیهانی ئیسلامی دروست بکا، هەرکەمێك بیرکردنەوە لەوەی ئیستعمارێکی وەك بەریتانیا بێت ئەو هەمو کارە مەزنەت بۆ بکات هەمو کەس دەزانی سەد مەبەستی لە پشتە، کەواتە دەتوانین پوختەی ئامانجی ئیمپریالیزم وئاژانسەکانی زایۆن لە سایکس بیکۆ[١٩٨] دروست کردنی ئەو دەوڵەتە عەلمانیانەی(وەك عیراق) لە و خالانەی خوارەوە کۆبکەینەوە:

---

[١٩٥] ـ کۆتلۆف- ثورة عشرین ص١٧٧

[١٩٦] ـ دەقی ١٤ بنەماکانی ویلسۆنلە ل٢٦١

[١٩٧] ـ بروانە: اعمده الحکمه السبعه –لورانس هەروەها: الاسلام والعلمانیه.. ص١٤٢

[١٩٨] ـ دەقی رێکەوتنامەی سایکس پیکۆو:

المادة الأولى: إن فرنسا وبريطانيا العظمى مستعدتان أن تعترفا وتحميا دولة عربية برئاسة رئيس عربي في المنطقتين "آ" (داخلية سوريا) و"ب" (داخلية العراق) المبينة في الخريطة الملحقة بهذا الاتفاق. يكون لفرنسا في منطقة (آ) ولإنكلترا في منطقة (ب) حق الأولوية في المشروعات والقروض المحلية، وتنفرد فرنسا في منطقة (آ) وإنكلترا في منطقة (ب) بتقديم المستشارين والموظفين الأجانب بناء على طلب الحكومة العربية أو حلف الحكومات العربية.

المادة الثانية: يباح لفرنسا في المنطقة الزرقاء (سوريا الساحلية) ولإنكلترا في المنطقة الحمراء (منطقة البصرة) إنشاء ما ترغبان به من شكل الحكم مباشرة أو بالواسطة أو من المراقبة، بعد الاتفاق مع الحكومة أو حلف الحكومات العربية.

١- بۆ ئەوەی جیهانی ئیسلامی دابەش بیت و کۆتایی بەخیلافەتی ئیسلامی و زەمینە دووبارە بوودنەوەی نەمێنێت، ئیتر بەسانایی داگیرو دابەش دەکرێن و کێشەکانیشیان لە کێشەی ئیسلامی دادەبڕێ.

٢- بۆ ئەوەی عەرەب لە ئیسلام جیا بکرێتەوە، کێشەی فەلەستینی داهاتووش نەبێتە کێشەی هەمو ئیسلام، بۆ ئەم مەبەستەش زاراوەی وەك الامه العربیه یان (الأمتي العربية والإسلامية) بەکار هات بۆ زیاتر بەرجەستەکردنی ئەو لێك جیاکردنەوەیە، لە لێك جیاکردنەوەی عەرەب وئیسلام ئۆتۆماتیکی دەبێتە هۆی پارچەپارچەکردنی عەرەبیش[199]

المادة الثالثة: تنشأ إدارة دولية في المنطقة السمراء (فلسطين)، يعين شكلها بعد استشارة روسيا وبالاتفاق مع بقية الحلفاء وممثلي شريف مكة.

المادة الرابعة: تنال إنكلترا ما يلي: ١- ميناءي حيفا وعكا. ٢- يضمن مقدار محدود من مياه دجلة والفرات في المنطقة (آ) للمنطقة (ب)، وتتعهد حكومة جلالة الملك من جهتها بألا تتخلى في أي مفاوضات ما مع دولة أخرى للتنازل عن جزيرة قبرص إلا بعد موافقة الحكومة الفرنسية مقدما.

المادة الخامسة: تكون اسكندرونة ميناء حرا لتجارة الإمبراطورية البريطانية، ولا تنشأ معاملات مختلفة في رسوم الميناء، ولا تفرض تسهيلات خاصة للملاحة والبضائع البريطانية. وتباح حرية النقل للبضائع الإنكليزية عن طريق اسكندرونة وسكة الحديد في المنطقة الزرقاء، سواء كانت واردة إلى المنطقة الحمراء أو إلى المنطقتين (آ) و(ب) أو صادرة منهما. ولا تنشأ معاملات مختلفة مباشرة أو غير مباشرة على أي من سكك الحديد أو في أي ميناء من موانئ المناطق المذكورة تمس البضائع والبواخر البريطانية. تكون حيفا ميناء حراً لتجارة فرنسا ومستعمراتها والبلاد الواقعة تحت حمايتها، ولا يقع اختلاف في المعاملات ولا يرفض إعطاء تسهيلات للملاحة والبضائع الفرنسية، ويكون نقل البضائع حراً بطريق حيفا وعلى سكة الحديد الإنكليزية في المنطقة السمراء (فلسطين)، سواء كانت البضائع صادرة من المنطقة الزرقاء أو الحمراء، أو من المنطقتين (آ) و(ب) أو واردة إليها. ولا يجري أدنى اختلاف في المعاملة بطريق مباشر أو غير مباشر يمس البضائع أو البواخر الفرنسية في أي سكة من سكك الحديد ولا في ميناء من الموانئ المذكورة.

المادة السادسة: لا تمد سكة حديد بغداد في المنطقة (آ) إلى ما بعد الموصل جنوباً، ولا إلى المنطقة (ب) إلى ما بعد سامراء شمالاً، إلى أن يتم إنشاء خط حديدي يصل بغداد بحلب ماراً بوادي الفرات، ويكون ذلك بمساعدة الحكومتين.

المادة السابعة: يحق لبريطانيا العظمى أن تنشئ وتدير وتكون المالكة الوحيد لخط حديدي يصل حيفا بالمنطقة (ب)، ويكون لها ما عدا ذلك حق دائم بنقل الجنود في أي وقت كان على طول هذا الخط. ويجب أن يكون معلوماً لدى الحكومتين أن هذا الخط يجب أن يسهل اتصال حيفا ببغداد، وأنه إذا حالت دون إنشاء خط الاتصال في المنطقة السمراء مصاعب فنية أو نفقات وافرة لإدارته تجعل إنشاءه متعذراً، فإن الحكومة الفرنسية تسمح بمروره في طريق بربورة- أم قيس- ملقا- إيدار- غسطا- مغاير إلى أن يصل إلى المنطقة (ب).

المادة الثامنة: تبقى تعريفة الجمارك التركية نافذة عشرين سنة في جميع جهات المنطقتين الزرقاء والحمراء في المنطقتين (آ) و(ب)، فلا تضاف أية علاوة على الرسوم، ولا تبدل قاعدة التثمين في الرسوم بقاعدة أخذ العين، إلا أن يكون باتفاق بين الحكومتين. ولا تنشأ جمارك داخلية بين أي منطقة وأخرى في المناطق المذكورة أعلاه، وما يفرض من رسوم جمركية على البضائع المرسلة يدفع في الميناء ويعطى لإدارة المنطقة المرسلة إليها البضائع.

المادة التاسعة: من المتفق عليه أن الحكومة الفرنسية لا تجري مفاوضة في أي وقت للتنازل عن حقوقها، ولا تعطي ما لها من الحقوق في المنطقة الزرقاء لدولة أخرى سوى للدولة أو لحلف الدول العربية، بدون أن توافق على ذلك مقدما حكومة جلالة الملك التي تتعهد بمثل ذلك للحكومة الفرنسية في المنطقة الحمراء.

المادة العاشرة: تتفق الحكومتان الإنكليزية والفرنسية، بصفتهما حاميتين للدولة العربية، على أن لا تمتلكا ولا تسمحا لدولة ثالثة أن تمتلك أقطاراً في شبه جزيرة العرب، أو تنشئ قاعدة بحرية على ساحل البحر المتوسط الشرقي، على أن هذا لا يمنع تصحيحاً في حدود عدن قد يصبح ضرورياً بسبب عداء الترك الأخير.

المادة الحادية عشرة: تستمر المفاوضات مع العرب باسم الحكومتين بالطرق السابقة نفسها لتعيين حدود الدولة أو حلف الدول العربية.

المادة الثانية عشرة: من المتفق عليه ما عدا ذكره أن تنظر الحكومتان في الوسائل اللازمة لمراقبة جلب السلاح إلى البلاد العربية.

[199] - بروانە: مەرجەکانی سەربەخۆیی لبنان کەلە (ميثاق لبنان) هاتوە: بعد إتفاق بين (بشار الخوري المسيحي) و(رياض الصلح المسلم) في عام ١٩٣٤ وسمي ب(ميثاق لبنان) وجاء فيها:أن يكف المسلمون عن المطالبة بالوحدة مع سوريا أو آية وحدة عربية، وان هذا شرط

٣- بۆ ئەوەی تواناکان و تۆخمی گەشەسەندن لەجیهانی ئیسلامی پەك بخری و هەرچاویان لەبازاری ئەوان بێ، بۆ ڕوونکردنەوە سەرنج بدەنە (لورانس) لەگفتۆگۆیەك لە (تایمس) لە ٢٣/٧/ ١٩٢٠ دەڵێت: من دلنیام دروست کردنی ئەو دەوڵەتۆکانە بۆ عەرەب دلسۆزی و ئەمەکمان بۆ مسۆگەر دەبێ و نرخی سەنتیکیشی لامان نیە) ([20])... ئەگەر سەرنج بدەین سەرەنجامەکەی ڕاست دەرچوو، ئێستاش بەشی هەرە زۆری وڵاتانی عەرەبی بە ئەمەکن بۆ ڕۆژ ئاواو لای ئەوانیش نرخیکی وایان نیە: زیاتر لەوەش سنوری ئەو وڵاتانە بووینە پەرژینیك بۆ پاراستنی سنوری ئیسرائیل[201]

ئامانجێکی تری ئەوە بوو کە جیهانی ئیسلامی هەر لەنائارامی بهێنێتەوە، بەجۆرێك ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستیان دابەشکردوە ئەو کۆمەڵە دەوڵەتۆکانەیان بی دروستکرد، کە لەسەر هیچ بنچینەیەکی (سیاسی، ئیداری، جوگرافی، نەتەوەیی، تایفی، میژوویی...) نەبووە، بەڵکو تاکە ستاندەرو پێوە ئەوەبوو چۆن لە بەرژەوەندی ڕۆژ ئاواو ئاسایشی نەتەوەیی ئیسرائیلی چاوەراونکراو دروست کرابوو، بۆیە لەهەر وڵاتێك لەو وڵاتە دەست کرادنە کۆمەڵێك کێشەیان تێدا چاندووە، لەشیوەی بۆمب وەك لە (بروتوکولات حکماءالصهیون ژمارە: ١٠ هاتووە)، بەشێوەیەك کە بەشێکی تورکمان خراوەتە سەر عەرەب، عەرەبیش خراوەتە سەر تورکیا، فارس لەسەر عەرەب و پیچەوانەش، کوردستان کراوەتە (٥) بەش بەسەریان دابەشکراوە...

٤- ئیمپریالیزم بەگشتی ئەزمونێکی زۆر دەوڵەمەندی هەبوو لەبارەی بەرگری و بزوتنەوەکانی دژیان، بۆیان دەرکەوتبوو ئەوان دەتوانن بۆ هەر پرۆژەو پلانێکیان بەسانایی بەسەر دەوڵەت زالبن، بەلام ئەوەی کێشەی بۆ دەنانەوە بزوتنەوەی میللی بو، بۆیە ئەو دەوڵەتانە دروست کران کە رزگاریان بێت

---

للإستقلال. المصدر:سعدالدين ابراهيم –ملل والنحل والأعراق ص٤٩٤. عندما اعتلى فيصل عرش العراق عام (١٩٢١)م قيد بالشروط نفسها فورستر... نشأة العراق ص١٥٦

[200] ـ كوتلوف-ثورة العشرين ص٢١١

[201] ـ له (الموسوعة السياسية عبدالوهاب كيالى - طبعة الثانية بيروت ١٩٩٣، ج ٢ ص٤٤٣) واهاتوه:(( ان شرق الأردن لم يكن كياناً وفقا لمشروع التقسيم، إلا أن ( تشرتشل ) عقد صفقة مع الأمير ( عبدالله بن الحسين) بواسطة لورنس، ليشمل المشروع إقامة إمارة له في شرق الاردن، مع إعانة مالية سنوية من بريطانيا مقابل تعهد ( عبدالله إبن شريف مكة ) بقبول السياسة البريطانية في فلسطين )) ، له هەموان زوق تر لە هیرشە بە ناوبانکەکەی ئیسرائیل بۆ سەر غەزە دژ بە حماس وولاتانی ئوردن ومیسر و سعودیەو ریکخراوی فتح بە ئاشکرا یارمەتی ئیسرائیلیان داو تا ئەو ساتەش ئابلوقەیان خستۆتە سەر غەزە.

لەبەرگری میللی، لە ڕاستیدا ئەو تێڕوانینەیان زۆر ڕاست دەرچو، ئەگەر سەرنج بدەینە هەردوو جەنگی ئیسرائیل لەگەڵ عەرەب لەسالی ١٩٦٧ و١٩٧٢ لەگەڵ ولاتانی عەرەب، تەنها بە (٦) ڕۆژ ئیسرائیل سەرکەوت، بەلام هێرشەکەی ئیسرائیل بۆ سەر حزب الله لە تەموزی (٢٠٠٦) وهێرشەکەی بۆسەر غەزە لە ٢٠٠٩هەریەکە زیاتر لەمانگی خایاندو بەتکنەلۆجیای زۆر بالاتریش بەشکستی گەرایەوە.

٥- هەمو ئەو نامانجانەش ولاتێکت بۆدروست دەکەن، دەسەلاتداری دکتاتۆری بێ، دوور لە دیموکراسی هەلدێنی، ئەگەر بەووردیش سەرەنج بدەین دکتاتۆرەکانی ولاتی عەرەب هەمیشەیی دۆستی ڕۆژ ئاواو ئیسرائیلن، لە جیهانیش تەنها ئەوان ماونەوە بە دیکتاتۆریەت.

٦- لەکۆتایشدا سەرهەلدانی ئەو جۆرە دەولەتانە لەسەر بنچینەی عەلمانی ڕەگەزی تۆماتیکیەن دەبێتە هۆی پەراوێزکردن و خانەنشین کردنی ناوەرۆکی ئاینی ئیسلام.

٧- دیسان لەکۆتاییدا سەرهەلدانی ئەو دەولەتە دەستکردو نامۆیانە دەبیتە هۆی ئاسایی بونی سەرهەلدانی دەولەتێکی ئیسرائیلی نامۆ لەناوچەکە.

## کی قازانجی کردو کێ زەرەر؟

ڕۆژ ئاوا لەسەر ئەو نەخشەو مەبەستانەی سەرو ڕۆیشت، تاگەیشتە جێبەجێ کردن و سەرەنجام کوردستان کرا (٥) پارچە ودابەشکرا بەسەر ولاتانی دەورو بەر، عەرەبیش کرا ٢٢ پارچە، تورکیاش لەو ئیمراتۆریەتە مەزنیەوە بووە ولاتێکی بچوکی وەك ئێستاکە تا ساتی ئەو نووسینەش هەر بەدوای مەرجەکانی ئەوروپیەوە تیایدا وەرناگیرێت، دەولەتی عیراق و سوریا و کوێت... زادەی ئەو زەمینە و پلانەن، ئەو دەولەتانە ودەولەتی ئیسرائیلیش لەهەمان کارگە دروستکراون، بەلام ئیسرائیل پیشکەوتوە و بۆ ناوەخۆی داد گەری دیموکراسی هەیە، هەرچی ولاتانی عەرەبی و داگیرکەرانی کوردستانن هەر لەشەڕو شۆڕو دیکتاتۆری و پاش کەوتویدان، بەواقیعی بەرجەستەی مەبەستەکانی سایکس

بیکۆیان کردوه، کەواتە میللەتانی عـەرەب و کـوردو تـورك... هـەموی زەرەری کـردووە (جگە لە دەسەڵاتدارانی خۆپەرست)، بەڵام ئەوەی زۆر زیان بەخش بوە سێ لای ترە:

١- کورد هەم دابەشکرا هەم بێ بەشکرا لەمافی چارەنوسی بەدەوڵەت بون.

٢- ئـاینی ئیـسلام، خیلافـەتی هەلوەشـایەوە وخانەنـشین کـرا، دەسـتورو دام و دەزگای عەلمانی و زەمینەیـەکی وا لەڕۆژهـەلاتی ناوەڕاسـت سـازکرا کـەبوار بەزیندوو بونەوەی نەدرێ.

٣- گەلی فەلەستینش هـەم دابەشـکران و هـەم بـی بـەش کـران مـافی چـارەی خۆنوسی و بەدەوڵەت بون، فەلەستینش کرا چوار بەش، بەشـیك کەوتـە ژیـر دەستی تائێستاش بە عەرەب ١٩٤٨ نـاودەبرین، بەشـی غـەزە درا میـسر، بەشی زیفەش[٢٠٢] درا ئوردەن وقودسیش ئەو کات خـرا سـەر پارێزگـاری نێـو دەوڵەتی.

## ئەوەی زۆر قازانجی کرد

بریتین لە: دەسەڵاتداری هەلپەرست، سیـستەمی عـەلمانی، یەهودیـەکان وئیمپریـالیزم بەگشتی، ئەو زانیاری و پۆلین کردنە یارمەتیمان دەدات بۆ دەست نیشان کردنی:

١- ستراتیژیەتی بزوتنەوەی کوردایەتی.

٢- دۆست و ناحەزی.

٣- بنچینەو بنەماکانی دیالۆکی کوردی و عـەرەبی و تـورکی... هـەمو لەگـەل هەمو

٤- تێ گەیاندنی عەرەب بەگشتی کە دروست بون و بەردەوامی دەوڵەتی عیراقـی (بەنمونە) نە بۆ عەرەب نە بـۆ کـورد قـازانجی نیـە، بـەڵکو بـەردەوامبونیان بەرجەستەو جێبەجێ کردنی مەبەستەکانی سایکس بیکۆیـە... بۆیـە عـیراق هەم بەلایە بۆ کورد ئاواش بۆ عەرەب، هەر بۆیەش هەر بەنائارامی بینـراوەو

---

- بۆ یەکەم جار لەسالی ١٩٥٠ئەردەن ناوی لەو ناوچەیە نا (الضفة الغربیة)لەدوای ئەوەی لەگەل ئیسرائیل ڕێك کەوتن.

هـەرواش دەبینـرێ، یەکێکـە لـە کۆمەڵـە دەوڵەتـەکانی (فاشـیل ـ لـەڕوی یاسیەوە)

ئێستا بیرۆکەکمان پەیدا کرد لەسەر پلانی دروست کردنی نەخشەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و ئەو دەوڵەتۆکانەی لێی دروست کران، بابزانین لە میانیاندا عیراق چۆن دروست بو؟ کێ دروستیکرد؟ و ئامانجی چیە و سەرەنجامەکانی چی بو.

## دروست بونی دەوڵەتی عیراقی:

لەدوای ئەوەی بڕیاری دروستکردنی ئەو دەوڵەتانە درا لـەڕۆژ ئـاواو بەنەخـشەو پلانـی بەریتانیاو فرنسا و ئاژانسەکانی یە هودی و... زۆر لای تـریش بەشـدارن، بەداخـەوە ئـەو زانیاریانە شاردرایتەوە کەمتر بەلایەن میژونوس و تەیاری عروبی باس کراوە، ئێستا ئێمە هەلی دەدەینەوە بەپرسیارێکی سادە ئاخۆ کێ دروستکەری عیراقە، ئـەوەتا ئەسـکەندەری مەقدۆنی دروستکەری یۆنان بوە، شارلمان و فرانسۆی یەکەم دروسـتکەری فرنـسا بـووە، ج واشنتن دروستکەری ئەمریکایە، محمد علـی جـەناح دروسـتکەری پاکـستانە، ئـەتاتورك دروستکەری تورکیایە، ئاخۆ کی دروسـت کـەری عیراقـە؟کوا جـەژنی نیـشتمانی؟.. باهـەنگاوەکانی دروسـت بـونی دەوڵـەتی عیراقـی بـاس بکـەین، هـەمو نهێنیـە سـەر سورهینەرەکان دەردەکەون، هەمو ئەوانەش بریتین لەبڕیارەکانی نێو دەوڵـەتی و کـۆنگرەی قـاهیرە و هـەنگاودکانی دیـاریکردنی سـنوری عـیراق وهێنـانی مـەلیك دروسـتکردنی حکومەت و سوپاو پەرلەمان و دەستور.. لـەدوای ئەوهەنگاوانـەش لەلایـەن بـەریتانیاوە سپێردرا بە عەلمانی و ناشیونالیزمی عەرەبی لایـەنگیریان، بـۆ زال بـون بەسـەر هـەردوو شۆڕشی ئاینی لەکوردستانی (١٩١٩) و خوارووش لـە (١٩٢٠)، ئـەوەش هـەنگاوەکانی دروست کردنی عیراق ودەوڵەتی عیراقیە:

١ـ لەرووی چالاکی دەرەکی بڕیاری نیو دەوڵەتی: یەکەم بڕیاری یاسایی بۆدروستکردنی دەوڵەتی عیراق لەمادەی (١)ی ڕێکەوتنامەی سایکس پیکۆ هاتوە بۆ هەردوو ویلایەتی بەغداو بەسرە، کوردستان و ویلایەتی موسلی نەدەگرتەوە. دوای لەڕێکەوتنامەی (سانریمۆی١٩٢٠) لوید جۆرجی بەریتانیا توانی کلیمنسـۆری فرنـسی ئیقناع بکاو ویلایەتی موسلیشی لێ ودرگریتەوە، بیخاتە سەر پڕۆژەکەی خۆی بۆدروستکردنی دەوڵەتی عیراقی،

له وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیا بە فەرمی دۆسیەیەك كرایەوە بەناوی (دۆسیەی دروستكردنی دەوڵەتی عیراقی)، دوای لە ڕێكەوتننامەی سیڤەر كە بەسەر عوسمانی دا سەپینرا بەپێی مادەی (٩٤)عیراقی* لێ سەنداریەوە (تا ئەوساتیش ناوی عیراق نەبو بەناوی میزۆپۆتامیای عەرەبی ناوی هاتوە) [٢٠٣]، هەروەها بەپێی مادەی (٢٢) ی بەشی یەكەمی (عصبة الامم) بریاری دروست كردنی دەوڵەتی عیراقی درا، لەلایەن بەریتانیاوە تایبەت بۆ دروست كردنی دەوڵەتی عیراقی كۆنگرەیەكیان سازدا لە قاهیرە لە ١٢ ـ ١٩٢١/٣/٢٤ بە ئامادەبونی چەرچل خۆی و مەندوبەكانی لە عیراق(كەدوای بووە عیراق) و ٤٠ شارەزاشیان هێنا، لە عیراقیش تەنها دووكەس هێنران، یەكیان جعفر عسكری كورد بو تەنها بۆ ڕاوێژو پرسیار لەكاتی پێویست، ئەگینا بواریان پێنەدەدا بەشداری كۆنگرەكە بكا، كەسی دوەم بریتی بوو لە (ساسۆن عەسقیلی ـ یەهودی) ئەو ڕۆڵێكی زیاتری هەبوو لە دانیشتنەكان، بەو شێوەیە بەریتانیا و فرنسا و ئاژانسی زایۆنی و زۆر لای تری ڕۆژ ئاوایی بەشەڕو دبلۆماسیەت و بنچینەیەكی یاسایی نیو دەوڵەتیان بۆ دروستكردنی دەوڵەتی عیراق ئامادەكرد، ئەودەوڵەتە بە خواستی خەڵكی عیراق دروست نەكراوە وەك د.علی وەردی دەڵێ یەكێ لەو عیراقیانە هاتنە لای بەریتانیەكان و پێیان وتن: ئێمە سەدان سالە لێرە دەژین ئاگامان لە (ئیستقلال) نەبوە هەتا ئێوە خستتانە مێشكی ئێمە، ئەگینا هەرچی داگیری كردبین و دایكی ئێمەی لابیوبێ ئەو باوكمان بوە [٢٠٤]، هەر لە سەر ئەو بنچینەیە كاتی ویلسۆن (لەگەل حزبی عهد)، بە ڕاپرسیەك هەڵسا ئاخۆ عیراقیەكان كێیان دەوێت سەرەنجامەكەی ئەوانە بون وەك د. علی وردی نەقلیكردوە: ١ـ ملك انكلیزی برسی كوكس بێت ٢ـ ملكەكی عرب ٣ـ ملكەكی فارسی لە خانەوادەی قاجاری ٤ـ لكاندنی عیراق بە ئیران ٥ـ هەرئەمیر ودەسەڵاتێكی ناعەرەبی ٦ـ دەسەڵاتی بەریتانی ڕاستەوخۆ٧ـ ئەمیرێكی عوسمانی٨ـ ملكی ٩ـ كۆماری... [٢٠٥]

---

هێشتا كوردستان جیا بوو لە عیراق، لە كاتێكا عیراق و ئیسرائیل بەیەك بەند(١٣٢) لە عوسمانی جیا بوونەوە كوردستان بەمادەی(٦٢-٦٤) لە عوسمانی جیا كرایەوە.

[٢٠٣] ـ دەقی ڕێكەوتننامەی سیڤەر لە كتێبی (دەقەكانی سیڤەر و خوێندنەوەیەكی ترـ دەق: پ ی سەلام ناوخۆش، خوێندنەوە: مسعود عبدالخالق)

[٢٠٤] وردی – لمحات.. ج٧ ص٣٠٨

[٢٠٤] ـ د.علی الوردی -لمحات ج٥ص٩١

٢ـ سنوری عیراق: ئەگەر سنور لەسەربنچینەی جیاکاری جوگرافی یان مێژویی یان کۆمەلایەتی ونەتەوەیی یان ئاینی..نەبوو ئەوا پێی دەلین(سنوری دەستکرد)، باسەرنج بدەینە دروست بونی سنووری عیراق بە ڕوونی دەرەکەوێ دەستکردە، بەریتانیا هەر خەریك بووسنووری بۆ(ئەو عێراقەپێشنیارکراوە) فراوان دەکرد، لە کاتی داگیرکردنی فاو لە ١٩١٤دەقی ڕێنمایی سەرۆك وەزیرانی بەریتانیا بۆ سەرکردە مەیدانیەکانیان (جنرال دیلامین جنرال مۆد، برسی کۆکس، ویلسون، ...) ئەوەبو کە دەولەتیك بۆ عەرەب لەو ناوچەیە دروست بکەن هەر لە فاوەو تا ئەو خالەی لەشکری بەریتانی پێ دەگا [٢٠٦]، کەواتە سنوری دیار نەبوو ئەوەستا سەر سەرکەوتنەکانی بەریتانیا، هەروەك لەیەکەم تێڕوانینی بەریتانی ژ (٧٧٠١ ـ B) بۆ هەمو ناوچەکەکە لە١٩١٧/٣/٢٩ لەلایەن وەزیری هندی لە حکومەتی بەریتانی بۆ سکرتیرو نوێنەرە بەریتانیەکان لە عیراق تیایدا هاتبوو:

١ـ ئەوشوینانەی داگیرکراوە(لەفاوەوە) لەلایەن بەریتانیەوە بەڕێوە دەچێت نەك هند.

٢ـ بەسرەش لە ژیر حوکمی بەریتانیا دەبیت.

٣ ـ لە بەغدا مەملەکەتێکی عەرەبی دروست دەکرێت و لە ژێر پاریزگاری بەریتانی خۆیان فەرمانڕەوا دەبن.

٤ ـ ئەو حکومەتە عەرەبیەك لەسەروی دەبیت ولە ژێرەوە لە دەست بەریتانیا بێت وئەو پرۆژانە بگرێتە خۆی:

أـ بەسرە وەك خۆی دەمێنێتەوە تا عەرەبی بە تەواوی جێی عوسمانی دەگرێتەوە.

ب ـ ئەو کارانە هەردوو ئەنجومەنی جێبەجێ کردن ویاسا دانان، سیستەمی باج وهندیەکانیش بە شێوەیەکی زۆر لەو مەملەکەتە بەکار نەیەت.

٥ـ ئەگەر بەسرە نەکەوتە سەر بەغدا ئەوا ئیدارەی بەسراش بەند دەبێت بەو حاکمە بەریتانیەی لە بەغدا دەبیت.

٦ـ کوێت وولاتە عەرەبیەکانی تری کەنداو تا عەمان سەر بە بەسرا دەبن [٢٠٧]

٧ـ ناوچە پیرۆزەکانی شیعەش سەربەخۆ دەبن.

٨ـ هەرچی یەمەن وحەزرە مەوتە دەکەوێتە سەر وەزارەتی دەردودی بەریتانی.

---

[٢٠٦] ـ الإسلام والعلمانية ..ص٢٣٨

[٢٠٧] ـ ئەو بەلگەنامەیە یەکێ لە پاساوە یاسایی ومێژوویەکانی حکومەتەکانی عیراقە بۆ داواکردنەوەی کوێت.

٩ـ ناوچەکانی خواروی ئێران وعەرەبستان وفارس دەکەویتە سەر هند[٢٠٨]

کەواتە تێڕوانینێکی ڕون نەبوە ئاخۆ سنوری چۆنە، چەند وڵات لەو شوێنەی ئێستا عیراق دروست دەکرێ، چونکە تیروانینێی تریش هەبو کە عیراقی شمالی (بەغدا)و عیراقی جنوبی یەکێك لەوانە: لە١٩/١١/١٩١٨م (لورانس) پیشنیاری کرد، کە ناوچەکە بکرێتە ٣ هەرێم (میزۆپۆتامیای سەروو(بەغدا) ومیزۆپۆتامیای خواروو(بەسرە) وسوریا بۆ هەر سێ کوڕی شریف بن حسین (عبدالله وزید وفیصل)، وزارەتی هند لە ٧/١١/١٩١٨م لایەنگیری ئەو دابەشیەی کرد، بەڵام ویلسۆن وکۆکس بروسکەیەکی بە پەلەیان لە ٢٢/١١/١٩١٩م نارد تیایدا ئەو عیراقەی ئێستایان بە کوردستانەوە وەك (چاك ترین چارەسەر)پێشنیار کرد و چەسپا[٢٠٩]

لەسەرەتای جەنگ بەنیاز بون ئەو دەوڵەتەی عیراق تەنها لەویلایەتی بەسرە بەسەرکرادایەتی (تالب پاشا) دابمەزرێنن بیخەنە سەر هند، دوای سەرکەوتنەکان بیرۆکەکە فراوان بوو بۆ هەردوو ویلایەتی بەسرەو بەغدا هەروەك لەسایکس بیکۆ دیایکرا، دوای زیاتر سەرکەوتن بیرۆکەکە ئەو سنورەی ئێستای گرتەوە، دوای ئەو سنورەی سەپاند بەرێکەوتن لەگەل وڵاتانی دراوسی کە ئەوانیش تازە بەو شێوەیە دروست ببون، ئەگینا هیچ سنورێکی عیراق لە هیچ لایەك نەبوە، بە پێی مادەی (١٢)ی لائیحەی ئینتداب بەریتانیا خۆی کارەکانی دەرەوەی بۆ عیراق ڕادەپەڕاند، بەو شیوەی خوارەوە:

أ ـ سنوری لەگەل سوریا کەخۆشی سنوری نەبوو، بەپێی مادەی (٢٧) ی سیڤەر لیژنەیەکی فرنسی بەریتانی ئیتالی و تورکی هاوبەش دروست بوو لە ٥/٥/١٩٢٠کۆبونەوە لەگوندی (عەشار) و سنوریان دارشت [(٢١٠)]

ب ـ سنوری لەگەلی ئوردەن: لەبەرئەوەی ئوردەنیش تازە دروستکرابو. هەردوولاش بۆکوڕانی (شریف ـ حسین بن علی) دیایکرابون بەبی کێشە ئەوسنورە دیایکرا

[٢٠٨] ـ بروانە:أ- موسوعە العراق السیاس ص٩٢ ب- تأریخ الإسلامی -محمود شاکر ص٣٨-٣٩ ج- د.فیاض هس ص١٨٩ ج- کورد وکوردستان في وثائق البریطانیة ص٨٦-٩١.

[٢٠٩] ـ لە( تاریخ امة العربیە ص٤١٠-٤١٦) هاتوە:فرنساو بریتانیاش ویستیان شام بۆ (٧) پارچە دابەش بکەن:١.جبال لبنان٢.دولة العلویین ٣.دولة انطاکیة في شمال سوریة.٤. دولة جبل دروز.٥. دولة سوریة.٦. فلسطین.٧. امارة شرقي الأردن. دوای هاتنە سەر ئەو ئەخشەیەی نیستا کەچاکترین خزمەت بە پلانەکە بکات

[٢١٠] ـ بروانە: الاسلام و العلمانیە.. ص ٢٣٣ ـ ٢٣٤، هەروەها: لمحات.. ـ د. علی الوردی ـ ج ٥ ص ١٤١

ج ـ لەگەڵ سعودیە: هەندی کێشە هەبو بۆ دیاریکردنی ئەو سنورە، لە کۆتاییدا لە ٥/٥/١٩٢٢ کۆکس بە تۆبزی بەو سنورەی ئێستای بە لایەنی سعودیەی مۆر کرد، ئەگینا بەپێی بۆ چونی سعودیە تافرات سنوری ئەو بوە.

د ـ سنوری لەگەڵ کویت: مس بیل لەکتیبی (العراق فی الرسائل مس بیل — ص ٣٧٣) دەڵێ: من ئەو سنورەم دیاریکردوە بێ کێشە

ع ـ سنوری لەگەل نیران: جۆرێك لەسنوری مێژویی وعەسکەری نێوان عوسمانی و سەفەوی هەبوو لەدوای شەری چالدیرانی ١٥١٤، دوایی چەند هەموارکردنیك کە لە رێکەتنەکانی زەهاوی ١٧/ مایسی/١٦٣٩، دوایی لە١٨٣١ و دوایی لە رێکەوتنی ئەرزەرۆم١٨٤٧، ئنجا پرۆتۆکۆلی ئوستانە لە٤/١١/١٩١٣ لەهەمو ئەو رێکەوتنانە عوسمانی بەشێك لەخاکی بۆفارس بەجی دەهیشت، بووە سنورێکی ئامادەکراویش بۆعیراق، هەرچەندە جاریکی تریش لە١٩٣٧و دوای لە ١٩٧٥دەستکاریکراوە.

ل ـ سنور لەگەل تورکیا: کێشەیەکی دوور و درێژ بوو، چونکە دەوڵەتی تورکیا وەك وڵاتانی عەرەبی دروست نەبوو، جۆریك لەسەربەخۆی و بەهیزی زاتی خۆی هەبوو لەلایەن ئەتاتورکەوە، بۆیە ئەو داوای تەواوی ویلایەتی موسلی دەکردەوە، لە ئەنجاما ئەو کێشەیە چووە (عصبة الأمم) بەپێی پەرەگرافی (٢) ی مادەی (٣) ی لۆزانی ١٩٢٣، (عصبة الأمم) یش لەکۆبۆنەوەی ژ: ٣٠ لەبەرواری ٢٠/ ٩/ ١٩٢٤ کردو لە ٣١/١١/١٩٢٤ لیژنەیەکی نیو دەوڵەتی پێك هینا بۆچارەسەری ئەو کێشەیە کەبریتی بون لە: کونت مول ـ مەجەری، ئۆ پاولیس ـ بلجیلی، مستر ئین فرسن ـ سویدی)، لەگەل هەندێ شارەزای تر هاتنە ویلایەتی موسل، دوای لەسەر ئەو سنورەی ئێستا رێکەوتن و ناویشیان نا (سنوری بروکسل) چونکە لەو شارە دانیشتنەکەکرا.

هـ ـ سنور لەگەل کوردستان: بەداخەوە تائێستا (نەم دیوە) کەسنوری عیراق دیاری دەکرێ ئاو (سنور لەگەل کوردستانیش) دیاری بکرێ، هەتا ئەکادیمیای کوردیش وەك ئەوانی تر بابەتی کوردستان بەگەر ناخەن، بەهۆی (٢) پاساوی هەلە ئەویش ئەوەیە:

١ـ گوایە کوردستان دەوڵەت نەبووە، وەڵامەکەش ئەوەیە وڵاتانی دەورو بەریشی وەك سوریاو ئوردەن و کویت... دەوڵەت نەبون. بۆ دووەمیش لەرەوتی ئەو نوسینەمان خۆی

وەلآمیەتی.بۆیە پیویستە لەبابەتی دیاریکردنی سنوری عیراق پرۆسەی دیاریکردنی سنوری لەگەل کوردستانی بەگەر بەدەین

سنوری خوارووی کوردستانی ئێستا بریتیە لەوسنورەی کە لەنەخشە کۆنەکان و گەریدەکان و هەروەها بەپێی نەخشەی دیمۆگرافی بە روونی هاتوە، هەروەك لە نەخشەی ویلایەتەکانی ئاسیای عوسمانی سالی ١٨٩٣ سەردەمی عبدالحمید دیایکراوە، هەروەها بە پێی بەندی یەکەمی ڕێکەوتنامەی ئەرزەرۆم[٢١١] باسی سنوری کوردستان تانزیك بەغدا دەکا، لە ئەنسیکلۆبیدیای عوسمانی مادەی کوردستان لە (قاموس الاعلامی ـ شمس الدین سامی) سنوری کوردستان بە ووردی دیایکراوە چەندە گەورەیە، هەروەها لە (مادەی ویلایەتی موسل) دەڵێ: خەلکەکەی زۆری عەرەبن بەلآم هەرێمەکە پارچەیەکە لەکوردستان[٢١٢]، جوگرافی ناسی گەورەی ئیسلامی ئیبن حۆقل لەسەدەی ١٠ لە موسل بوە دەڵێت: موسل ئاوو هەوایەکی خۆش وبازارەکی گەرمی هەیەو زۆربەشیان کوردن.

بێجگە لەفەرهەنگی ولآتانی تر خودی فەرهەنگی ئیداری وسیاسی عوسمانی کۆن ونوێ، دانیان بەکوردستان نابور، سنوریشیان دیایکردبو، لەکۆنەوە لەلایەن ئۆلیا چەلەبی لە سیاحەتنامە هاتبو، لەنوێش لە هەردوو نەخشەی سیاسی ١٨٩٣ و ١٨٩٦ سنوری کوردستان زۆر بەگەورەیی هاتبوو، بۆیە ناوی کوردستان لە سیڤەر گوزارشی لە باکگراوندی بەهیزی سەردەمی عوسمانی دەکرد.

لەبروسکەی چەرچل بۆ مەلیك فەیسەل لە بارەی سنوری خوارووی کوردستان دەڵێ: ئێمە بەلێنی پێکهێنانی دەولەتۆکەکی عەرەبیمان پێدایت نەك ئیمپراتۆریەت بۆیە سنوری تۆ خواروی (جبل حمرین)ە لەوی بەسەرەوە کوردستانە، لە بەلگەنامەیەکی تری بەریتانیا (fo ٣٧١/١٦٣٦٧) تیلگرام ژ:٦١٦ هەمان ڕاستی دوبارە دەکاتەوە، هەر لە (قاموس الأعلام ـ ئەنسیکلۆبیدیای عوسمانی) باس لە کەرکوکیش دەکا دەڵێ: شارێکی کوردستانیە و٣/٤ی کوردن، ئەوەی تریشی تورك و عەرەبن، ٧٦٠ ئیسرائیلی و٤٦٠کلدانی لێیە.

---

[٢١١] ـ ئەو ڕێکەوتنە لە نیوان عوسمانی وفارس لە١٨٢٣/٧/٢٨ کراو پێك هاتبوو لە ٧بەند، لەبەشی یەکەم باس لە کوردستان دەکات و دەڵێ سنوری دەگاتە نزیك بەغدا.

[٢١٢] ـ بڕوانە: ل٣٠٧ی (کوردو کوردستان لە یەکەم ئەنسیکلۆپیدیای عوسمانی).

کردوه، سەرکردە سەربازیەکانی بەریتانی دیسان بەروونی سنوری خوارووی کوردستانیان دیایکردەوە و دەڵێن لەسەرووی بەغداو خوارووی شاخی حەمرین بەو لاوە سنوری کوردستانە [(٢١٣)]، بەهەمان شیوەش ئەو سنورە لەمادەی (٦٣) ی سیڤەر دیایکرا نەمادەی (١٦) ی لائیحەی ئینتداب و پەرەگرافی (٤) ی کۆنگرەی قاهیرە دووبارە کرایەوە، لەگەل زۆر بەڵگەنامەی تری میژوویی و جوگرافی و واقعی...کەلەدوای جارێکی تریش باسی (سنوری خوارووی کوردستان)بە شێوەیەکی تر دەکەین.

ئەی سنوری سەرووی عیراقی عەرەبی لە کێ بوە؟ وەلامەکەی زۆر رونە، هەرگیزاو هەرگیز سنوری عیراقی عەرەبی لەنەخشەکۆن ونوێکانی تا پێش دروستکردنی عیراق نەگەیشتۆتە بەغداش[٢١٤]، تاکە یەك جارلە مێژودا ویلایەتی عیراق هەبوە لە سەردەمی ئیدارەی عەباسی (بێ ئەوەی دیاری بکرێ عیراقی عەرەبی یان عەجەمە) سنورەکەی تا سامرا هاتوە، بۆیە لە راپۆرتی ویلایەتی موسل هاتبو، کە لە نێوان موسل تا سامرا کەس ناوی عیراقی نەبیستبو، بەلام بەریتانیا بەهۆی سوپاو فرۆکە و دەبابە گوێی بەوسنورە نەداو بەشێکی کوردستانی خستە سەر دەوڵەتی عیراق بێ رێکەوتن لەگەل دەسەلاتی کوردی، ئەوەش بنچینەیەکی یاسای و سیاسیە بۆ داوای مافی خۆ کردن، بەم شێوەیە سنوری عیراق دیایکرابێ ئەوەی عیراقیەك یان عەرەبێك بەشداری ئەو دیاریکردنە بکەن، بەڵکو هەموی بەریتانیا خۆی سەرپەرشتی کۆبونەوەو دیایکردنی سنورەکانی کردووە.

لەدوای ئەوە هەندێ لە شۆڤینی عەرەب بەدوای بەڵگەیەکی مێژویی گەراوە بیسەلمێنێ رۆژێك لەرۆژان کوردستانی خوارو بەجۆرێك لەگەلێ بەغدا یان لەگەل عەرەب سەین وبەینێکیان هەبوبێ، نەبوە، یەك بەڵگەی لاواز دۆزراوەتەوە کە تاکە پاساویتیان، ئەویش ئەوەیە گوایە لەرێکەوتنی شریف ـ ماکماهۆنی سالی١٩١٥ وارێکەوتون، کە دەسەلاتی شریف تا ماردین ودیاربەکر بچێت هەروەك لە کتێبی (دور ملك فیصل..ص١٤) هاتوە: (ان ولاية موصل الى ماردين وكوردستان جنوبية ضمن اتفاق ماكماهون ـ شريف)، دواى

---

[٢١٣] ـ الاسلام والعلمانيه.. ص ٢٣٦

[٢١٤] ـ سەرنج بدە ئەو نەخشانە: ئیبن حۆقل ، ئیستاخاری، ئەلبیرۆنی، مسعودی، بەلخی، ..تا دەگاتە دوا نەخشەی عوسمانی ١٨٩٢

ووردبونەوە دەرکەوت ئەوە لە ڕێکەوتنەکە نەهاتوە، بەڵکوئـەوە پێـشنیاری هـەردووحزبی (العهد والفتاة)ی عەرەبی بوو کەلەدیمەشق ڕێکیان خستبوو بەناوی (میثاق دمشق) ناوزەد دەکرێ، بەریتانیاش پێی قایل نەبوو، ڕاستی ڕێکەوتنامەکـەی شـریف ـ ماکمـاهۆن لـە هەردوو کتێبی: (الملل والنحل والأعراق ص٢٢٦)و (فورستر ـ نشأه الدوله العراقیه ص٧٢ ) هاتوە، کە ئەوەی بەڵێن بـە شـریف دراوە دەقـاودەق ئـەوەی سـایکس پیکۆیـە، واتـە: تاکەمێك سەرووی بەغداو کوردستانی نەدەگرتەوە

٤ـ حکومـەت: شـان بـە شـانی دروسـتکردنی حکومـەتو هێنـانی مـەلیك ولەگـەل داگیرکردنی بەسرەو بەغدا بەریتانیا هەلدەستا ئەنجومەنێکی ئیـداری لێ دروسـت دەکـرد، لەڕاستیدا دروستکردنی حکومەت دەگەڕێتـەوە بـۆ دوای شکـستی شـۆرش بیـست، ئـەو کاتەی برسی کۆکس لە ١١/١٠/١٩٢٠ گەرایەوە بەغـداو بڕیـاری دا حکومـەت دروسـت بکا، بە هوتاف و شیعر خویندنـەوە پیـشوازی لێکـرا لەلایـەن عـەلمانی و ناشـیونالیزمە لیبرالیەکانی عەرەب، دەیانوت: (عد للعراق وأصلح ما فسد*...الخ.)، لـە (رسـائل لمـس بیل) وەسفی سـەر سەرهێنەر دەدۆزیەوە، لە ٢٠٨ ئەو رستە بخوێنەوە: هەندێ لە عەشایرو ماستاوچیەکانی عەرەب وتویانە: أنت بمقامە النبی عیسی وکوکس بمقام الله[٢١٦]، لەسـەرەتا ئەنجومەنێکی فەرمانڕەوای با لاّیان پێك هێنا لەبەریتانیاکان بریتی بون لـە: (سـیر یونـام کارتـەر، کۆلونیـل هـاول، میجـر بۆلانـە، مـستر فیلبـی، مـسی بیـل) [(٢١٧)]، لەدوایـدا (عبدالرحمن نقیب) لـە ٢٥/١٠/١٩٢٠ ئـەرکی سـەرۆکایەتی حکومـەتی پـێ سـپێردرا، بەنامەیەك لەلایەن برسی کۆکسەوە[٢١٨] تیایدا ناوی وەزیرەکانیشی دیـاریکردبوو، (نقیـب) یش لەوەڵامدا وتی من خزمەتکاریکی پـاکی بـەریتانیام، یەکـەم کۆبونـەوەی حکومـەت لەمالی عبدالرحمن نقیب لە ٢ /١١ /١٩٢٠ بەئامادەبونی کۆکس کرا، کەپیك هاتبوو لـە (٨) وەزیرو (١٢) ش بێ وەزارەت، وەزارەتـی دەرەوەی نـەبوو تـا کـۆکس بەنوسـراوێکی

* مەبەست لە (مافسد) کوایە نەوەی شۆرش بیست تیکی داوە تۆ چاییکەوە، بروانة: أ-تأریخ الوزارات... ج١ص١٦، ب-عبد الرحمن بزاز- العراق من الإحتلال الی إنتداب ص٩٦، ج-الحرکة الوطنیة... ص٤٦

[٢١٦] العراق فی رسائل مس بیل... ص٢٩٣ (لە سەرچاوەی عربیش ئەو ڕاستیانە دەبینرێ لە کتێبی (مقتل لجمان..) هاتوة: أن مس بیل لقبت في العراق ب(أم المؤمنین)

[٢١٧] - العراق فی الرسائل مس بیل.. ص ٢٠٨

[٢١٨] ـ دەقی نامەکە لەج١ کتێبی: عبدالرزاق الحسنی –تاریخ الوزارات العراقیه.

فەرمی ژ: (ا، ب.. ٤٢) لە ٨ / ئایار/ ١٩٢٣ بۆی دانـان، دەسـەڵاتی حکومەتەکـە زۆر لاوزبو هەرودك لە خالی (١٠)ی بەیانی دووەمـی برسـی کـۆکس دەردەکـەوی ئـەو کاتـە بریارەکانتان یاسابیە کەمن مۆری دەکـەم[٢١٩]، حکومەتەکـە پێـك هـاتبوو لـە١٠ لیـواو ٣٤قەزاو ٨٥ ناحیە

٥ ـ سوپا: یادی دامەزراندنی سوپای عێراق بۆ ٦/کانونی دووەمی ١٩٢١ دەگێرنەوە، بەڵام ڕاستیەکەی وانیە، هەر لەگەڵ داگیرکردنی ئەو ناوچەیە لە ١٩١٤ ـ ١٩١٨، بەریتانیا میلیشیای جاش بە ناوی (شەبانە) و (لیڤی) و... دروستکرد، لە ساڵی ١٩١٩ (٩٠٠) کەس لەو شەبانەیە بە فەرمی تۆمارکران و چونە ناو لیڤی، بڕیاری دروستکردنی لە پەرەگرافی (٣٠) کۆنگرەی قاهیرەش هاتوە، بەڵام بەشێوەی ڕەسمی یەکەم نوسراو بە ژ:٩٣١٤ لە ١٩٢١/٥/٢٦ لەلایەن (مەندوبی سامی بەریتانی) بۆ ئەنجومەنی وەزیران هاتوە فەرمان دەدا، کە سوپا دروست بکەن بۆ پاراستنی ئاسایشی ناوەخۆ بە چەك و تفاقی بەریتانی. لە مانگی تەموزی ١٩٢١ یەکەم گوردان (فەوج) بەناوی ئیمام کازم دروستکرا، دووەمین بەناوی کەتیپەی خاتوون (واتە مس بیل) دووبارە لە مادەی ٧ی ڕێکەوتننامەی بەریتانی ـ عێراقی یەکەم ١٩٢٢ بڕیاردرا بەریتانیا ئەو سوپایە بەخێو بکاو پڕچەکی بکاو بەکاریشی بهێنێ بۆ لێدانی هەر سەرهەڵدانێك، ئەو سوپایەش بە سەرۆکایەتی (ئەی ـ سی ـ دیلی) بەریتانی بو، تەرفیع و پایە بە ئەفسەرو پلەدارەکانیش لەژێر دەستی (ئەرشیبۆلدکلارك)بو[٢٢٠]، لەلایەن زانایانی ئایینی نارەزایی دەربڕا لە دروستکردنی سوپا و وتیان ئەوە دەبێتە هۆی براکوژی.. ڕاستیش دەرچو. هەر لەسەرەتاوە هێزەکانی سوپاو لیڤی لەگەڵ سوپای بەریتانی پەلاماری میللەتیان داوە لەدژی هەردوو شۆڕشی کورد ١٩١٩، شۆڕشی ئیسلامی ١٩٢٠ لە خوارو، یەکەم بەکارهێنانی ڕەسمی ئەو سوپایەش لەدژی عێراق لە ١٩٢١/٨/٣١ بوو بە فەرمانی برسی کۆکس، لەوکاتیەوە هەتا ساڵی ٢٠٠٣ ئەو سوپایە هەر خەریکی کوشت و کوشتاری گەلانی عێراق بووە بۆ پاراستنی دیکتاتۆریەت و پاراستنی تایفی و ڕەگەزی هەروەك (حنا

---

[٢١٩] ـ العراق فی دوری الإحتلال والإستقلال ص١٩٨

[٢٢٠] ـ هەر بەنمونە دەقی بەلگەنامەیەکی بریتانی لە کتێبی(تأسیس الجیش العراقی وتطور دوره السیاسی ص٤٩٣) لـەوەڵامی نوسـراوێکی بەژ:٩٣/١٤١٩/٧٧٩٥ باس لە تەرفیعی سەرۆك ئەرکانی سوپای عێراق دەکا لەلایەن هەیئەی ئەرکانی بەریتانی بەسەرۆکایەتی کلارك .

پەتاتۆ)ش لە توێژینەکەی لەکتێبی (العراق) کەیشتۆتە ئەو ئەنجامە[221] کە تیایدابەهۆی ئەو سوپایە نادادگەری کراوە لە ئەرك و فەرمان، کوردوشیعە ئەرکیان زۆر بوو مافیان کەم بوو، لەوبارەیەوە مەلیك فەیسەڵ دەڵێ: باج لەسەر شیعەو پایەش بۆ سوننە.. لەدوایش ڕۆژنامەی (مردوم) لە ژ:٩ ی ساڵی ١٩٤٦ ئاماری بلاوکردبۆوە تیایدا هاتووە: لە تێکڕای ٨٠ ئەفسەری باڵای (روکن) تەنهاسێیان شیعەن، کەچی ٩٠٪ی سەربازانی شیعەن..هەمو سەرۆکەکانیش لەسونەبووینە[222]، لە یاداشتەکانی(گۆلمان)ی باڵوێزی ئەمریکا لەعیراق ساڵی ١٩٥٤دەڵێت: حکومەتی عیراق ڕەگەزپەرستانە کاری کردوە، پەرلەمانەکەیان لە١١٦عەرەب و١٩کورد پێك هاتوە، ٧٣یان سونیەو٥٦ی شیعەیە[223] حنا بەتاتو لە کتێبی (العراق) دەڵێ: لە دوای پەراوێزکردنی شیعەو سوپا سێ ڕەوتی وەرگرت، یەکەمیان عروبی، دووەمیان کوردی، سێیەمیان عێراقی، لەدوای ڕاپەڕینەکەی بەکرصدقی لە ٢٩/تشرینی یەکەم/١٩٣٦ و تیرۆرکردنی لە١٩٣٧/٨/١٤ڕەوتی کوردیش نەما، لەدوای ١٩٥٨ ڕەوتی عروبیەکە بە تەواوی زاڵ بو و زیاتر بوە دەردەسەری.

٥ـ مەلیك:، چەندین هاوپەیمانی لەگەڵ شێخەکانی کەنداو بەمەبەستی دروستکردنی دەوڵەتۆکە بەپێی ستانداردی بەریتانیا هاتە مۆر کردن، لە پێش هەمویان ڕێکەوتنی قەتیف کە دەقەکەی لەخوارەوەیە[224]، هەروەها ڕێکەوتنی تر لەگەڵ شێخەکانی کەنداو،

---

[221] ـ سوپای عێراق هەر بەرامبەر ژن ومندالی بێ دەسەڵاتی کورد دڕندە نەبوە ، بۆ گەلانی عیراقو خودی عەرەب وشیعەکانیش ئاوابوو، لەکتێبی (الغزو العراقي للكويت ) لە بەشی(الممارسات والوقائع من شاهد عيان ص١٤٧-)چۆن باسی دڕندەیی وتاڵانچایەتی ئەو سوپایە دەکا.

[222] ـ سەرۆکەکانی عێراق: مەلیك فەیسەل(٢٣ئۆکست ١٩٢١ـ ٨سپتمبر١٩٣٣)، مەلیك غازی(٨ سپتمبر١٩٣٣- ٤ئەپریل ١٩٣٩)، فەیسەلی دوەم(٤ئەپریل ١٩٣٩- ١٤یۆلیۆ ١٩٥٨)، کۆماری:عبدالكريم قاسم(١٤یۆلیۆ ١٩٥٨- ٨فبرایر١٩٦٣)، عبدالسلام عارف(٨فبرایر١٩٦٣- ١٦ئەپریل ١٩٦٦)، عبدالرحمن عارف(١٦ئەپریل ١٩٦٦- ١٧یۆلیۆ ١٩٦٨)، احمدحسن البكر(١٧یۆلیۆ ١٩٦٨ - ٦یۆلیۆ ١٩٧٩)، صدام حسین(٦یۆلیۆ ١٩٧٩- ٩ئەپریل ٢٠٠٣)، داگیرکاری...، غازی عجیل یاوەر(٢٨یۆنیۆ٢٠٠٤- ٦ئەپریل- ٢٠٠٥)، جلال تالبانی(٦ئەپریل- ٢٠٠٥ -

[223] العراق فی مذكرات الدبلوماسيين الأجانب ص٢٢٩

١. بسم الله الرحمن الرحيم

أولا : تعترف الحكومة البريطانية وتقر بأن نجد والحسا والقطيف والجبيل وتوابعها والتي سيبحث فيها، وتعين أقطارها فيما بعد ومراسيها على خليج فارس هي بلاد ابن سعود وآبائه من قبل. وبهذا تعترف بأن سعود المذكور حاكما عليها مستقلا، ورئيسا مطلقا على قبائلها، وبأبنائه وخلفائه بالإرث من بعده، على أن يكون ترشيح خلفه من قبله ومن قبل الحاكم بعده، وألا يكون هذا المرشح مناونا للحكومة البريطانية بوجه من الوجوه، خاصة فيما يتعلق بهذه المعاهدة .

نموانە: بەریتانیاو (قواسمەکان) لە ٦/فبرایر/١٨٠٦، دووەم لە١١ /ینایر/١٨٢٠ لەگەل شیخەکانی (رأس الخیمە، ابوظبی، بحرین، عجمان، ام القیوین، ..)، دوای هاوپەیمانیکی تر لەگەل ئەبوزەبی لە١٨٩٢..، بەلینیان بە بەریتانیادا، کەئەوبراگەورەیان بێت لە هەمو نیش وکاریکی ناوەو دەرەوە بەتایبەتی کاری نەوتی[٢٢٥]، پیشوو تریش لەسالی ١٧٣٧ز بە سەرپەرشتی ڕێکەوتنامەیەکی نێوان (حمدی کوری ئال سعود و ئیمام محمد بن عبدالوهاب) کرد[٢٢٦]، لە میسرسش ڕێکەوتنی وا لە ١٩ ینایر و ١٠ یولیو/١٨٩٩گرێدرابوو، لە سالی ١٩١٥ش ڕێکەوتنی شریف لەگەڵ ماکماهۆنی بەریتانی مۆرکرا، بوە هۆی سەرکەوتنی گەورەی بەریتانیا بەسەر خیلافەتی عوسمانی، زۆربەی ئەو شیخانە لەژێر سایەی عوسمانی بون، بەلاّم موچەیان لە بەریتانیا هەبو، یەکەم جار گۆڤاریکی بە هیزی ئەو سەردەم بەناوی (شؤون خارجیة) کە لەندەن دەردەچو لەمانگی ١٩٢٧/١ز لە ژێر ناونیشانی (امراء العرب وداوتنغ بسکریت) لیستێکی موچەی مانگانەی ئەمیروشێخ وکەسایەتی

---

ثانياً إذا حدث اعتداء من قبل إحدى الدول الأجنبية على أراضي الأقطار التابعة لابن سعود وخلفائه بدون مراجعة الحكومة البريطانية وبدون إعطائها الفرصة للمخابرة مع ابن سعود وتسوية المسألة، فالحكومة البريطانية تعين ابن سعود بعد استشارته، إلى ذلك القدر، وعلى تلك الصورة اللذين تعتبرهما الحكومة البريطانية فعاليتين لحماية بلدانه ومصالحه .

ثالثا : يتفق ابن سعود ويعد بأن يتحاشى الدخول في مراسلة أو وفاق أو معاهدة مع أية أمة أجنبية أو دولة، وعلاوة على ذلك بأن يبلغ حالا إلى معتمدي السياسة من قبل الحكومة البريطانية كل محاولة من قبل أي دولة أخرى في أن تتدخل في الأقطار المذكورة سابقا .

رابعاً : يتعهد ابن سعود بألا يسلم ولا يبيع ولا يرهن ولا يؤجر الأقطار المذكورة ولا قسماً منها، ولا يتنازل عنها بطريقة ما، ولا يمنح امتيازاً ضمن هذه الأقطار لدولة أجنبية بدون رضى الحكومة البريطانية، وبأن يتبع مشورتها دائما بدون استثناء على شرط أن لا يكون ذلك مجحفاً بمصالحه الخاصة .

خامساً : يتعهد ابن سعود بحرية المرور في أقطاره على السبل المؤدية إلى المواطن المباركة وأن يحمي الحجاج في مسيرهم إلى المواطن المباركة ورجوعهم منها

سادساً : يتعهد ابن سعود كما تعهد آباؤه من قبل، بأن يتحاشى الاعتداء على أقطار الكويت والبحرين ومشايخ قطر وسواحل عمان التي هي تحت حماية الحكومة البريطانية ولها صلات عهدية مع الحكومة المذكورة، وألا يتدخل في شؤونها. وتخوم الأقطار الخاصة بهؤلاء ستعين فيما بعد .

سابعاً : تتفق الحكومة البريطانية وابن سعود على عقد معاهدة أكثر تفصيلا من هذه على الأمور التي لها مساس بالفريقين .

كتب في ١٨ صفر عام ١٣٣٤هـ/الموافق ٢٦ ديسمبر ١٩١٥م.

[٢٢٥]- دەقی ڕێکەوتنەکان لەکتیبی ایران والخلیج العربی ص٤٢- زۆربەشیان بەپەنجە مۆریان کرد خوێنندەواریان نەبوو.

[٢٢٦]- جرى في عام ١٧٣٧م إتفاق بين العالم الديني محمد بن عبدالوهاب مع حمد بن سعود على ان يتولى الأول الإمامة الدينية والثاني زعامة الدولة د.صالح العابد –حركة الأستقلال العربي، رسالة الماجستر –جامعة المستنصرية، بغداد١٩٨٨ ص١٢-١٣(هذه الأتفاقية مشهورة بتحالف الوهابي السعودي)

عەرەبی تێدا بلاوکرایەوە: (١ ـ ابن السعود ١٠ جنیه، ٢ ـ ملك حسین ـ شریف مكه ـ ١٠ جنیه، ٣ ـ فهد الهذال ١٤٠,٠٠٠ ربیه، السید الأدریسی١٢,٠٠٠ لیره..) بەرامبەر ئەو خزمەتە ستراتیژییەی بۆ بەریتانیا دەیکەن [٢٢٧]، زیاترو تایبەتی تریش ڕوی لە بنەماڵەی مەلیك فەیسەل بو، بە نهێنی لەدوای دروستکردنی ئەو دام و دەزگایانە بەریتانیا بڕیاری دا لە پاداشی ئەو هەمو چاکەیەی بنەماڵەی (الشریف حسین بن علی) بۆ هێزەکانی هاوپەیمانان لەدژی عوسمانی کردیان، بەتایبەتی ئەو کارە دەگمەنەیان کەلە ١٩١٦ قودسیان لەدەست ئیسلام دەرهێناو کەوتە ژێر دەستی بەریتانی و لەوکاتیەوە قودس ڕۆیشت، لەو پاداشتەدا مەلەکی بەریتانی بە (وسام النصر) و (صلیب الحرب مع النجل) خەلات کرا [٢٢٨]، ئەوکاتی هەر ولاتێك بۆ سەرۆك یان مەلیکێکی عەرەبی دیاری بکرابایە دەبوایە پالپشتێك لەلای ڕێکخراوی زایۆنی بهێنێت، لەسەر ئەو بنچینەیە(شکری غنام)سەرۆکی وەفدی سوری لە١٩١٩لەبەرامبەر کۆمیتەی ئاشتی ڕێککەوت لەگەل نوێنەری ئاژانسی زایۆن بۆ ئەوەی یەهودیەکان بتوانن بێ ڕێگری بۆفلستین کۆچ بکەن تادەبنە زۆرایەتی حوکمیشی دەگرنە بەر، بەهەمان ئاڕستە مەلیك فەیسەل لە ١٩١٩/٥/٣ ڕێکەوتنێکی لەگەل (حایم وایزمان) مۆر کرد پێکهاتبو لە ٩مادە، دەقەکەی لەخوارەوە [٢٢٩]، دوای کۆمەڵێك خەڵك پاڵێوران بۆ مەلەکی عێراقی لەوانە: (عبدالرحمن

---

عبدالرزاق الحسني - تأریخ الوزارات العراقیة -دارالشؤون الثقافة العامة -بغداد ١٩٨٨م ج١ص٩٢

[٢٢٨] هەمان س ص١٢٢ (یضیف فورستر ان بوانكاریة -رئیس وزراء فرنسا وملك بریطانیا عندما قلدا الوسام وإعتبره حلیفا لهم بما قدمه من الخدمات، ومن الجانب البریطانیا إستقبله ملك جورج الخامس ومنح وسام فكتو ریا الملكی لخدماته الإضافیةوالدور المذكور فی هدم الخلافة وتسهیلاته لتنفیذ وعد بلفور وتوقیعه المعاهدة مع وایزمن حول منح فلسطین للیهود).

٣اتفاقیة فیصل-وایزمان: هي اتفاقیة وقعت في ٣ ینایر ,١٩١٩، بین الأمیر فیصل (ابن ملك الحجاز) و حاییم وایزمان (فیما بعد رئیس المنظمة الصهیونیة العالمیة)، كجزء من مؤتمر باریس للسلام، ١٩١٩ وهي تعطي للیهود تسهیلات في انشاء وطن في فلسطین والإقرار بوعد بلفور.

نص الإتفاقیة

إن صاحب السمو الملكي الأمیر فیصل ممثل المملكة العربیة الحجازیة والقائم بالعمل نیابة عنها والدكتور حاییم وایزمن ممثل المنظمة الصهیونیة والقائم بالعمل نیابة عنه یدركان القرابة الجنسیة والصلات القدیمة القائمة بین العرب والشعب الیهودي ویتحقق أن أضمن الوسائل لبلوغ غایة أهدافهما الوطنیة هو في اتخاذ أقصى ما یمكن من التعاون سبیل تقدم الدولة العربیة وفلسطین ولكونهما یرغبان في زیادة توطید حسن التفاهم الذي بینهما فقد اتفقا على المواد التالیة:

١- یجب أن یسود جمیع علاقات والتزامات الدولة العربیة وفلسطین أقصى النوایا الحسنة والتفاهم المخلص وللوصول إلى هذه الغایة تؤسس ویحتفظ بوكالات عربیة ویهود معتمدة حسب الأصول في بلد كل منهما.

٢- تحدد بعد اتمام مشاورات مؤتمر السلام مباشرة الحدود النهائیة بین الدول العربیة وفلسطین من قبل لجنة یتفق على تعیینها من قبل الطرفین المتعاقدین.

٣-عند إنشاء دستور إدارة فلسطین تتخذ جمیع الإجراءات التي من شأنها تقدیم أوفى الضمانات لتنفیذ وعد الحكومة البریطانیة المؤرخ في الیوم الثاني من شهر نوفمبر سنة ١٩١٧

٤- یجب أن تتخذ جمیع الإجراءات لتشجیع الهجرة الیهودیة إلى فلسطین على مدى واسع والحث علیها وبأقصى مایمكن من السرعة لاستقرار المهاجرین في الأرض عن طریق الاسكان الواسع والزراعة الكثیفة. ولدى اتخاذ مثل هذه الإجراءات یجب أن تحفظ حقوق الفلاحین والمزارعین المستأجرین العرب ویجب أن یساعدوا في سیرهم نحو التقدم الاقتصادي.

نقیب، تالّب نقیب، هادی العمری، خزعل بن الحسین، برهان الدینی کوڕی سولّتان عبدالحمید، غولام ڕەزا والی پشتگوی ئێران، ئاغاخان ڕابەری ئیسماعیلیەکان...، لەگەڵ هەندێك پاڵێوراوی تر کە برسی کۆکس لە نامەیەکدا لە ڕۆژی ١٩٢١/٧/٦ بۆ بەریتانیای نارد[٢٣٠]، بەڵام بڕیاڕدرابو، لە پەرەگرافی (٢)ی بڕیارەکانی کۆنگرەی قاهیرەی ١٩٢١/٣/١٢ بەرەسمی مەلیك فەیسەڵ کرا شای عێراقی تازە، لە ڕۆژی ١٩٢١/٦/٢٣ بە پاپۆڕێکی بەریتانی بەناوی (نورس بوردك) گەیشتە بەسرە، دوای ڕاپرسییەکی ڕواڵەتی لە مانگی ١٩٢١/٧ و لە ڕۆژی ١٩٢١/٨/٢٣ بە فەرمی دەست بەکاربوو.

٦ـ پەرلەمان: یەکەم ئەزموونی پەرلەمانی (شورا) لەنێو فەرهەنگی حوکمی ئیسلامیدا بووە، دوای لە سەردەمی ئەمەوی بەدواوە کەمتر کاری پێکراوە، دوای بووە موڵکی ئەوروپا، تا لە کۆتایی سەدەی ١٩ جارێکی تر گەڕایەوە نێو حوکمی عوسمانی و یەکەم پەرلەمان لە ١٨٧٧/٣/١٧ بەناوی مەبعوسان کرایەوە.

سەربردەکەشی لە عێراق دەگەڕێتەوە بۆ بەریتانیەکان و بڕیارەکانی سایکس ـ بیکۆ و چەکی ئینتداب و لە (مبایعەی مەلیك) و دوای تریش لەمادەی (١٨)ی پەیماننامەی یەکەمی بەریتانیاو عێراق هاتوە، بە فەرمیش لە ١٩٢٠/١١/١٠ مەوڵەتی تایبەتی لەلایەن حکومەتی بەریتانیا دەرچو بۆ پێکهێنانی پەرلەمان لە عێراق[٢٣١]، ڕۆژی ١٩٢٣/٢/٢٥بۆ ڕاپرسی دیاریکراو یەکەم ئەنجومەنیش لە ١٩٢٤/٣/٢٧ کرایەوە[٢٣٢]

٧ ـ دەستور: وشەکە کوردی یان فارسیە، ئیسلامیەکان دەڵێن یەکەم ئەزموونی دەستوری لە (بنەماکانی سەحیفە)ی مەدینە دێت، هەرچی عەلمانیەکان پێیان وایە یەکەم

---

٥ـ يجب أن لا يسن نظام أو قانون يمنع أو يتدخل بأي طريقة ما في ممارسة الحرية الدينية ويجب أن يسمح على الدوام أيضا بحرية ممارسة العقدية الدينية والقيام بالعبادات دون تمييز أو تفصيل ويجب أن لا يطالب قط بشروط دينية لممارسة الحقوق المدنية أو السياسية.

٦ـ إن الأماكن الإسلامية المقدسة يجب أن توضع تحت رقابة المسلمين.

٧ـ تقترح المنظمة الصهيونيةأن ترسل إلى فلسطين لجنة من الخبراء لتقوم بدراسة الإمكانيات الاقتصادية في البلاد وأن تقدم تقريرا عن أحسن الوسائل للنهوض بها وستضع المنظمة الصهيونية اللجنة المذكورة تحت تصرف الدولة العربية بقصد دراسة الإمكانيات الاقتصادية في الدولة العربية وأن تقدم تقريرا عن أحسن الوسائل للنهوض بها وستستخدم المنظمة الصهيونية أقصى جهودها لمساعدة الدولة العربية بتزويدها بالوسائل لاستثمار الموارد الطبيعية والامكانيات الاقتصادية في البلاد.

٨ ـ يوافق الفريقان المتعاقدان أن يعملا بالاتفاق والتفاهم التأمين في جميع الأمور التي شملتها هذه الاتفاقية لدى مؤتمر الصلح.

٩ـ كل نزاع قد يثار بين الفريقين المتنازعين يجب أن يحال إلى الحكومة البريطانية للتحكيم وقع في لندن، إنجلترا في اليوم الثالث من شهر يناير سنة ١٩١٩

[٢٣٠] ـ تاريخ الوزارات- ص٥٣

[٢٣١] العراق في الدوري.... ج٢ ص٦٨

[٢٣٢] عبدالرحمن بزاز... ص١١٨

ئەزموونی بریتیە لە ماگناکارنای بەریتانیا کە لەشێوەی بنەما لەلایەن جۆن سانتێر لەساڵی ١٢١٥ دەرچو، بەڵام لە سەردەمی نوێدا یەکەم ئەزموونی دەستوری بۆ ئەمریکاو فرنسا لەساڵی ١٨٨٧ ولە ١٧٩١، دوای ولاَتانی ئەوروپیش بەدواداهات، جارێکی تر لە کۆتای سەدەی ١٩ بەناوی مەشروتیە گەڕایەوە نێو حوکمی عوسمانی یەکەم ئەزموونی لەساڵی ١٨٧١ پیادەکرا، سەربردەکەشی لەعێراق دەگەڕێتەوە بۆ بەریتانیاکان بە پاڵپشت کردنە سەر مادەی (١)ی چەکی ئینتداب کە بە راشکاوانەتر ئەو ئەرکە لەلایەن (عصبة الأمم)ەوە بە بەریتانیا سپێردرابوو ئەوا (ویلسۆن)ی مەندوبی سامی لیژنەیەکی پێکهێنالە: (بۆنهام کارتەر- سەرۆك، میجر یۆنگ، مسترئەدوار، مستر فیدرسۆن). ئەوانە دەستورێکیان بۆ دەوڵەتی عێراق نوسی و بە ئینگلیزی و تیایدا لەگەڵ گیانی ئینتداب دەهاتەوە، هەروەك لە شیعرێکی مەعروف رەسافی هاتووە:

أسماء ليس لنا سوى الفاظها
أما معانيها فليست تعرف
من يقرأ الدستور يعلم أنه
وفقا لصك الانتداب مصنف

دوای بەبێ دەستکاری وەرگێڕدرا بۆ زمانی عەرەبی بەناوی (قانون الأساسی - organic Lows) لە مانگی ١٩٢٤/٧ پەرلەمانی عێراقیش پێی قایل بوو، لەڕۆژی ١٩٢٥/٣/١٧ بەفەرمی بلاَوکرایەوە وەك دەستوری دەوڵەتی عێراقی.

ئەو دەستورە عەلمانی بو تیایدا ئایین و سیاسەت لێك جیاکرابۆوە، بەتایبەتی هەردوو مادەی (١٣) و (١٢٢) مادەکانی بەگشتی نزیك بوو لە دەستوری ئوستراليا و نەمسا و فەرەنسا لە ناوەرۆکدا.

بەو شێوەیە دام و دەزگا یاسایی و سیاسیەکانی دەوڵەتی عێراقی دەستکرد تەواو بوو، بەڵام پرسیاری بنچینەیی ئەوەیە کێ ئەو دام و دەزگایانەی دروستکرد، کێ سنوری بۆ عێراق دیایکرد؟ کێ مەلیکی بۆ هێنا؟ کێ حکومەت و پەرلەمان و دەستوری دیایکرد؟ کێ سوپای بۆ عێراق دروەست کرد؟ هەر هەموی بەریتانیا خۆی بوو؟

کەواتە کێ دروستکەری عێراقە؟ بەریتانیا یاخود مەلیك فەیسەڵ، یان بزوتنەوەی نیشتمانی عێراقی.. وەڵامەکەی وەك مانگی چواردەیە... بەریتانیا، هەربۆیەش تا ئەو ساتە جەژنی نیشتمانی نیە.

بەوەندەش نەوەستا تا لەساڵی ١٩٣٢ تەقەلایەکی زۆری دا تەنانەت ڕاپۆرتەکانی سەبارەت بە ڕەوشی عێراق لە ماوەی ئەو دە ساڵەی بۆ عصبة الأمم بەریتانیا دەینوسی و ئەو بەڵێنەی بۆ بە ئەندام کردنی دەوڵەتی عێراق لە عصبة الأمم دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٩١٩ و ئەو لێدوانەی بەریتانیا لە ڕۆژی ١٩١٩/٩/١٥ کە تیایدا هاتبوو: بەریتانیا عێراق ئامادە دەکا تا لەساڵی ١٩٣٢ پێی بگەیەنێت بۆ ئەندامیەتی عصبە الأمم[٢٣٣] ڕاستگۆش بو لەگەڵ هەمو بەڵێنەکانی و لە ڕۆژی ١٩٣٢/١٠/٣ دووشەمە سەعات ١١,٥ دەقیقە بو بە (٥٧)مین ئەندام، بەو شێوەیە عیراق بوە دەوڵەت بە پێی مەرجی ڕۆژئاوایی

ئیسرائیلی داهاتوو، هەر وڵاتێکی عەرەبی دروست دەکرا دوو مەرج هەبوو بۆ سەربەخۆیی، یەکیان دان پێهێنان بە ئیسرائیل وەك لەپێشووترنیشانماندا، دوەم تەقەلا نەدان بۆ یەککگرتنەوەی عەرەبی[٢٣٤]

مس بیل وەسفی ئەو بەئەندام بونە بە (بەریتانیا دروستکەر و عێراقیش دروستکراو) دەکا[٢٣٥]، د.علی وردیش لە کتێبی (لمحات.. ج٦ ص١٢٨ـ ١٢٩) عێراق بە کوڕی بەریتانیا وەسف دەکا. ئێمەش دەتوانین بڵێین: دەوڵەتی عێراق لەدایکی عەرەب و باوکێکی ئینگلیزی بەبێ مارە ئەو کوڕەیان بووە.

بۆ هەمو ئەو تەقەلایانە لایەنە عەلمانیەکان یارمەتی بەریتانیایان داو زانایانی ئایینی و جەماوەرەکەیان لەدژی بون، بۆیە مس بیل زانایانی ئایینی عێراق بە هەرە دوژمن پۆلین دەکا[٢٣٦]بەتایبەتی شیعە بۆیە مس بیل دەڵێ من سونیم[٢٣٧]، زانایانی ئایینیش دەوڵەتی عێراق بە مورتەد و خیانەت لەقەڵەم داوە[٢٣٨]

---

[٢٣٣]ـ العراق في الدوري... ج٢ ص٢٣٠

[٢٣٤]ـ لە(ملل والنحل والأعراق ـ ط٢ سعدالدين ابراهيم ص٥٩٤ )هاتوە: بعد أن أصبحت (لبنان) إدارة مستقلة عقب جهود البطريارك (الإلياس) جاء شروط إستقلال ( لبنان )عبر إتفاق غير مكتوب بين (بشار الخوري المسيحي) و(رياض الصلح المسلم) المشهورة بإتفاقية ( خورى - صلح) ، في عام ١٩٣٤ وسمي ب(ميثاق لبنان) وجاء في نقطته الجوهرية: أن يكف المسلمون عن المطالبة بالوحدة مع سوريا أو آية وحدة عربية، وان هذا شرط للإستقلال.لە (نشأة الدولة العراقية- فورستر ص١٤٦ ) هاتوە: عندما اعتلى فيصل عرش العراق عام (١٩٢١)م قيد بالشروط نفسها

[٢٣٤]ـ العراق في رسائل مس بيل ص٩٠-٩١

[٢٣٦]ـ العراق في رسائل مس بيل ص٣٩

بۆ بیرهێنانەوە لەسەروو باسی هەنگاوەکانی دروست بونی دەوڵەتی تورکیامان کرد تابزانین چۆن مەینەتی کورد دروست بوو، لێرەش کە باسی هەنگاوەکانی دروست بونی عیراقمان کردوە بۆ ئەوەی بزانین چۆن مەینەتی کورد لەبەشی خواروو دروست بوو، هەردوولای سەروو وخواروش لەیەك کاتدا ڕویدا بۆیە مەینەتیەکەی تەواو کرد وەك ئێستا باسی دەکەین.

## مەینەتی کورد لەدروستبونی دەوڵەتی عێراق

پەیوەندی کورد و عەرەبی دراوسێ: باشوری کوردستان مێژویەکی سەربەخۆی زۆر کۆنی هەیە هەروەك بەشەکانی تر، مەگەر هەندێ ماوە نەبێ وەبەر هەڵمەتە فراوانە جیهانیەکانی وەك پەلامارەکانی مەغۆل و تەتەر و هەندێ لایەنی تر.
سنوری خوارووی کوردستان تا ئەو ساتیش دووچاری تەعریب و بچوك بونەوە نەببوو، لەسەروڕا یەکەم پرۆسەی بە تورك کردن لەساڵی ١٩٢٣ بە فەرمی کرا بەپێی نوسراوی

---

[٢٣٧] ـ کرتلوف لەکتێبی(الثورة العراقية ص٢١٣) لە بارەی هەلوێستی ناوچە سونیەکان دەلێ: وفی بغداد إنطلقت مظاهرة وطنية في ١٩٢٠/٨/٦ مؤيده للإنجليز ومعادية للثورة، أما مناطق الموصل وغربي بغداد - حيث يتركز نشاط القوميين فيها ـ فقد منعت من انتشار الثورة

[٢٣٨] ـ الثورة العراقية الكبرى ص٣٦... بۆ زیاتر زانیاریت لەبارەی دژایەتی تاینیەکان بۆ دروست بوونی دەولەتی عیراقی ولاگیری عەلمانیەکان بۆ دروست بوونی، ئەوەی خواردوە لەتوێژینەوەی خۆمان بەناوی (الإسلام والعلمانية واثرهما فی نشأة الدولة العراقية الحديثة)بخوێنەوە: اما من جهة الحركة الوطنية والعلمانية، فقد وقفت أكثريتها ضد ثورة عشرين وأيد البريطانيا، وقد عرض(نوری السعيد) خدماته للإنكليز ضد الثورة واوفدوا (ثابت عبد النور) نيابة عن جمعية العهد للأتصال بوزارة الخارجية البريطانية عارضاً عليها: ((ان جمعية العهد يمكن ان تقدم مساعدة قيمة للأنكليز فی تهدئة الأوضاع ما بين النهرين)) ، وقد عرض كل من الملك فيصل وجعفرالعسكری أفكارهما عن طريق (مس بيل) لتأسيس حكومة وطنية مع الإعتراف بالأنتداب البريطانی ومقترحات أخرى معادية للثورة ، وقد وقف كل من طالب باشا وعبد الرحمن النقيب بلا تردد مع بريطانيا حيث أخذ (طالب باشا) على عاتقه مسؤولية تفريق الإجتماعات المعارضة لبريطانيا، بينما وصف (عبدالرحمن النقيب) الثوار - اوأی من يعارض بريطانيا- بأنهم مجانين و(لاشرف لهم)، و وصف الثوار بالشيعة والتقية والوثنية، وهكذا كانت هناك حملة أعلامية متبادلة بين أدباء الثورة والأدباء الموالين للإنكليز، والذين شكلت منهم الحكومة العراقية فيما بعد، فقد وصف الموالون لبريطانيا من قبل إعلام الثورة: بالمرتزقة و الحوشية وابو رغال وحفيز وشبانة الخونة والمرتدين..الخ، وقد منعوا دفن موتاهم على الطريقة الأسلامية، وكذلك وصف الشريف واولاده الملك فيصل وعبدالله...) بالمارقين، ووصف الشيخ (محمد رضا الشبيبی) الدولة الحديثة التی قامت فی العراق بعد الثورة بانها: ((مستقلة ذات سيادة فی الظاهر، ولكنها لم تكن كذلك فی الواقع فالإستقلال كان إستقلالاً ملوثاً، واتضح لهذا الشعب الكريم ان هناك خطة استعمارية مرسومة اعتبرت الثورة العراقية الكبرى بموجبها جريمة))

ز:۱۵۰٤ که تیایدا دەست گیرا بە سەر زەوی و زاری دەرەبەگ و شێخە کوردەکان درا بە تورکە مهاجرەکانی کە لەلای یۆنان رایان کردبوو*، لەلای خواروش یەکەم تەقەلای تەعریب بەریتانیا کردی کاتێ لە نەخشەی ڕێکەوتنی سایکس بیکۆی ۱۹۱٦ ناوچەکانی کەرکوک و مەندەلی خستە سەر ناوچەی(B)، دوایی لەکێشەی ویلایەتی موسڵیش ڕاستەوخۆدەستکاری ژمارە مێژوویەکانی کرد لە قازانجی عەرەب، لەوکاتیەوە بەرەبەرە تەعریب لە خوارو و تەتریکیش لە سەروو دەستی پێکرد، لە سەروو زۆری نەخایاند، بەلاّم لە خواروو تا روخانی سەدام ۲۰۰۳ بە خەستی بەردەوام بو، سنوری کوردستانی خواروو(یان سنوری نێوان کوردو عەرەب) بەو شێوەیە بوو و پێش دەستکاری لە سەرەتای سەدەی بیستەم و لەگەڵ هاتنی عەلمانیەت:

پیشوتر لە زۆر سەرچاوە باسی سنوری کوردستان بەتایبەتی (باشوری کوردستان) کراوە، ئەوانە دووبارە ناکەینەوە، هەوڵ دەدەین سنوری کوردستانی خواروو لەنێو بەڵگەنامەو ڕێکەوتنەکان دیاری بکەین بنچینەیەکیش بێت بۆ ناوچە دابڕاوەکان[239]:

۱ـ سنوری خوارووی کوردستان بە پێی سنوری عیراقی عەرەبی: باسنوری عیراقی عەرەبی دیاری بکەین، هەرلە نەخشەی ئیبن حوقل تا نەخشەکانی عوسمان[240] مەعجەم وکتێبە مێژوویەکان هەموی خوارووی کوفە تا نزیك بەسرە بە عراق العربی دەناسن، بەلاّم بابزانین فراوان ترین نەخشەی عراق العربی کەباس کرابێ لە (عجائب البلدان)

---

* زۆربەی سەرچاوەکان کۆکن کە یەکەم پرۆسەی بەتورك کردنی کورد لەسەر دەستی ئەتوەر پاشا کراوە، بەلاّم (ئەرشاك سافراستیان )لە کتێبەکەی (الکردوکردستان ص۱۱۲)دەڵێت: لەسالی ۱۹۱٥-۱۹۱٦ کاتی سوپای روسی بەرەو سنوری تورکیا هات، ئیتجادیەکان(کە ئەو بە تورکیای لاو ناویان دەبات) تۆبزیان لە سولتان محمد رشاد دەکرد بۆ ئەوەی کوردەکانی ئەو ناوچەیە کۆچ پێ بکا ولەنێو تورك بیان تاوێنیتەوە، بەرێژەی ۱۰کورد لەنێو ۱۰۰ تورك وزۆریشیان لێ بکرێ تا بەتورکی قسە بکەن تا ئەوەی داهاتویان کوردیان لەبیربچێتەوە وببنە تورك، لەسەر ئەو بنچینەیە ۷۰۰۰۰۰کورد کۆچیان پێ کرا.

[239] ـ کێشەی ناوچە دابڕاوەکان لە بنەچەدا لەوە دێت کە بریتانیاو فرنسا لە سایکس-پیکۆ(۱۹۱٦)هەلسان ئەو ناوچەیان لەکوردستان جیا کردەوەو ناویان نا(B)، ئەیان خستە سەر ناوچەی عەرەبی بەلاّم لەکوردستانیان جیا کردەوە، مێژوونوسە عەرەبەکان کە(داخلیە العراقیە )بە پاڵ ناوچەی(B) رەدەنێن رای دەردەخەن کە سایکس پیکۆ ئەو ناوچەی بە عیراق دابێت راست نیە ، لە ئینگلیزیەکە ناوی عیراقی تێدا نیە، لەو کاتیەوە حکومەتەکانی عیراقی کار لەسەر ئەو ناوچەدەکەن بۆ قرتاندنی لەکوردستان، ئەوەی گورزێکی تری لێدا ئەوەبوو لە بڕیاری ناوچەی (ئارام) سەرووی هێلی۳٦ دیاری کرا، کە پێویست بوو سەرووی هێلی ۳٤بێت، بەو شێوەیە وادەردەکەوێ کە بڕیاری نێو دەولەتی ئەوە بێت ئەو ناوچەیە ساغ نەبێتەوە بۆ کوردستان

[240] ـ بروانە نەخشەی ئیبن حوقل لە سالی ۹۷۷ز هەروەها نەخشەی عوسمانی ۱۸۹۲ ونەخشەی ۱۸۹٦ و

هاتوه، دەڵێ: بریتیە لە عەبادان تا تکریت، کەواتە لەخوار (جبل حمرین) سنوری عیراقە، ئەوە لەگەڵ (تەقویمە عوسمانی سالی ١٧٠٠وادیتەوە کەموسلی خستبوە سەر حکومەتی دیاربەکرو بەغداو بەسرەشی خستۆتە سەر میزۆپۆتامیای خواروو، یاقوت حموی لە معجم البلدان ص٢٩٠ لە زۆر شوێن باس لەو سنورە دەکا بە بۆنەی جیاجیا، لە باسی (حلوان و هەبونی شا هەنجیر لێی) دەڵێ: حەلوان دواسنورە لە سەواد و عێراق کەمێك سەروی بەغدایە کە بە هەرێمی شاخ ناودەبرێن، لەلایەن (فورستر) سنوری سەرووی عیراق بەو شێوەیە دیایکردوە: (تبدأ من السور المادی، شمال بغداد عند نهر دجلة یصل الی الصقلاویة قرب الفلوجة والی مدینة (اوفیس ـ جنوب سامراء) والی الرمادي علی نهر الفرات، عند درجة ٣٤ من خط العرض تقریباً حتی الخلیج العربي ومن الصحراء السوریة حتی الجبال الایرانیة)[٢٤١]، هەرچی کۆتلۆفە وای دیایکردوە: حوضي نهری دجلة والفرات من حوالی بغداد الی الجنوب من مدینة بغداد، اما شمال بغداد فهو منطقة کوردستان الجنوبیة[٢٤٢]، لەکتێبەکۆنەکان عیراق لەسەر عرب پۆلین نەکراوە، ئیبن بەتوتە لە(الکتاب الروض المعطار فی خبرالأقطار.. ص١٦٣مادة: بلاد العرب) ناوی عیراق لە بلاد العرب تیا نەهاتوە، هەموشیان لەگەڵ بروسکەکەی چەرچل تێك دەکاتەوە کەسوپای بەریتانی گەیشتە سەرووی بەغدا داوای لێکردن بوەستن و وتی خواروی جبل حەمرین بە سەرودوە سنوری کوردستانە، ئیتر باس لەوە، کەکوردستانی خواروو بەشێك بێت لە عێراق نەك هەر دەشێ و ناشێ بەڵکو ئیقلیمیشیان لێك جیا بوە[٢٤٣]

٢ـ سنوری خوارووی کوردستان لە ڕێکەوتنامەکان: لە ڕێکەوتنی ئەرزەڕۆم کە لە١٨٢٣/٧/٢٨بەسترا، پێکهاتوە لە (٧) بەش ـ لەبەشی یەکەم باس لە کوردستان دەکات و دەڵێ: سنوری دەگاتە نزیك بەغدا[٢٤٤]، ئەوەش هەر لەگەڵ خاڵی یەکەم لێك

---

[٢٤١] ـ فورستر ـ تکوین العراق ص١٣

[٢٤٢] ـ کوتلوف ـ ثورة عشرین ص٢٥

[٢٤٣] ـ (الموسوعه العربیه العالمیه مادە: علوم عندالعرب والمسلمین)لە ل١٣٠ی ئەو کتێبە ناوی ئیقلیمەکان و وڵاتانی تێدایە.

[٢٤٤] ـ جرگرافی ناسی گەورەی ئیسلامی ئیبن حۆقل لەسەدەی١٠ لە موسل بوە دەڵێت: موسل ناوو هەوایەکی خۆش وبازارەکی گەرمی هەیەو زۆربەشیان کوردن. هەرچی قاموسی عوسمانیە لەمادەی کوردستان لە قاموس الاعلامی شمس الدین سامی، هەروەها لە (مادەی ویلایەتی موسل) دەڵێ: خەلکەکەی زۆری عەرەبن بەلام هەرێمەکە پارچەیەکە لەکوردستان. بۆ ئەو مەبەستەو زیاتر بڕوانە: ل٣٠٧ی (کوردو کوردستان لە یەکەم ئەنسیکلۆپیدیای عوسمانی).

نزیکن. سنوری خوارووی کوردستان لەمادەی ٦٢ی سیڤەر سنورەکە دیایکراوە و بریتیە لە رۆژهەلآتی فورات[٢٤٥]

٣ـ سنوری خوارووی کوردستان لە نەخشەکان: نەخشەی ئیبن حۆقل لە سەدەی ١٠، ئەلبیرۆنی، خوارزمی، بنیامین بن حنا(١١٦٠ ـ ١١٧٣)زابو حسن بن سعید(١٢٧٤ز...زۆری تر سەرووی بەغدایان بە(جزیرە)ناوزەدکردوە، خوارووی بەغدایان بەعیراق تۆمارکردوە، لە هەردوو نەخشەی ئیداری عوسمانی سالی ١٨٩٣ و ١٨٩٦ کوردستان زۆر بەگەورەیی تۆمارکراوە، لەنەخشەی سایکس پیکۆش تەنها بەغداو بەسرەی بە میزۆپۆتامیای خواروو دیایکرد.

٤ ـ سنوری خواروی کوردستان لەبەلگەنامەکان: لە بەلگەنامەیەکی بەریتانی کە تیایدا بالویزی لەبەغدا(کانسیری) زانیاری لەبارەی رووداوەکانی کوردستان دەنیری وسنوری باشوری بۆ نزیك(محەمەرە)دەست نیشان دەکاوزیاتر لەوەش ئەو زانیاریە لە بەرپرسیکی گەورەی حکومەتی عیراق دەگوازیتەوە[٢٤٦]، بە پیی بەلگە نامەی ئەمریکی fo٣٧١/٣٧٨١ سنوری کوردستان ئەو ویلایەتانەی دەگرتەوە کە لەنەخشەی عوسمانی سالی ١٨٩٣ هاتوە

---

[٢٤٤]ـ کوردستان ماددەی (٦٢):

لیژنەیەکی سێ قۆلی پێك دێت بارەگاکەی لە ئەستەمبۆل دەبێت، ئەو لیژنەیە لەلایەن بەریتانیا و فەرەنسا و ئیتالیا و نوێنەری کورد دروست دەکرێت بۆ ئامادەکردنی پرۆژەی ئۆتۆنۆمییەکی دەڤەریی بۆ ناوچە کوردییەکان لەدوای شەش مانگ لە مۆرکردنی ئەو پەیماننامەیە، سنوری ئەو ناوچەیەش بریتییە لە رۆژهەڵاتی فورات، و باشوری رۆژئاوای سنوری ئەرمینیا کە لەدوای ئەوەش دیاری دەکرێ، لە سەرووی سنوری تورکیا و سوریا و میزۆپۆتامیا کە لە پەرەگرافی (٢)ی ماددەی (٢٧) دەستنیشان کراوە، ئەگەر لەکاتێکیشا ئەو لیژنەیە لە هەر مەسەلەیەك نەگەیشتنە ئەنجامێك ئەوا هەریەکە راپۆرتی خۆی لەو مەسەلەیە دەداتەوە حکومەتەکەی، لەو پرۆژەیەدا پێویستە رەچاوی تەواوی مافەکانی رەگەزی و ئایینی کلدان و ئاشور و کەمایەتییەکانی تری (نەتەوەیی) و (مەزەبی) بکرێت لەنێو ئەو سنورەی لە سەروو دیاریکرا، بۆ ئەو مەبەستەش لیژنەیەکی تری پێکهاتوو لە بەریتانی و فەرەنسی و ئیتالی و فارسی و کوردی سەردانی مەیدانی دەکەن بۆ هەر دەستکارییەك ئەگەر پێویست بکات لە سنورەکانی تورکیا، لەبەر ئەوەی ئەو سنورە لەژێر مەرجەکانی ئەو پەیماننامەیە تا سنوری فارس.

[٢٤٦] من السفارة البريطانية – بغداد ٣٢٩/٢٨٦٩ WO

الى الدائرة الشرقية – وزارة الخارجية البريطانية ٥/ شباط/١٩٤٩

و في اليوم الثالث من المحاكمة صرح مهداوي تصريحا مثيرا للغاية حول الكرد، قائلا و التي سبق و ان اشرنا اليه في الفقرة ٢ من البرقية رقم ١٠٢ بتاريخ ٢٧ كانون الثاني و التي يزعم فيه بانه لا يرى اي احراج من الأدعاء بان نفوس العراق سيصل عام ١٩٦٠ الى١٠مليون لأن الكرد الذين يسكنون في المنطقة الجبلية كبيرة بدا من اسكندرونة و انتهاءا بالمحمرة، يعتبرون حماة الجمهورية العراقية الديموقراطية. ان هذا التصريح يصبو في الرئيسي للمحاكمة و التي هي محاولة لكسب الكرد...

٥ ـ سنوری خوارووی کوردستان لە راپۆرتی (تقریرلجنة عصبة الأمم الخاصة بحل النزاع الترکی البریطانی حولةلاية الموصل) :لەل٢٢٣هاتوەودەڵێ سنوری کوردوعەردب لە بەیەك گەیشتنی زاب و دیجلەبەرەو کفری دەڕوا، بەوشێوەیەو موسل لەعەرەب جیادەبیتەوە، هەرلەل٢١٩ دەڵێ عیراق هیچ مافێکی لە وناوچەیە (ویلایەتی موسل)نیەو ناوی عیراقیان هەرنەبیستوە، لەل١٥٣ دەڵێ نێوان موسل و بەغدا هیچ ناوێکی دیایکراوی نەبوە، لەل٢١٨ ڕاستەوخۆ تردەڵێ: ویلایەتی موسل کوردیە، هەرلەو راپۆرتە لە ل١٥٩ باس لەوە دەکا کەلەسەردەمی سوڵتان سلیمانی قانونی(١٥٣٤)ودواتریش بەغداوموسل وکەرکوك بە ولایەتی شارەزورناوزەد دەکرا.

٦ـ سنوری خوارووی کوردستان لەکتێب و مەوسوعە بەناوبانگەکان: ئیبن بەتوتە لە کتێبی (تحفة النضار في غرائب الامصار ـ ص٢٠٨) دەڵێ کاتێك لە بەسرە بەرەو ئەسفەهان ڕۆیشتم، لە ڕێگا لامدا ماڵە کوردەکان، ئیبن خەلدون و چەندین سەرچاوەی مێژوویی ئیسلامی باس لە (جبل الأکراد) دەکەن لەو ناوچەیە[٢٤٧]، لەدائیرەی معارفی فرنسی دەڵێ جەزیرەو موسل[٢٤٨] وکەرکوك و هەولێرو سلیمانی و رانیەوکفری یەك یەکە پێك دەهینن، هەریەکە لەگەڕیدە بەناوبانگەکانی وەك: ڕۆلف لەسەدەی ١٦ وجاکسۆن لەسەردانەکەی سالی ١٧٩٧ وملینگتۆن لە سەدەی ١٩ هەمان زانیاری و زیاتریش لەوە موسلیش بە کوردستان وەسف دەکەن، لە (موسوعەالعالمیە العربیە)[٢٤٩]لە (مادە: جبل حمرین)دەڵێ (جبل حمرین) سنورێکی سروشتی نێوان کوردو عەرەبە.

وەك دەرکەوت لە پرۆسەی دروستبونی عێراق دەسەڵاتێکی عەرەبی لەو ناوچەیە نەبوە، ئیتر ئەو بانگێشەیەی (هەندێ ڕەوشەنبیری کورد)گوایە عەرەب هەر ئێمە دەچەوسێننەوە نەك هەر هەڵەیە بەڵکو پێچەوانەشە، زۆربەی جار دەسەڵاتی کوردی عەرەبی چەوساندۆتەوە، کەی عەرەب هاتون حوکمیان لەسەر هەولێر یان سلێمانی کردبێ، لەپێش

* ئەو راپۆرتە لە کتێبی(ولایە الموصل) مراجعە وتحقیق عبدالرزاق القیسی بلاوکرایتەوە.

[٢٤٧] وفي شرقي بلاد خوزستان جبال الأكراد متصلة إلى نواحي أصبهان وبها مساكنهم ومجالاتهم وراءها في ارض فارس... تاريخ ابن خلدون ص٨١. لە( مقدمة ص٦٣ ) دووبارەی کردۆتەوە

[٢٤٨] أرض الجزيرة: وهي جزيرة ابن عمر، وتشتمل على ديار ربيعة ومضر، وتسمى ديار بكر، وهي ما بين دجلة والفرات وكلها تسمى بالجزيرة، وبها مدن وقرى عامرة. ومن مدنها المشهورة الموصل المصدر: عجائب البلدان- لسراج الدين ابن الوردي

[٢٤٩] ـ لە هەمان مەوسوعە لەبارەی کرکوك: كركوك مدينة تقع في شمالي العراق، وهي عاصمة محافظة التأميم، ومركز حقول البترول الشمالية، حيث تم اكتشاف أول حقل للنفط في غربها وتُعدّ كركوك رابعة كبرى مدن العراق، حيث بلغ عدد سكانها ٩٠٠,٠٠٠ نسمة في عام ١٩٩٣م ، تعدّ كركوك عاصمة المجموعات الكردية في شمال العراق.

١٩٢١ بۆ هەشت سەدە بژمێرەو بگەڕێ بزانە هیچ دۆخێکی وا هەبوە، دەتوانم بڵێم: بە درێژایی مێژوش وانەبووە، بەتایبەتی لەدوای ئیسلام بە ماوەیەکی کەم عەرەب لە سەردەمی ئەمەوی دەسەڵاتیان هەبوە، ئەوناوزەدیەی وەك: ئەعرابی و نەفام و تێنەگەیشتوو لە سەردەمی پێغەمبەر(د.خ)و خەلیفەکانی ڕاشد لەسەریان بوو لادرا، هەرچەندە ئەمەویەکانیش وەك ئیبن خەلدون دەڵێ دەمارگیرییان بۆ (قورەیشیزم) هەبو، نەك عروبە، چونکە لە بنەچەدا عەرەب نەتەوە نەبون، زیاتر بەو ناوچەیەی دەوروبەری مەکەو مەدینە وتراوە عەرەب کە پێکهاتبون لە ڕەگەز و ئایینی جیاجیا کە بە زمانێکی هاوبەش دەئاخافتن.تەنانەت لە سەردەمی ئەمەویش عەرەبی ئیراقی دەسەڵاتیان نەبوو، نەلەسەردەمی عەباسیش.

لەدوای ئەمەوی وعەباسیش زیاتر خەڵکی تر حوکمی عەرەبی کردوە بەتایبەتی لە عێراق، فارس و کورد و تورك و تورکمان و چەرکەس ومەغۆل ومەملوك، عوسمانی، تا دوایی بەریتانیا هات، کەس بە حوکمکردنی عێراق و بەغدا و بەسرە هەر قایل نەبوو، لەنێو عوسمانی بەغداو بەسرە ناوی (سیبیریای عوسمانی) بوو، لەماوەی (١٦٣٩ ـ ١٧٠٤م کەمتر لە(٦٠) ساڵ (٣٩) والی گۆڕا[٢٥٠]، لە نێوان ١٩٠٨م تا ١٩١٧م (١٥) والی گۆڕا، ئەوانەش ناوەکانیانە: (ابوبکر حازم بك ـ ١٩٠٧)، (نجم الدین ملا بك ـ ١٩٠٨)، (محمد شوکت باشا ـ ١٩٠٩)، (نازم باشا ـ ١٩١٠)، (یوسف اکاه باسا ١٩١٠)، (جمال بك ـ ١٩١١)، (محمد زکی باشا ـ ١٩١٢)، (جستو جلال بك ـ ١٩١٣)، (محمد فازل داغستانی ـ ١٩١٣)، (جاوید باشا ـ ١٩١٤)، (رشید بك ـ ١٩١٥)، (سلیمان نەزیف بك ـ ١٩١٥)، (نورالدین بك ـ ١٩١٥)، (خلیل بك ـ ١٩١٦)، دوا والی (ممدوح بك ـ ١٩١٧)،[٢٥١] هەندێکیان دووبارە دەبونەوە، جار وابوو والیایەتی دەکراو دەفرۆشرا، ئەفراسیاب بن أحمد ـ لە سالی ١٥٩٦م ولایەتی بەسرەی لە والی عوسمانی کڕی بە (٤٠٠٠٠٠٠٠قرش)، هەروەها بکر سوباشیش لە بەغدا، ئەو دەست گۆڕیەی دەسەڵات بەسەر عەرەب دەکرا بێ ئەوەی خۆیان بەشداربن یاخود بەرگرییەك بکەن، لە دوای عەباسی وئەمەوی زیاتر لە ٣٠جاربەغدا بە بێ بەرگری وەك داگیرکردنەکەی

[٢٥٠]ـ العراق فی التاریخ-بغداد ١٩٨٣م ص٥٨٦
[٢٥١]ـ الإسلام والعلمانیه....ب- بغداد الجدیده.. المصدرالسابق ص٢٦٥-٢٦٦

ئەمریکاگیراوە[*]، زۆر بەدەگمەن لە مێژوو دەسەڵاتێك یان میرنشینێك لەبەغداو عیراقی ئێستا دەدۆزیەوە حوکمی خۆی کردبێت، لە نێو هەمو مێژوو میرنشینێك لە بەسرە بەناوی (شیخ راشد مغامسی ـ شێخی عەشیرەتەکانی مونتەفەك)لەسەردەمی سوڵتان سلیمان قانونی(سەدەی ١٦) هەبوە تا ئەو ڕادیە سکەو دوعای هەینی بەناوی ئەو بێت[٢٥٣]، هەرچی کوردستانەزۆر بەزەحمەت داگیرکراوە، لەل٣٨ی شەرەفنامە دەڵێ: کوردستان داگیر نەدەکرا ئەگەر بەدەگمەن داگیریش کرابێ ئەواخوێنێکی ئەوەندە زۆر دەڕژا داگیرکەرەکە جارەکی تر ڕووی لە کوردستان نەدەکردەوە، دروشمی داگیر کەران ئەوە بوە کوردستان بەکەس داگیر ناکرێ، سەر بۆ کەس شۆڕ ناکەن[٢٥٤]، جگە لەئەیوبی هەر لە سەدەی ١٩ لە سەردەمی دەسەڵاتی بابانەکان عبدالرحمن بابان خۆی والی بەغدای دادەنا، جارێکیان پێیان وت بۆچی خۆت نایەی بۆ بەغداو حوکم بکەی، وتی من ئاوو هەوای ساردی سلێمانی بە هەمو عەرەبستان نادەم..هەرگیز عەرەب کوردستانی داگیر نەکردوە وتەقەلاشی نەداوە وهەرەشەش نەبووینە ـ بڕوانە ئەو بەڵگەنامەی بەریتانی[٢٥٥]، ئینجا عەشایرە عەرەبەکان دەبونە جاشی کورد و ناویشیان (ساریجە ـ سواریجە) بووە، لەڕاستیدا ئەوان زیاتر بەدەوی و مەڕ لەوەڕێن بون، بۆ ئەوەی بتوانن بێنە ناوچەکانی کوردستان و لە ڕوباری دیجلەو چیای حەمرین بپەڕنەوە گەلێ جار بەهۆی پەنا بردنە بەر تێکەڵی و ژنخوازی

---

*لە پێش تر ئەوانە حوکمیان کردوە: (الاکدیة ٢٣٣٤-٢١٥٤ق.م)، (أور٢١١٢-٢٠٠٤ ق.م)، (بابلي القديم ٢٠٠٤-١١٦٢ ق.م)، (آشورية ٢٠٠٠-٦١٢ ق.م)، بابلية الحديثة (٦٢٦-٥٣٩ ق.م)، (أخميني ٥٣٩-٣٣٠ ق.م)، (هلينستي ٣٣١-١٢٦ ق.م)، (فرثي ٢٢٧-١٢٦ ق.م ، دوای ئیسلام ئەوانە: سەلجوقی(٤٤٩هـ)، هۆلاكۆ(١٢٥٨ز، ئیلخانی(١٢٥٩ق، جەلائیری(١٣٣٧ق)، مەغۆل-جەنكیزخان-تیمورلەنگ(١٣٩٣)ز، قرەیوسف(١٤٠٢)، محمد شا(قرەقۆینلو١٤١١ز، سلیمانی قانونی١٤٣٢ جهان شا(١٤٤٥ز))، حسن كوێل(١٤٦٨ز، )، (آق قوینلو ١٤٦٨٥-١٥٠٨)، (الصفوية ١٥٠٨-١٦٣٧) في هذه المدة استولى على بغداد الزعيم الكوردي ذوالفقارين على بك سنة ١٥٢٧م، لكن بعد ذلك عادوا فارس وطردوا في سنة ١٦٣٣، و(الدولة العثمانية ١٦٣٨-١٩١٧)، (الأحتلال الأنكليزى في سنة ١٩١٧).. ينظر: أ- درويش مقدادي- تأريخ الأمة العربية-، ط٢ \١٩٣٢م، مطبعة معارف بغداد، ص٣٣٦ ·ب- العراق فى التاريخ ص٥٦٩.

لە (١٥٣٤ز، شاعباس(١٦٢٣ز، مملوك(١٧٤٩، هەریەكەلە زولفیقارو عبالرحمن پاشا ومحمدپاشای كوردو چەند جاری تر لە لایەن كورد داگیر كراوە...، تەنانەت لەكتێبە مێژوویی ئیسلامیەكان باس لەوە دەكرێ جارێكیان كەلە دزێكی كورد بەغدایان داگیركردوە(العبر في خبر من غبر - الإمام الذهبي ج١) ، لەسالی ١٩١٧ بریتانیا داگیری كرد، لەسالی ٢٠٠٣ئەمریكا داگیری كرد.... بەوجۆرە سەرجەم ٣٠ جار داگیر كراوە، بەشێكیان چوارجار دووبارە داگیریان كردوە

[٢٥٣] ـ بڕوانە: احوال العراق فى مرحلة المشروطيةالثانية ص١٥

[٢٥٤] ـ شەرەفنامە -ل سەت وحەفتاو چار

[٢٥٥] ٢/١٦١ /٧٣٠ CO " التماس المقدم من شعب كردستان الجنوبية —الان جزء من العراق ، كردستان هو وطن الكرد التاريخي: لم يكن كردستان حتى في عصور الخلافة الاولى وطنا للعرب ولم يخضع للحكم التعسفي العربي في عهد من العهود التاريخية. ما عدا بعض التواجد القبلي العربي القليل في اطراف كركوك واربيل ، ليس هناك في كردستان عرب او مناطق عربية. ولم يقهر العرب كردستان في عصر من العصور الماضية.

لم يكن الحاق كردستان في الكيان العراقي شيئا صحيحا او عادلا ولكن بما اننا لا نستطيع الان تصحيح الخطأ الا بتفكيك دولة ذات سيادة

دەهاتن، کچێکیان دەدا سەرۆك عەشیرەتێکی کورد و دەبونە خزم و دەهاتن وەك نمونەی برایم ئاغای مەخمور و ناوچەکانی حەویجە و زۆر شوێنی تر، یان بەشێویەکی تریش هاتوون، لەکاتی دوژمنایەتیەکی ناوەخۆیان بنەماڵەیەکی عەرەب پەنای بۆ لای عەشیرەتێکی کورد دەهێنا.. هەڵبەتە لەناو کوردانیش هەبو لە دەست دوژمنایەتی خەڵکێکی زۆر ئاوارە دەبون بۆ ناوچەکانی عەرەب، ئەوەی لە مێژوو باسکراوە یەك رووداوی شەڕێکە لە نزیك حەلەب تیایدا عەرەب کوردیان کوشتوە بە پێی ئەو بەڵگەنامەیەی خوارەوە[٢٥٦]، ئەوەی سەرنج ڕاکێشە ئەوەیە، عەرەبەکان لەنێو کوردەکان دەتوانەوە، کەچی کوردەکان لەناو عەرەبەکان هەر بە کوردی دەستوری کوردی دەمانەوە، ئەو پرۆسەیە تا سەرەتای سەدەی بیست هەروابوو، واتە زمانی عەرەبی و ئەدەبیاتی ئیسلامی عەرەبی کاریگەرییەکی سەلبی لەسەر دەستوری کوردەواری نەبوە لە قازانجی عەرەبی، بەلاّم لەدوای ١٩٢١ و هاتنی عەلمانیەت و هێزەکانی هاوپەیمانان کورد بەکۆمەڵ تواوە لەناو عەرەب و هەتا لەناو کوردستان لە شارێکی وەك هەولێر و کەرکوك بە تورکمان بون سەری هەڵدا، هەر لەدوای ئەوەش سنوری کوردستان هەروا بچووك دەبێتەوە.

سەرەڕای هەمو ئەوانەی سەرووش پەیوەندی کوردو عەرەب دژ بەیەك نەبووینە وەك ئێستا، ئەوناحەزیە لە دوای دروست بونی دەوڵەتی عیراقی بوە، لە ڕاستێدا کوردو عەرەب برابووینە بە درێژایی مێژوو لە چوارچێوەی (دارالإسلام)، ئەو برایەتیە کەوتە مەترسی لەوەتەی دەوڵەتی عیراقی دروست بوەو هەردوولا ناچار کراون لەو دەوڵەتە پێکەوە بژین بە ناهاوسەنگی وناتەبایی، هۆیەکەشی زۆر سادەیە پیشوو تر ئەوە گرنگ نەبوو کێ فەرمانڕەوایە، هەستیاری ئەوە کوردەو ئەوە عەرەبە نەبوو، هەمویان ئینتمایان بۆ ئاینێکی پان وبەرین هەبوو، بەلاّم لەدوای دروست بونی دەوڵەتی عیراقی ئەو پەیوەندیە ئاینیە نەما بوە ڕەچەلەکی ونەتەوەیی، کەواتە برایەتیەکە نەما بوە کیشمە کیشی نەتەوەی سەردەست وبن دەست ومتمانەو برایەتی تێك رووخا.

---

[٢٥٦] ـ سافر الأمير ناصر الدين بن المحسني بعسكر من حلب لتسكين فتنة ببلد شيزر بين العرب والاكراد قتل فيها من الاكراد نحو خمسمائة نفس ونهبت أموال ودواب وفيها في المحرم عزمت الأرمن على نكبة لا بأس فأوقع بهم أمير إياس حسام الدين محمود بن داود الشيباني وقتل من الأرمن خلقا وأسر خلقاً وأحضرت الرؤوس والأسرى إلى حلب في يوم مشهود فلله الحمد- تاريخ ابو الفداء

مەینەتی: چونی هێزێکی زۆری کورد بۆ ناوچەکانی شوعەیبە بەپێی فتوای زانایانی کوردبو، نیشانەی بونی دەسەڵاتی سیاسی کوردە لەپێش جاڕدانی حکومەتی شێخ محمود لە ١٩١٨، هۆیەکانی گەڕانەوەی ئەو هێزەش بریتی بوو لە:

١ـ خیانەتی عەشایر و ئەفسەر و عەرەبەکان بون لە بەرەکە.

٢ـ هێرشی روسیا و گەیشتنیان بە ناوچەکانی کوردستان و لەگەڵ خۆشیان جینۆساید و تاڵان و سوتان و وێرانیان دەکرد بەتایبەتی ئەو ئەرمەنیانەی چاوساغیان بون زۆر دڕندە بون.

٣ـ هەڵگیرسانی شۆڕشێك بەناوی (شۆڕشی مەزنی عەرەب) بە سەرکردایەتی (شریف حسین بن علی) و بە هاریکاری بەریتانیا توانیان جەزیرەی عەرەب و قودس و شام بگرن.

بەو شێوەیە ئەو بەرەیەی شوعێبە مانایەکی نەماو بەرگرییەکە تێکچوو، هێزەکانی شێخ محمود گەڕایەوەو بەریتانیاش بەرەبەرە سەرکەوت و لە ١٩١٧/٣/١١ بەغداش داگیرکردبەسەرکردایەتی (جنرال مۆد)، بەپێی ڕێنماییەکانی لەندەن روی لەلای کوردستان نەکرد، لەکاتی وەستانی جەنگ بە پێی (هودنەی مۆدرس لە٣١/١٠/ ١٩١٨)بەرەو لای موسڵ چوو لە سنوری عەشایرە عەرەبەکان نزیك شەرکات بوو، لەوکاتەدا (علی احسان پاشا) بەناوی سوڵتان لە ١٩١٨/١٠/٣٠ بروسکەیەکی بۆ شێخ محمود کردو هەمو مومتەلەکاتی عوسمانی ئەو ناوچەیەی بە سەربازگەکانی عوسمانیشەوە تەسلیمی دەسەڵاتی کوردستان کرد، بەو شێوەیە دەسەڵاتی شێخ محمود لە سلێمانی دان پیاهێنانی فەرمی و یاسایی پێکراو بە سنورێکی فراوان، لەسەر ئەو بنچینەیە حکومەتی پێکهێناو خۆشی ناونا مەلیك، دوای بەریتانیاش لە مانگی تشرینی ١٩١٨ دانی پیاهێناو سیفەتی (حوکمدار)ی پێ بەخشی[٢٥٧]، دەتوانرێ بگوترێ لەروی سیاسی و یاسایی (دان پیاهێنانێکی نێودەوڵەتی) بە حکومەتی کوردستان کرا پێش ئەوەی ئەو مادانە لە سیڤەر تۆمار بکرێ، لەوکاتەدا لە بەغدا هیچ حکومەت و ئیدارەیەك نەبوە، لەسەر داوای بەریتانیا خۆی و هەندێ خەڵکی لەناو ماڵان هێنا ناوی نان حکومەت.

[٢٥٧]ـ بەشێك وادەزانن ئەو سیفەتەی حوکمدار لەلایەن ئینگلیزەو بە شێخ محمود دراوە، لە ڕاستید زۆر پێش هاتنی ئینگلیز نامەکانی شێخ محمود بەناوی حوکمدار بوە، یەکەم جار، لەقەبی حوکمداری لە ڕێکەوتنامەکەی شێخ ئیدریس وسولتان سەلیم بە ٩ دەسەڵاتی کوردی ودرگیرا لە ١٥١٤

لەماوەی ١٩١٨ تا ١٩٢٠ لـە ئـەنجامی بـەرکری ١٩١٩ی کوردسـتان دژی ئینگلیـز و شۆڕشی ١٩٢٠ی ئیسـلامی خوارو و سەودای ناوەڕاستیش لەگەڵ ئینگلیز سـێ حکومـەت سـەری هەڵدا، دوو حکومەتی ئازاد لە سلێمانی و کەربەلا و حکومەتێکی کرێگرتـەش لـە بەغدا[٢٥٨]، هەریەکە لەو حکومەتانە ناسنامەو سـنور و ئامانجیـان جیـابوو، هاریکـاری و هاوتاییەکی زۆر هەبوو لەنێوان حکومەتی کوردستان و حکومـەتی کەربـەلا، حکومـەتی کوردستان سنوری کوردستانی بوو بە ناوەرۆکێکی ئیسلامی، حکومەتی کەربـەلا سـنوری عێراقیانەو عروبیانە و شتمانی نەبوو وەك مێژونوسە عروبیەکان وەسـفیان کـردوە، ئـەوان زیاتر مەبەستیان ەرکردنی ئینگلیـز بـوو لـەخاکی دار الاسـلام وەك محەمـەد رەزا شـبیب دەڵێت: ان الأحرار لمجاهدين ثابروا على التنكر لتلك الخطة الإستعمارية المرسومة، هـەروەها د فەیاز لەکتێبی(الثورة العراقية الكبرى) دەڵێت: لم تقتصرأهداف الثورة على الأمور التـي لها علاقة بالعراق بل كان تأثيرها في الوضع العام في مناطقَ متعددة من الشرق الاوسـط، هەروەها دەڵێت:( (لم نعثر على اية فتوى او رأي شخص ذي أهمية من الـشيعة يخـصص او يـشير الى ضـرورة تأييـد الرجـل الـشيعي علـى الدولـة العراقيـة المقترحـة ))[٢٥٩]، (مـس بيل)یش دەڵێت: إن هدف الثورة هو تأسيس حكومة اسلامية واعلنوا الجهـاد مـن اجلـها، لە دانوستانەکانیش(وەفدەکە: کوری محمد شيرازی ومحمد علی شهرستانی واحمد خراسـانی) و لەچوارچێوەی خواستی شۆرش ناوی عیراقی تێـدا نـەبوو، خواسـتەکان وەك دەق ئـەو ٣ خالەبو:

---

زۆر ناو لە شەڕوشۆڕەکانی ١٩١٩ی کورد دەنێن شۆڕش، بەڵام شۆڕش نەوەیە وڵاتـت داگیرکرابێـت و تـۆ هیـچت نـەبێ لـەنێو میللـەت لـە خواروورا دەست بە جموجۆل بکرێ و بزوتنەوەیەکی چەکداری دروست بکەی وەك لە خواروو کرا، بەڵام لە کوردسـتان حکومـەت و سـەرکردایەتی هەبوو بەرگریان لە کوردستان کرد تا داگیر نەکرێت.

[٢٥٨] ـ بڕوانە: الاسلام والعلمانية وأثرهما في نشأة الدولة العراقية الحديثة

[٢٥٩] ـ دفياض-الثورة العراقيه الكبرى ص٢٨٣

١ـ جلاء القوات البريطانية. ٢ ـ عفو عام عن الثوار. ٣ ـ اعادة المنفيين[٢٦٠]

لەگفت وگۆیەکانی کیرزۆن وعیسمەت ئینینیۆ دەردەکەوێ، کە بەریتانیا چەندە بە خەم دروستکردنی عیراق وپێك وەنوسانیەتی[٢٦١]، بە پێچەوانەی بۆچونی شۆرشی بیست وزانا ئاینیەکانی سەرکردەی شۆرش کە پێك هاتبو لە ١٠ زانا[٢٦٢]، (میس بیلی)یش لەکتێبەکەی(رسائل مس بل)دەڵێت سەرکردەکانی شۆرشی بیست دەمارگیری ئاینیان هەبو نەك نیشتمانی وعروبی، لە بەڵگەنامەیەکی وەزارەتی دەرەوەی هند بەژ: ٥٩٩٨ دەڵێ لەکاتی گەڕانی برسی کۆکس بەلێواری فوراتا لە١٩١٧/١٢/١٣ بروسکەیەکی بۆ هات لە لایەن سێ زانای پایەبەرزی ناوچەکە (محمدیەزدی لەنەجەف، میرزا شیرازی ـ سەرۆکی شۆرشی بیست ـ سامرا، مازندەرانیش لە کەربەلا) دەرکەوت ئەوانە نارازین بە رەفتاری بەریتانیا بەرامبەر ئیران[٢٦٣]، لەو بارەیەوە د فیاز دەڵێ: (لم نعثر على اية فتوى او رأي شخص ذي أهمية من الشيعة يخصص او يشير الى ضرورة تأييد الرجل الشيعي على الدولة العراقية المقترحة))[٢٦٤]،

لە دانوستانەکەش داوای بەشێك لە ناوچەکە یان سەربەخۆیی ودەوڵەتیان نەدەکرد وەك علي الوردي: إن شعار الثورة هو (لا مفاوضة قبل الجلاء وإذا أرادوا المفاوضة فعلى الإنكليز أن يذهبوا الى الفاو ومن هناك يرسلون إلينا مندوبهم للمفاوضة معنا)[٢٦٥]، هەرگیز داوای عێراقیانەیان نەبوە کەچی زۆربەی هەرە زۆری کتێبەکانی عەرەب باس لە دروست بونی دەوڵەتی عیراقی وشۆرشی بیست پێکەوە دەکەن، گوایە عیراق بە خەباتی نیشتمانی دروست بوە، لەو بارەیەوە با ئەو دەقەی د. وردی نەقل بکەین: جاء من جانب أكثرية المؤرخين العراقيين بأن الوفد المفاوض (من جانب قادة الثورة)طلب إستقلال العراق!، بينما في رواية(هيات ـ الضابط البريطاني المفاوض) لم يأت أي ذكر لهذا الإستقلال[٢٦٦]

٢٦٠ـ كوتلوف - ثورة عشرين ص١٨٧

٢٦١ـ بڕوانە: تقرير ولاية موصل ص٤٢

٢٦٢ـ بڕوانە: الإسلام والعلمانية..ص١٨٦

٢٦٣ـ د.فاضل البراك - دور اليهود..ص١٠٣

٢٦٤ـ د. فياض ص٢٨٣

٢٦٥ـ د.وردی... ج٥ص٣٣٣

٢٦٦ـ هەردوو ریوایەت لە: د وردی... ج٥ص٢٢٨-٢٣٠ بخوێنەوە.

سەرکردەکانیشیان بە دەگمەن عەرەبێکی لێ نادۆزیەوە، بە سەرکردایەتی شێخ شعلان ئەبولجۆنیش نەبوە، بەڵکو بە سەرکردایەتی (أ.محمد شیرازی) بو، لەگەڵ سەرکردایەتیەك کە پێکهاتبوو لە: محمد تقی مرزا الشیرازی، دەورە مەرجەعی شیعەی عراق وئێران و هندو لبنان و کەنداو، بە رەچەلەك ئیرانیە[٢٦٧]، لە ١٩٢٠/٨/١٧ مردو شۆرشیش بەردەوام بوو، بۆیە شۆرشەکەی خستە ئەستۆی (شیخ فتح الله ئەسفهانی)[٢٦٨]، لە سەرکردەکانی تریش: محمد مهدی مەولەوی ـ خەڵکی هند بوو، مهدی الخالصی یەکێ لەسەرکردەیەکی بەهێزبو، (مس بیل دەڵێت: لە بنەچەدا(خوراسانین)[٢٦٩]، بە هەمان شێوەش هەریەکە لە: هبە الدین الشهرستانی وابو القاسم الکاشانی وعبدالکریم الجزائری[٢٧٠] مرزا احمد خراسانی، حسین قزوینی، عبدالحسن شیرازی[٢٧١]

لە ١٩٢٠/٨/٢٥ حکومەتی شۆرش یەکەم هەڵبژاردنی دیموکراسیانەیان کرد، چەندین شاندو ئەنجومەنی ئیداری وسیاسیان دروست کرد، لەوانە:١ ـ ئەنجومەنی شارەوانی ٢ ـ ئەنجومەنی ئیدارەو جێبە جێکردن ٣ ـ ئەنجومەنی زانستی کە پێك هاتبوو لە(١٤) زانابە رابەرایەتی (شیخ الشریعە) بۆ چاودێری وسەرپەرشتی شۆرش و حکومەت، شیرازیش رابەری گشتی بو تا مردن[٢٧٢]

دوای بەریتانیا بەسەر هەردوو حکومەتی کوردستان و کەربەلا زاڵ بوو و لەنێوی بردن، حکومەتی بەغداشی پتەوکرد، هەروەك لە رێکەوتنی سان ریمۆی ١٩٢٠ دەستکاری نەخشەی سایکس ـ بیکۆ کراو ویلایەتی موسڵ (بەکوردستانیشەوە) لە بەشی (B)ی پشکی فەرەنسی خرایە سەر بەشی (A)ی بەریتانی، دوای لەمادەی (٩٥)ی سیڤەر جێبەجێکرا، ئینجا ئەوەی پێی دەوترێ (کێشەی ویلایەتی موسل)لە١٩٢٥/١٠/١٦بە زەبری بەریتانی بەیەکجاری خرایە سەر عێراق و وەك لە (تقریر ولایە الموصل ص١٠) هاتوە دەڵێت: ولایەتی موسل لە چوارچێوەی سازشێك کرا کە ویلایەتی موسل ببتە مولکی عیراق و لە بەرامبەریشدا بەریتانیا واز لە بەڵێنەکانی سیڤەربێنێ وکوردستانی

---

[٢٦٧] ـ مذکرات محسن أبو الطبیخ ص٦٠
[٢٦٨] ـ وردی... ج٥ص٣٠٩
[٢٦٩] ـ مس بیل... ص٤٤١
[٢٧٠] ـ فیاض... ص٢٧٥
[٢٧١] ـ وردی- ص٢٩٤
[٢٧٢] ـ أـ وردی... ج٥ص٢٩٢ ب- العراق... ج١ص١٦٦ـ١٦٧

سەروبۆ تورکیابە جێ بهێڵی، ئەو هەنگاوەڵە دیوی عیراق لەڕێکەوتنەوە بەهۆی ئامرازی سەربازی خستە سەر حکومەتی بەغداو برسی کۆکسی (حاکمی بەریتانیا لە عیراق) بەنوسراوی فەرمی ژ:٣٣٣٠/٤ی ٢٢/٢/ ١٩٢١ فەرمانی دابو بە حکومەتی تازەی عیراقی تا کوردستانی خواروو بخەنە سەر عیراق، بەو شێودیە لە خوارووش هەوڵ و تەقەلای کورد ڕوبەڕوی پلانێکی نێودەوڵەتی مەزن بۆوەو لەگەڵ سەرکەوتنی بەریتانی و تەوەری عەلمانی بە سەر شۆڕشی ئیسلامی خوارو و کوردستان مەینەتی کورد بە یەکجاری دروست بو.

ئیتر کوردستان لەنێو نەخشەی سیاسی جیهانی ناوی کوژایەوە روبەروی دۆخێکی نوێی وابۆوە لەمێژوی خۆی نمونەی نەبو، زۆرجار داگیرکراوە بەڵام نەجارە داگیر و دابەشکردن بو بەپێی (ڕێکەوتنی نێو دەوڵەتی) و (سەروەری دەوڵەتی هاوچەرخ)، واتە کوردستان بوە بەشێك لە مولك وسەروەری (یاسایی) دەوڵەتی داگیرکەر، بۆیەش زاراوەی مەینەتی هەڵدەگرێ، هەربۆیەش ئەو چارەسەری و بەڵێنانەی پێی درا شکستی دەهێنا، چونکە دەنگی تایبەتی خۆی لەنێو دەوڵەتی نەبوو، لەڕێی حکومەتی عێراقی بو کە ئەویش دۆست نەبوە، ئیتر لە باشترین دۆخیدا مافەکانی کەوتە چوارچێوەی دەوڵەتی عیراقی، لەو بەڵێنانەش لە کۆنگرەی قاهیرە (لیژنەیەکی ٤کەسی ـ کۆکس، مس بیل، لۆرانس، یۆنگ، بابکۆك، میجر نۆئیلیش وەك ئەندامێکی ڕاوێژ) بۆ مافی چارەنوس لە ژێر ڕۆشنایی سیڤەر دروستکرا)[٢٧٣]، ڕێدرا حکومەتی کوردستانی لە چوارچێوەی عێراق هەبێ، ئەو واقعە قانونیە لە مادەی ١٦ی لائیحەی ئینتداب لەسەر عێراق دەقەکەی بەو شێودیە هاتوە: المادة ١٦: لا شيء مما في هذا الانتداب، يمنع المنتدب من تأسيس حكومة مستقلة إدارياً، في المقاطعات الكردية، كما يلوح له ...[٢٧٤]

دوای (عصبة الأمم) لەوەڵامی سکالایەکی کۆمەڵێك سەرکردەی کورد لە ڕێنماییەکی تایبەتی بۆ بەریتانیای دەوڵەتی(ئینتداب) نارد کەبریتی بوو لە ٣ مادە تیایدا لەمادەی دووەم داواکرابوو حکومەتێك بۆ کورد پێك بهێنرێت وچیتر بە هەڵە لێکدانەوە بۆبڕیاری

---

[٢٧٣] بڕوانە: قضية الكردية في صراع البريطاني العراقي ص١٩٤ لەو لیژنەیە تەنهایۆنگ ونۆئیل لای کورد بوون.

[٢٧٤] دەقی لائیحەی ئینتدابی عیراق لە پاشکۆی ژ:٢ لەکۆتایی ئەو نوسینە.

ڕۆژی١٦/١٠/١٩٢٥ نەکرێ[٢٧٥]، لەوەش زیاتر لە بەڵگەنامەکانی بەریتانی زیاتری لێهاتودو دەڵێ بەردەوام (عصبة الأمم)داوای لە بەریتانیا کردوە کەولایەتی کوردستان سەربەخۆ بێت لە ژێر ئینتداب ـ بروانە ئەو بەڵگەنامەی خوارەوە[٢٧٦]، لەبەیانەدوقۆڵیەکەی بەریتانی عێراقی لە٢٨/تشرینی دوەم/١٩٢٢دیسان دان بەو مافە هێنرا[٢٧٧]، دوای تا ساڵی ١٩٣٢ چوار ڕێکەوتنی ناوای دووقۆڵی کرا جارجار مافی کورد سوکتر دەبووو لە ڕێکەوتنەکان ناوی نە دەهات، بەتایبەتی ئەو ڕاپۆرتەی بەریتانی سالی ١٩٣٢بۆ ئەوەی عیراق ببتە ئەندام لەعوسبە[٢٧٨]، بە هۆی ناڕەزایی کورد وڕووداوەکانی بەردەرکی سەرابۆ

---

[٢٧٥] ـ دەقی بڕیارەکەی (عصبه الامم) لە ل٤٥٧ی (المشكلة الكردية فی الشرق الأوسط) بخوێننەوە.مەبەست لە بڕیاری ڕۆژی ١٦/١٠/١٩٢٥ئەو بڕیارەیە کە ولایەتی موسل خرایە سەر عیراق بەپێی لیژنەکەی عوسبە.

[٢٧٦] الكتاب معنونة الى ر.جيب سليد ضابط الجناح دائرة استخبارات القوة الجوية الملكية البريطانية
مقر القيادة، ذربيان الحركة القومية الكردية
رغم وجود بعض الأختلافات المحلية و الأجتهادات الشخصية، هناك قناعة راسخة و مشتركة بين جميع الفئات الكردية بأن الحكم الذاتي المفروض على الكرد بفضل قوات الجيش العربية امر غير ممكن و لا يمكن القبول به. و انهم لا يستطيعون التخلي من فكرة تراودهم دوما بأن عصبة الأمم طلبت بريطانيا ان تحكم الكرد ضمن نظام الأنتداب و ان يكون هناك "ولاية كوردستان المستقلة" ضمن العراق و تتعامل مع الحكومة بوجود المندوب السامي البريطاني الذي يكون كحلقة الوصل بين الكرد و الحكومة المركزية و تكونت ادارة كل الأمور الداخلية بيد الكرد.....

[٢٧٧] ـ ئەوەش دەقی دان پیاهێنانەکەبە، (( تعترف حكومة صاحب الجلالة البريطانية والحكومة العراقية بحق الكورد الذين يعيشون داخل حدود العراق فی اقامة حكومة كوردية ضمن هذة الحدود ، وتأمل الحكومتان ان العناصر الكوردية على اختلافها ستتوصل باسرع مايمكن الى اتفاق فيما بينها حول الشكل الذى ترغب ان تقوم تلك الحكومة وحول الحدود التى ترغب ان تمتد الية وان يرسلوا موفدين ذوى صلاحيات الى بغداد للتداول فی العلاقات الا قتصادية والسياسية مع حكومة صاحب الجلالة والحكومة العراقية )) سروة ..كوردستان ص٢٤٥.

[٢٧٨] ـ لەڕاپۆرتەکەی بریتانیا وای باسی عێراق کردبوو کەلە هەموبوارەکان چوویتە پێش وشایستەی ئەوەی هەیە بەرپرسیاریەتی دەولەتی عیراقی پێ بسپێردرێ، کەچی وانەبوو، ئەوەش بەلگەکانی چەرتی ئەوڕاپۆرتەیە کەدەقەکەی لە (الاسلام والعلمانية واثرهما فی نشأة الدولة العراقية الحديثة)باسمان کردوە بەو شێوەی خوارەوە: هذا التقرير لا يعكس الصورة الحقيقية لوضع العراق، ولايلبی شروط القبول فی عصبة الأمم، وكذلك يحتوى على نواقص اساسيه كالآتی:

أ- عناصر الدولة فيه ناقصة، بخلاف شروطه، فأن الشعب متفكك والأقليم عبارة عن أوطان مختلفة، والحدود غير واضحة، والسيادتي الداخلية والخارجية ناقصة ومختلة، اما السلطة في أقليم ضعيفة ولا تملك مقومات الدولة، وكان رأي بريطانيا الحقيقية غير ذلك الذي كتبته في هذا التقرير الى عصبة الأمم، وخير دليل على ذلك التقرير الذي أرسله (هنری دوبس) المندوب السامي البريطاني في العراق –الى حكومته-، حيث جاء فيه ((أني أعتقد عند أنسحاب بريطانيا من العراق تتلاشى الحكومة العراقية خلال أشهر، او تبقى بشكل بائس في شريط حدودي بين السامراء والكوت، بينما تنشق المناطق الأخرى)) ، وأيد (ملك فيصل) ذلك بأكثر منه

ب ـ لم يشر التقرير الى محاولات فصل الجنوب وولاية البصرة وكوردستان من العراق المقترح. ومجموعه أخرى من مشاكل الداخلية.

ج ـ ولم يعطي التقرير المذكور أرقام وأحصائيات حقيقية حول تحريم الشيعة والكورد من الحكم، هكذا بقيت الدولة العراقية حتى عام (٢٠٠٣م) ولم يسلم اي كوردياً ولا شيعياً منصب رئيس الجمهورية، بينما يشكل الكورد والشيعة اكثر من ٧٥٪ من سكان العراق.

وبدورها تجاهلت عصبة الأمم توصيات لجنتها التي شكلت من أجل مشكلة ولاية الموصل عام ١٩٢٤ حيث أوصت ببقاء مدة الأنتداب ٢٥ سنة فيه ، بسبب عدم أهلية الدولة في العراق ، كذلك تجاهلت العصبة شروط العضوية (لاسيما الجانب القانونى) فيها.

ع ـ منذ تكوين هذه الدولة إنعدم الأستقرار فيها، ولم يتطرق التقرير البريطاني الى ذلك، والعصبة بدورها تجاهلت التعهدات العشر التي أخذتها من الدولة العراقية، حيث خرق معظم موادها من قبل العراق.

ومآخذ أخرى كثيرة من التقرير...

به ئەندام بون لە (عصبە الامم) (١٠) بەڵێننامەی لێ وەرگیرا، بەڵێننامەی (٩ و١٠) تایبەت بو بەکورد.. بەڵام بەو دۆخەی کە کوردستان وەك هەرێم بتوێتەوە لەناو عێراقدا بەو بەڵێنانە چارەسەر نەدەبوو وەك نەبوو، چاکترینیان ئەو پێشنیارەی لیژنەی نێوڕۆی ویلایەتی موسلی (عصبة الأمم) بوو داوای کرد ئەگەر فاکتەری ڕەگەزی بنچینە بێ بۆ یەکلاکردنەوەی ئەو کێشەیە ئەوا هەق وایە حکومەتێکی کوردی لێ دروست بکرێ[٢٧٩]، ئەگەر ئەوەش ناکەن دەوڵەتی عێراقی لەو تاستە نیە میللەتێکی تری بخرێتە ژێر بەرپرسیاری، بۆیە پێشنیاریان کرد کە عێراق بۆ ماوەی ٢٥ ساڵ لەژێر ئینتدابی (عصبةالامم) بمێنێتەوە[٢٨٠] تا ئەو ساتەش لە چوارچێوەی عێراقدا ئەو پێشنیارە لە هەموی باشترە کە دەوڵەتێك بێت سەربەخۆیی تەواوی نەبێ سوپا و مەرکەزیەتی نەبێ مولکی(مەحمیە ـ لە ژێر ویسایە)ی نەتەوە یەکگرتوەکان بێت.

## کەواتە کوردستان چی بەسەرهات؟

لەروی سیاسی و یاساییەوە خاوەنی هەرێم و خاکی خۆی نەما، خرانە سەر عێراق (هەروەها نمونەی تورکیای نوێش هەروا) بە میللەتەوە کە توخمەکانی بون بە دەوڵەتی هەبووە، بێ ڕێکەوتن خرانە نێو زیندانی دەوڵەتێکی تر، نمونەی ئەو جۆرە دەگمەنانە کەم بو لە جهان، قوبرس ولبنان وەك میللەت (نەك وەك هەرێم) تارادەیەك.. بەڵام ئەوەی وەك کوردستان دوو هەرێم و دوو میللەت پێکەوە دەوڵەت پێك بهێنن (چیکۆسلۆفاکیا بوو(چیك و سلۆڤاکیا). یۆگسلافیاش کە پێکهاتبو لە: سربیا، کرواتیا، بۆسنەو هرسك، مۆنتیگرۆ(جبل الاسود)، کۆسۆڤا.. ئەوەی دوای شێوە مەرکەزی بێ ڕێکەوتن بوو لەدوای (تیتۆ) هەڵوەشایەوە، بەڵام نمونەی دروست چیکۆسلۆڤاکیا بو کە لە دوو میللەتی ٦٦٪ی چیك و٢٨٪سلۆڤاك، قوبرسیش بە پێی دەستوری ١٩٥٩ تەوافوقیانە رێك کەوتن لە سەر بنچینەی ڕێژەی پێکهاتەیی، بە جۆرێك ٦٠٪کبرسی یۆنانی وباقیەکەی تر تورك وکەمایەتی ترن سەرۆك کۆمار یۆنانی جیگری تورك، ٣٥پەرلەمانتار بە ١٥، ٧ بە ٣ وەزیر، لبنان وئیماراتیش ئاوا دابەشکراوە.

---

[٢٧٩] ـ تقریر ولایة موصل ص١٠ بەڵام لەراپۆرتە ئەسلیەکەی ص١٥٤؛

[٢٨٠] ـ دوو جار ئەو پێشنیارە لەراپۆرتی ویلایەتی موسل هاتوە ـ تقریر ولایە موصل ص٢٢٠

هەنگاوی دروست لەپاش مەینەتی ئەوەیە: دەوڵەتیکی) کوردی ـ عەرەبی ـ یا خود باشتر لەوە لە هەر سێ پێکهاتە پێك بێت ومافی تورکمان وئاشوریو ئەوانی تر ڕەچاو بکرێت) لەو ناوچەیەی ئێستا پێی دەوترێت: عیراق دروست بکری لەسەر بنچینەی ڕێکەوتنی ئارەزوو مەندانە، تیایدا ناوی دەوڵەت وئالاکە وەك (چیکۆسلۆڤاکیا) گوزارش لە هەرسێ پێکهاتە بکا لەدابەشی دەسەڵات و دەستور... بۆ ئەوەی لایەك زال نەبێ بەسەر لایەکی تر، ئەو ڕێکەوتنە لەدەستور زامن بکری و نەتەوە یەکگرتووەکانیش لێی بەرپرسیار بن، ئەوە چارەسەریەکە ئەگینا چارەسەری بەڕاستی مافی چارەنوسە

## کەواتە کەی مەینەتی کورد دروست بوو؟ بەرپرسیارەکان کێن؟

بەکورتی لەنێوان١٩٠٨ـ١٩٢٤مەینەتی کوردی تیا دروست بوو لەو ماوەیەشدا ئەوانە ڕویدا:

١- ئینقلابی اتحاد الترقی لە ١٩٠٨ ی عەلمانی تۆرانی بەسەر ڕەوتی عوسمانی.

٢- ڕێکەوتنامەی سایکس بیکۆ ١٩١٦ و دابەشی ناوچەکەو کوردستان لەسەر دەستی هاوپەیمانان.

٣- هەلگیرسانی جەنگی جیهانی یەکەم لە ١٩١٤ ـ ١٩١٨ و سەرکەوتنی هاوپەیمانانی ڕۆژ ئاواو شکستی عوسمانی تیایدا و دابەشکرانی.

٤- سەرهەلدانی دەوڵەتی تورکیای عەلمانی هاوچەرخ لە ١٩١٨ — ١٩٢٢ لەجێ ی دەوڵەتی عوسمانی و هەلوەشانەوەی بەیەکجاری لە ٣ ـ ٣ ـ ١٩٢٤، بەهەمان شیوەش سەرهەلدانی دەوڵەتەتی عیراق و سوریا و... لەونێوانە.

٥- هاتنی دام و دەزگای عەلمانی لەجیاتی ئیسلامی وەك دەستور و ئەنجومەن و پرۆگرامی فیرکردن، لەسەر ئاستی جهانیش پەیدابونی ڕێکەوتنامە نێو دەوڵەتیەکان ویاسای نێو دەوڵەتی و (عصبة الأمم) و پەیوەندی نیو دەوڵەتی و... هتد

کەواتە زۆر بەزەقی دەردەکەوی عەلمانیەت لەمەینەتی کورد بەرپرسیارە بەهەر سێ تەوەری جهانی و ئیقلیمی و ناوەکی بەشێوەیەك کە:

١- عەلمانیەتی جیهانی بەرپرسیارە بەهۆی ڕێکەوتنی سایکس بیکۆ ١٩١٦ تالۆزانی ١٩٢٣ و دابەشی ناوچەکە و دوای داگیر کردنی و دابەش کردنی بەفەرمی وخستنە سەر عیراقی تازەو ئەوانی تر.

٢- عەلمانیەتی ئیقلیمی کە بریتیە لەبزوتنەوەی تورکیای لاو ١٨٦٥ بەسەرۆکایەتی مدحت پاشا تادەگاتە بزوتنەوەی کەمالی و دروست بونی تورکیای عەلمانی.

٣- عەلمانیەتی ناوەخۆ بریتین لە و سەرکردە کوردانەی کە هاریکاری ئتحاد الترقی و کەمالیان کرد.

بۆ ئەوەی کورد دۆست و دوژمنی خۆی بناسی دەتوانین هەمو ئەو کەسایەتی و لایەن و مدرسانەی دیاری بکەین کە ڕۆڵی سەلبی بینی لە کاتی دروست بونی مەینەتی کوردی و ئەوانەی ڕۆڵی ئیجابیشیان بینی:

باشەکان: میجر نوئیل، میجرروس، چەرچل، ئەدمۆند ئەلینی، ئەرسەر فرنج، کالسپۆرت، مسیولی، یۆنگ، عقید لۆرانس، کیرزۆن، ج ڕۆمبلید، فیتیفگیۆ، ریتشارددۆب، کالسرۆپ، سی سی ویل، کۆرنەوالیس، گۆلدسمیپس، لویدجۆرج، (چوار باشەکەی کۆنگرەی قاهیرە:چرچل، یۆنگ، نۆئیل، تی لۆرانس)، ئەدموندکلینی، مدرسەی ئەهلی قاهیرەی (بەریتانی)، لیژنەی (کینگ کراین)ی ئەمریکی [٢٨١]، بوغوس پاشای ئەرمەنی، سولتان محمد واحد الدین، فرید پاشای باب العالی، محمد شیرازی (سەرۆکی شۆرشی بیست) توینبی میژوو نوس، شۆرشەکانی سەنوسی ومەهدی وخەتابی مەهدیە وشازلیە وبادیسیە و شۆرشەکانی شیخ عبدالقادر وعمر المختار وعبدالکریم خەتابی لە ئەفریقیا و شۆرشی بیست لەخوارووی عیراق....

خراپەکان: ویلسون، برسی کۆکس، مس بیل، ئەوانە هەرسێك نوێنەری بەریتانیا بون لەبەغدا، هنری دۆبس، سیر ف همفری(سەرکردەی گشتی هیزە چەکدارەکانی عیراقبوو)، لچمان، تۆماس هۆهلەر، هنری دۆبز، شیپارد، دی ڕۆبیك، لورد کرزن، کلایتۆن، میجر سون، لونکرینك، میجر ئاهی، ماکماهون، میجر راندی،

[٢٨١] - ئەو لیژنەیە لەلایەن ویلسۆنی سەرۆکی ئەمریکا نێردرا ڕۆژهەلاتی ناوەراست پێك هاتبوو لە (هنری چەرال کینگ لەگەل چارلز کراین ، لەسالی ١٩١٩ بۆ یەکەم جار چاویان بە سەرکردایەتی کورد کەوت وبەو نەخشە دابەشیەی کوردستان و سایکس پیکۆ قایل نەبوون

نوێنەرەکانی بەریتانیا لەئیران، مدرسەی بەغدای ئیمپرالی بەریتانی، اتحاد الترقی، تەیاری تۆرانی، ئەتاتورك، لینین، ستالین، بریجنیف، ملك فیصل، حزبی الفتاه العربی، تەیاری عروبی، لەکوردەکانیش مستەفا دەرسیمی، مراد پاشا، دیاب ئاغە، رەهبەری برازای سیدرەزا، قاسم بك جویرانلی، حاجی شکری بەگ، حسن خەیری، مچۆ ئاغە، مستەفازکی بەگ، برنجی زادە، زولفی بەگزادە، رامزبەگ، جعفر عسکری، ئینینۆ، زیائەلب، لوتفی فکری، جاریش وابوە هەندێك لەوانە (کوردەکان وبەریتانیەکان) هەلوێستی باشیان هەبوە یان لە دوایی گۆڕاوە.

# بەشی چوارەم

# هۆی ڕاستەقینەی بە دەوڵەت نەبونی کورد

## ئەو هۆکارانەی لە لایەن زانایان باسی کراوە

دیسان ئەوەی ئەو بابەتە دەشێوێنێ وهۆی ڕاستەقینەی پێ نادۆزرێتەوەلەسەر کۆمەڵێك چەمك ونەکزیۆمی هەلە بینای توێژینەوەکەی دەکا، لە هەمویان ترسناك تر دەستەواژەی: مێژووی کورد هەر چەوساندنەوە بووە...، هەرچی دەست دەداتە قەڵەم یەکسەر دەنووسێ: بەهەزاران ساڵە کورد دەچەوسێتەوە، یان دەڵێ بەدەیان هەزار ساڵە عەرەب ئێمەی داگیرکردووە یان فارس... ئەو چەمکانە بێگومان هەڵەن، جارێ لەمێژوودا تا لەسەردەمی هاتنی ئیسلامیش هیچ بەڵگەیەك نییە عەرەب هاتبێ کوردی چەوساندبێتەوە، یان عەرەب حوکمی لەسەر کورد کردبێت، تەنها لەسەردەمی عەباسی و ئەمەوی، ئەویشبەو شێوەیە نەبوە، پەرتووکی گەورەی ﴿الملل والنحل والاعراق﴾ زۆر بەوردی باسی ئەو دوو سەردەمە دەکا، دەڵێت: سەردەمێکی ناخۆشی هەمو میللەتان بو بەڵام میللەتی کورد وەزعی باش بوو، تەنها بەلێنێکی زارەکی یان نوسراویان بە(قاسدێك) دەنارد بۆ خەلیفە دەیان گووت: ئێمە لەگەل تۆین، بەڵگەیەکی بەهێزمان هەیە کە هێزی عەباسی و ئەمەوی نەگەیشتە کوردستان ئەویش ئەوکاتەی ئەمەوییەکان زۆر بەتووندی لەبنەماڵەی پێغەمبەریان(د۔ خ) دا، زۆربەی سەیدەکان لەهیچ شوێنك جێیان نەددبۆوە، یان بە فراوانتر بڵێین معارەزەی دەسەڵات هەڵدەهاتن بۆ کوردستان نیشتەجێ بون، یان (هاتنی خەواریجەکان بۆ کوردستان کە لەکوردستانەوە هێرش دەکەنە سەر دەوڵەتی ئەومەوی وعەباسی)، کەواتە ئەو گۆتانەی دەووترێت کورد چەوساندراوەتەوە لەمێژوو ڕاست نین، جیاوازی حوکمی ئیسلامیان (لەگەل ئەو هەمو سەلبیاتەی هەشیبوە) لەگەڵ سیستەمەکانی تر لەوەیە کە مەرکەزیەت دووری نەبووە، بۆنموونە لەڕۆم ئەوان

سەرۆك بون یان لە ساسانی فارسەکان بون یان لە فیرعەونییەکان...هتد، مەرکەزییەت هەبوە لەناوچەو جوگرافیاو دانیشتوان، بەلام لەئیسلامدا وانەبوە، سەردەمێك پایتەخت لەمەدینە بووە، دوای چۆتە کوفە، دواتر چۆتە دیمەشق، بغدا، قاهیرە، ئەستەمبۆل، ئیران، ئەندلوس...هتد

ئینجا دەسەلاتی ئیسلامی لەناو میللەتێکیش قەتیس نەماوە، سەرەتا لەدەست عەرەب بووە دوای حوکم کەوتە دەست سەلجوقییەکان، دوای ئەیوبییە کوردەکان، دوای مەمالیکەکان و عوسمانی وسەفەوی و...هتد.

کوردیش لێرەوە دەوری خۆی دیوە، توانیویەتی نزیکەی (١٠٠)سال میراتی دەسەلاتی ئیسلامی بگرێتە دەست، جگە لەوەی دەوڵەت و میرنشینی کوردی فەرمانڕەوایی کوردستانیان کردوە، کەواتە کورد شتێکی کەم نەبووە ئەگەر زیاتریش نەبوبێت، ئەو گەلالەیەش وێنەیەکی وا نەدا کە هەرگیز کورد دەوڵەتی نەبوە، بەڵکو مەبەست دەوڵەتی مۆدیرنە.

مێژووی زوڵم لە کورد لەسەدەی ٢٠ەوە دەست پێدەکات، لە هەمو مێژویدا بە ئەندازەی دوای سەدەی بیستەم نەچەوسایتەوەو داگیرنەکراوە، کەواتە ئەم بۆچونە ڕاست نیە و حوکم لەسەر مێژو دەکات بە پێی واقعی ئێستا، زۆریش باوی هەیە لەبەر ئەوە ئەگەر ئەم بۆچونە ڕاست بێ کەواتە ئێمە ئەو ڕزگارییەی دەمانەوێت مانای نییە. ئەم داواییەی لە ولاتانی دراوسێ تورکیاو عێراق و ئێران وسوریا دەیکەین نارەواییە، ئەگەر هەزاران ساڵ چەوسابیتەوە تازە داوا لە کێ دەکەیت.

ئینجا چۆن دەست نیشانی مافی خۆت دەکەی، بە پێی ئەو بۆچونە حەق بە بەغداو دیمەشق و تهران و ئەنقەرە دەدەی کە مافمان نەدەنێ بلێن: ئێوە تێك دەرن.

پێش سەدەی بیستەم چەوساندنەوە هەبوە، بەلام چەوساندنەوەی نەتەوەی نەبوە، ڕەنگە کورد غەدری لێکرابێ تالان کرابێ کوشتاری لێ کرابێت، کوردیش وای لەعەرەب و وخەلکی تر کردووە، هەریەکە خۆبەخۆش وایان لێك کردوە، خەلکی دیکەش وای بەسەر هاتووە،لەکتیبە میژوویەکانی( طبری وابن کثیر ومقدسی..) باسی زولمی کورد کراوە لەخەلکی تر،لە (وفیات الأعیان)دەلی لەشەڕێکدا کورد ٢٠٠٠ئافرەتیان لە عرب وفارس

ئەنفال کرد، واهاتووە: **وافتض الأكراد مائتي بكر من أهل البيوتات وحملوا معهم نحو ألفي امرأة إلى بلادهم**

ئەگەر بێینە سەر نێوان کوردو عەرەب رەنگە نزیکەی (٣٠) جار بەغدا داگیرکرابێت، زۆربەی نەتەوەی تر داگیری کردوە کوردیش سێ تاچوار جار داگیری کردووە، نمونەیەك نییە لەمێژو عەرەب هاتبێ هەولێرو سلیمانی داگیر کردبێ، کەواتە لەپای چی ئەم سەروەرییە دەدەیتە عەرەب دەڵێی هەر ئێمەیان چەوساندۆتەوە، کەواتە بەو بۆچونە بێت باوك و باپیرانمان ترسنۆك بونە.

ئەگەر بێیتە سەر راستی کە چەوسانەوەی کورد لەسەرەتای سەدەی بیستەمە هەقەکە دیارە، ئەو کات دەڵێ: ئەوە ئەوانە بەرپرس بون حەقە کەم لەلای ئەمەیە لە روی ویاسای و شەریعەتی رونە.

راستیەکەی ئەوەیە سەرەتای دروست بونی مەینەتی کورد بۆ سەرەتای سەدەی (٢٠) دەگەرێتەوە، کاتێك دەوڵەتی هاوچەرخ بەپێ یاسای نێودەوڵەتی دروست بون لە پاش جەنگی جیهانی یەکەم، لەو کاتەوە مەینەتی کورد دروست بوە هەر بۆیە مێژوی جوڵانەوەی کوردیش ئەوکاتە دەستی پێکردووە، کەواتە ئێستا دەزانین کێ بەرپرسە وە مافەکانمان لەلای کێیە وە هۆیەکانی دروست نەبونی دەوڵەتی کوردی چیە، نابێتە نەزەری جودا جودا وەك لە خواردوە بە پاڵپشت بەو بۆچونە لەنگەی سەروەوە بەکورتی هۆیەکانی دروست نەبونی دەوڵەتی کوردی باس دەکەین، دەڵێن چونکە:

١ـ کوردستان سنورەکانی داخراو بودو کەوتۆتە نێوان عوسمانی وسەفەوی واتە لایەکی لەسەر ئاو نەبووە بۆیە نەبویتە دەوڵەت[٢٨٢]

٢ـ لەکۆنەوە هەر چەوساوەتەوە وژێر دەستە بوە..

٣ـ زۆر عەشایرو دواکەوتوو بووە، میللەتەکەی رەوەند بووینە..

---

[٢٨٢] ـ ئەو راپۆرتە لەنێوان ئەرمەنی وبەریتانی هۆیەکانی بەدەولەت نەبوونی کورد باس دەکا: جمهورية أرمنية السوفيتية – يريفان
Foreign Office

...أعتقد بأن ليس للكرد مستقبل كشعب. أنهم يعيشون في منطقة فقيرة، موزعون بين ثلاثة أو اربعة قوى و ان نفوسها قليل قياسا الى جيرانهم و ليس لهم موقع على الساحل و لهم ميل الى القبيلة أكثر من ميلهم الى القومية و ان مصدر الدعوات القومية الكردية الحالية يعود جزءا الى التصريح المشترك الأنجلو – الفرنسي تشرين الثاني عام ١٩١٨ و الذي نص على تحرير الشعوب الخاضعة للدولة العثمانية و أعطائهم حق تقرير المصير و الذي كان جزءا من الأعلام الحربي للدول الحلفاء أثناء الحرب العالمية الأولى.

توقيع W.J. Childs ١٩٢٩/٨/١٧

٤ـ شارێکی زۆر گەورەی بازرگانی نەبووە کە وەك مەرکەزێك بێت.

٥ـ زاڵبونی هەستی ئاینی بەسەر نەتەوەیەتی دا سەرکردەکانی کورد هاوکاریان لەگەڵ ڕۆژئاوا نەکرد، لەتۆلەی صلاح الدین ئەیوبی نەیان کردونەتە دەوڵەت.

٦ـ زەمینەی یاسای و سیاسی کەبریتییە لەهەرێم وگەل و دەسەلاتی سیاسی ئامادەنەبو.

٧ـ ناکۆکی وناوەخۆ لەنێو کوردان و کێشەو ناکۆکی سەرکردەکان

٨ـ لیدانی ئەرمەن وچەوساندنەوەی نەسرانی ئەو کیشانە وای کرد کورد نەبیتە دەوڵەت.

٩ ـ زۆری سامانی ژێر زەوی کوردستان هۆی بە دەوڵەت نەبونی کوردە.

١٠ـ هەیە دەڵێ، چونکە پارچە پارچەکراین بۆیە نەبووینە دەوڵەت!.

١١ـ ڕایەکی تری نوێش لەنێو کوردستان ودەرەوە هەیە دەڵێ: توانای دەوڵەت بەڕێوەبردنیان نەبوەو نیە..

وەڵام و هەلسەنگاندنی ئەو بۆچونانە

یەکەیەکە بە ڕێز بەندی خۆی وەڵام دەدەینەوە

١ـ بەشی زۆری لە مێژوناسی کورد و غەیرەکورد و مونەزیرەکان هۆی نەبونی کورد بە دەوڵەت بۆ ئەو هۆکارانە دەگێڕنەوە دەڵێن کورد چواردەوری بە دوژمن دراوەو هیچ لایەك ناکەوێتە سەر دەریا، بۆ ئەوەی دەرگای کراوە بێت لێی...

خۆ ئەرمینیا و ئازربیجان و عێراقیش کەوتبوە نێوان ئەو دوو ئیمبراتۆریەتەوەو بونە دەوڵەتیش، بەپێچەوانەوە گەلێ جار میرنشین و دەوڵەتە کوردیەکان سودیان لەو جیۆپۆلیتیکە وەرگرتبوو.. لەپێش مەینەتیەکەی واتە لە سەرەتای سەدەی بیست چواردەوری دوژمن نەبوو، ئەگەر عوسمانی و فارسی بەدوژمن حساب بکەین خۆ عێراق و سوریا و ئوردن دروست نەببون، ئنجا ئەوکاتی کە ئەو دەوڵەتانە دروست بون و کورد لێی بێبەشکرا فارس و عوسمانی هەر دەسەلاتیان نەمابوو، میللەتی تریش هەبو نەداخراوبوینەوە کو (مونگۆلیاوسودان وچادو هەنگاریاو ..بەدەیانی تر) کەچی بووینە دەوڵەت..کەواتە ئەوە هۆی بنچینەیی نەبوە.

٢ـ هەرچەندە هەلەیە کورد وکوردستان هەر ژێر دەستەو چەوساوە نەبوینە[٢٨٣]، خۆ ئەگەر واش بێت جولەکە لەکۆنەوە چەوساوەتەوە یان ئەرمەنییەکان، یان عەرەب کەچی بووینە دەوڵەت.. بونی دەسەڵاتی کوردی بەو فراوانیەی لە میرنشین و دەوڵەت و لە دەسەڵاتی ئەیوبی و دوای دەسەڵاتی کوردی بەسەر شام و بەغدا و زۆر شوێنی تر، دەسەلمێنێ کە کورد ئەزموونی دەسەڵاتی سیاسی و پابەندی بە یاسا بە تایبەتی یاساکانی (شەریعەت) تا ئەو ڕادەیە پابەندی بەشەریعەت ببوە نەریت و رای گشتی، بەڵام ڕاستە کۆمەڵگەیەکی خێڵەکیش بووە، دیسان ئەوانەی زۆر خێڵەکی (مەبەست لێرە ئەوانەی دەرەوەی شارە کوردیەکان) تاڕادەیەکی چاك توخمی مەدەنیان لێ بەدی دەکرێ بەهۆی ئاینەکەیان لە لێبوردەیی و بەهاناهاتن و هەڵگرتنی بەرپرسیارێتی گشتی و پاراستنی بەرژەوەندی گشتی و ژینگە و...هتد.

ئەگەر بەوردی سەرنج بدەینە کەمینەکان دەبینین جوو و گاور و دیان لە کوردستان نەك لە شارەکان لە گوندەکانیش ژیاون، موڵك و سامانیان پارێستراوە، بەپێی راپۆرتی (عصبة الأمم) ساڵی ١٩٢٥ی ویلایەتی موسڵ وا پیشان دەدا کە لێبوردەیی و پێکەوەژیانی مەسیحی و کورد لە کوردستان نمونەییەو دەگمەنە، بەپێچەوانەوە ئەگەر عێراق بەنمونە وەرگرین و بووە دەوڵەتیش بەپێی توێژینەوەی کۆمەڵایەتیەکانی(حەنابەتاتۆ)، (د.علی وەردی)، (فۆرستەر)...

دەبینین کۆمەڵگەکەی نەك هەر خێڵەکیە، بەڵکو بەدەویش بوە لەکاتی بونی بە دەوڵەت، وەك لەو ئامارە دەردەکەوێ: ٣٥٪ بەدەوی،٤١٪ دەشتەکی، ٢٤٪ شارستانی، شارستانیەکەش زۆربەی غەیرە عەرەب بون. خەڵکی ناو شاری بەغدا (بە نمونە) بەشی زۆری عەرەب نەبونە، لە سالی١٩٠٠ سێ نوێنەریان لە مەبعوسان (پەرلەمانی عوسمانی) بۆ هەڵبژێردرا تەنها یەکیان عەرەب بوو بەناوی (محمود ئالوس)، دووەمیان کورد بو بەناوی (اسماعیل حقی بابان)، سێیەمیان یەهودی بو بەناوی (ساسون حسقیل)، رێژەی بازرگانان لە ٩٥٪ یەهود بون، خەڵکی ناو بەغدا {بەپێی ئاماری ١٩٠٨} بریتی بو لە

[٢٨٣]ـ باسی ئەحواڵی وڵاتانی ئەمریکا بۆ دەکەی
باسی مازی و حاڵ و ئیستقبالی سۆرانی بلێ
چەند حوکمدارت لە بەدلیس و بۆتان بوود
گەر بەود عیلمت نیە پاشای بابان بلێ

١٥٠,٠٠٠ کەس، ٥٣,٠٠٠ یەهودی بون، جگە لە کورد و فەیلی و مەسیحی، بۆیە شەمە پشووی بازاڕ بو لە جیاتی هەینی[٢٨٤]، ئنجا کۆمەڵگەیەك بون زۆر دژی یاسا و دەسەڵات کەچی بە بڕیاری بەریتانی بون بە دەوڵەت، بەلای کەمی خەڵکی کوردستان مەدەنی تر بون لە عەرەبی عیراق، تاهاتنی مەلیك فەیسەل، کە لەکۆنگرەکان بەشداری دەکرد بە حیساب رۆشنبیرترین کەس بوە ئینجا کە لە بەریتانیا ئیمزای کردبوو نەی زانی بوو ئینگلیزیەکەی بخوێنێتەوە لۆرانس بۆی خوێندبوە، شیخەکانی کەنداو ئیمزای دەستیان نەبوە بە پەنجە مۆریان کردوە، بەڵگەیەکی بە هێزتر کاتی سیستەمی ئینتداب لەلایەن (عوسبە)دەرچوو بەپێی ریزبەندییەکانی خوارەوە پۆلین کران بە پێی دواکەوتوویی : گرووپی A: ژێر دەسەڵاتی عوسمانی (وەك عێراق و تورکیاو کورد...) ئەوە پێش کەوتوو بون، گرووپیB ئەفریقیا پلەی دوەمی هەبوو، گرووپی C ژێردەستەکانی ئەلمانیا پلەی سێیەمی هەبوو، کەچی پلە سێیەکانیش بونە دەوڵەت..کەواتە ئەوەش هۆی بنچینەیی نەبوە.

٣ـ هەرچەندە شاری گەورە کاریگەر بوە، کاتی خۆی شار دەبوە دەوڵەت وەك ئەفلاتون لە (جمهوری)ەکەی باسدەکات. کوردستان شاری گەورەی لێبووە وەکو هەولێر و سلیمانی و دیاربەکر، لەبەڵگەنامەی بەریتانی باس لەشارێکی تری گەورەی بازرگانی دەکا، کە رۆژهەڵات ورۆژئاوای پێك بەستبۆوە[٢٨٥]، ولاتی تر هەبوە هەر بیابان بوە وەکو (نوردەن و قەتەر...).

کەچی بووینە دەوڵەت.. کەواتە ئەوەش هۆی بنچینەیی نەبوە.

٥ـ ئاین زاڵبووە...خۆ ئەگەر وابوایە پێغەمبەر (د.خ) عەرەب بوە، کەوابو دەبێت یەك وڵات بۆ عەرەبان دروست نەکرابایە یان دەوڵەتی تورکیا.

[٢٨٤]ـ لە نێو هەندێ فەرموودە زەمی بەغدار ئەهلی عیراق کراوەو داواکراوە لێی دانەنیشن، لەص١ ج١{ تاريخ بغداد - الخطيب البغدادي} دەڵێ: بەغداد وخاکی سواد غەسبە ناکری ونافرۆشری لێشی دانەنیشی باشە، دەڵێن : ناوی بەغدا لە بتی عەجەمان هاتوە بۆیەناویان نا (دار السلام)

[٢٨٥] secret. Kurdish policy New Delhi .Lndia..File No .١٣/١٤ vol.v١١

وزارة الداخلية ١٦شباط١٩٣٠ مذكرة سري، رقم ٦٤٦ \سي.

... وكان كردستان مركز التجارة العالمية ومعبر المهم للتجارة بين الصين والهند. حيث كانت القوافل البرية تسير بين همدان وكابول ولاهور ودلهي والصين واسكندرية وكان الكرد حماة طرق القوافل. كان مدينة كرين الكردية مركزا تجاريا عالميا...

ئینجا لەدوای جەنگ هەموسەرکردەکوردەکان دەستیان بۆهاوپەیمانان درێژکرد بۆ ئەو مەبەستە، هەر لە شێخ عبیداللە وشیخ عبدالقادری شمزینی وشیخ محمودو قازی ومەلا مستەفا...هەرچی هێزی گەورەیەو کەسێکی کاریگەر بوە لەو جیهانە نامەیان بۆناردوەوگەلاڵەیان پێشکەش کردوە، هەم بۆ جیهانی ئیسلامیش، ئەگەر سەرکردەکوردەکان ئاینیش بووبن ئەوا لەگەل ئاینەکانی تر دۆست بون هەروەك لە راپۆرتی و یلایەتی موسل و بەڵگەنامەی بەریتانی وزۆر سەرچاوەی ترهاتوە، لە حکومەتی شێخ محمود وەزیری دارایی کەریمی عەلەکەی مەسیحی بووشیخ سلام بە شیخ النصرانی بەناوبانگ بو، کاهینێکی گەڕیدە هاتبوە کوردستان وسەردانی ناوچەی بارزان وکوردستانی کردبو سەرسام بو بەوتەباییەی نێوان کوردستانیەکان لە ئاینە جیاجیاکان کتێبێکی نوسیبوو بەناوی(مهد البشريه ـ الحياه في شرق كوردستان) شيخ عبدالسلامی بە(برایان بۆرۆ)ی ئیرلەندای شوبهاندبوو، کە لە کوردستانیش لەژێر سایەی ئەخلاقی ئاینی وەقە زێڕەك لەدەرەوە بەجێ بهێلە کەس دەستی بۆ ناباو، مالی مەسیحی زیاتر پارێزراوبوە[٢٨٦]، کۆمەڵێك خەڵکی ئاین پەروەر یەخەگیری شێخ سعیدبون و داوایان لێکرد فهمیە فەندی دەربکا چونکە لەکافر کافرو مولحید ترە، شێخ سعید پێی وتبون خۆ کوردێکی چاکە لێیگەرێن با بمێنێ[٢٨٧]، کەواتە جار وابوە نەتەوایەتیان بەسەر ئایدیۆلۆژیا خستوە، ئەگەر ئاڕستەی شۆرشەکانی کورد ئاینیش بوبێ خۆ لە عیراقیش شۆرش دژی بەریتانیا کرا...، ئەگەر تۆلەی سەلاح الدين بێت لەکورد بۆ تۆلە لە (محمد فاتیح)نەکراوە کەچی بوینە دەوڵەت..کەواتە ئەوەش هۆی بنچینەیی نەبوە.

ئەوەی دەڵێت: ئاین رێگر بوە بۆ کورد ویاریدەدەر بوە بۆ عەرەب وتورك، دەڵێن: ئەوان سودیان وەرگرتوە بەڵام کورد سودی وەرنەگرتوە ..، ئەوانە لەوە بە هەڵە داچووینە وا دەزانن ئەو وڵاتانەی عەرەبی زادەی ئەمەوی وعەباسین وتورکیاش زادەی عوسمانیە...، نەخێر هەڵەکە ئەلێرەیە، وڵاتانی عەرەبی وتورکی لە لایەن رۆژئاوا دروست کراون نەك لەلایەن خیلافەتی ئیسلام.

---

[٢٨٦]ـ أیوب بارزانی –المقاومة الكردية للإحتلال ص٨ هەروەها بڕوانە ئەو ڕووداوەی یارمەتی ئەرمەنەکان لەلایەن سەرکردە ئاینیەکانی کورد لە ل٢٦٤ی مسعود بارزانی-بارزانی وبزوتنەوەی رزگاری خوازی کورد

[٢٨٧]ـ الملامح السياسية لتأريخ الكردالحديث والمعاصر ـ صباح ارام ص١٤٢

٦ـ ناکۆکی ناوەخۆی هەبوە بەڵام هەمو میللەتێك ناکۆکی ناوەخۆی هەبوە تەنانەت دەوڵەتەگەورەکانی ئێستاش لەوانە: ئەمریکا یان بەریتانیا، ..لە کێ هەیە ناکۆکی ناوەخۆ نەبوبیت، کەچی بوینە دەوڵەت..کەواتە ئەوەش هۆی بنچینەیی نەبوە.

٧ـ زەمینەی یاسای وسیاسی کەلەهەموان گرینگترە بەڵام لەکوردستان لە هەموان زیاتر سازتربوە، هەر خودی بەکارهێنانی ووشەی کوردستان لەسەدەی (١٢) ەوە دەست پێدەکات لەساڵی ١٣٣٩ز کەوتە سەر نەخشەی ئیبن مستەوفی بۆ یەکەمجار وەك مێژووی جوگرافیای، مێژووی ئیداریەکەی لە دوای سەدەی ١٧ دەست پێ دەکا[٢٨٨]، کە بۆ ٥و یلایەت بەکارهات و ناوی کەوتە سەر نەخشەی ئیداری، مێژوی سیاسی لە کۆتایی سەدەی بیستەم دەست پێ دەکا، کاتێ شیخ عبیداللە داوای هەمو کوردستانی کرد، مێژووی سیاسی لەدوای سالی ١٩٠٨ خەستتر بۆوە، میژووی یاسایی لە کۆنگرەی (سیفەری ١٩٢٠)ەوە دەست پێ دەکات چونکە لەژێر سەردێری یاسایی (بەشی سێیەم کوردستان) لە سیڤەر هات، کەواتە لە سەردەمی دروست بونی دەوڵەتی مۆدێرن کوردستان (واتە کوردستان وەك هەرێمێك) مقەوەماتی مێژوویی وجوگرافی وئیداری وسیاسی و یاسایی بڕیبوو بۆ بون بەدەوڵەت، بە پێچەوانەی زۆربەی ئەو هەرێمانەی لە ڕۆژ هەڵاتی ناوەڕاست ئەو مقەوەماتانەی نەبوەو، بەراود لەگەڵ عێراق نەهەرێمێکی ئیداری نەسیاسی نەیاسایی بوە، تا سالی ١٩٢١ ئینجا لە کۆنگرەکان ناوی هاتوە.. کەچی بوینە دەوڵەت..کەواتە ئەوەش هۆی بنچینەیی نەبوە.

٨ـ لە ڕاستێدا ڕەفتاری هەندی سەرکردەو عەشایەر دژ بە (غەیرە دین) زۆر سەلبی بوە، بەڵام بە دەیان بەڵگەنامەش لای هیزە گەورەکان هەیە کە کورد لەگەل کەمایەتی ئاین باش بوینە، خۆ ئەگەر ئەو فاکتەرە گرنگ بوایە بۆ دەوڵەت دروست بون دەبوایە تورکیای نوێ هەرگیز نەبوایە دەوڵەت، چونکە بە فەرمی جینۆسایدی ئەرمەن لە ئەستۆی ئیتحادولترەقی وکەمالیەکان بوو،هەر لە مادەی ( (١٤٢)ی سیڤەر بەتیرۆر وەسفی دەکاو ئاماژە بە حکومەتی ئیتحادوالترقی (کەبناغەی تورکیای نوێیە) دەکا وەك بەرپرسیار لەو

[٢٨٨] ـ جوگرافی ناسەکانی ئیسلامی لەو دوایە وەك ئیبن حوقل وئیستاخری وئەلبیرۆنی وزۆری تر بۆ یەکەم جار هەولیاندا سنوری ئیقلیم لەسەر بنچینەی زمان دابڕێژن شان بەشانی دارشتنی هەندێکیشیان لەسەر بنچینەی جوگرافی وسروشتی ومێژوویی... کوردستان یەکێ لەوانە بوو زوو لەسەر بنچینەی زمان کەوتە ئیقلیمی جیبال.

تاوانە ـ بۆیە هەر هەوڵێك بە هەڵەیی بـۆ توشـکردنی کـورد یـان عوسمـانی بـەو تاوانـە هەڵەیەکی کوشندەی ستراتیژییە.

٩ـ ڕاستە کوردستان سامانی زۆرەو هەمو لایەك چاویان لەخێروبێری بوە، بەلاّم سەردەمی دروستبونی دەوڵەتی هاوچەرخ لەدوای جەنگی جیهانی یەکەم سیستەمێکی جیهانی نویێ دارێژرا، سیستەمی ئیمپریالیزمی ڕاستەوخۆش گۆڕا بۆ ڕێکەوتننامەو ئینتداب و مۆرکردنی گرێبەستی کۆمپانیا...بەلاّم ئەو هۆکارە بۆ دوای دابەشیەکە کاریگەری هەیە، وەك دەبینین چۆن کەرکوك تەعریب کرا بۆ ئەو مەبەستە، وەختێك گرنگی نەوت هاتە گۆڕەپان، کە سەردەمی سیستەمی نوێی جیهانی هاتە کایەوە، لەلایەن ئەلمانیا پێش سەدەی بیست گرنگی نەوت بەدی دەکرێ، هەر بۆ زانیاری یەکەمجار گرنگی نەوتی کوردستان (خانەقین) لەلایەن (معجم البلدان)ی یاقوت حموی لە سەدەی ١٠ باس کراوە نەك وەك هەندێ مێژونوس دەیدەنە پاڵ زانایانی ئەڵمان لەکۆتایی سەدەی ١٩، بەلاّم بەریتانیا کە نفوزی لە ویلایەتەکانی بەغدا و بەسرە بەهێز بوو ئەوکاتی ماکینەکانی بە خەڵوز ئیشی دەکرد دوایی لەسەرەتای سەدەی بیستەم بوو بە نەوت، لەکاتی دابەشیەکەی سایکس ـ بیکۆش ویلایەتی موسڵ کەوتە سەر بەشی فەڕەنسا، هەر بەو هۆیەوە بەریتانیا تەقەلای لەگەڵ (کلیمنسور)ی سەرۆك وەزیرانی فەڕەنسا دا لە کۆنگرەی (سان ریمۆ ١٩٢٠) تا ویلایەتی موسڵ بگێڕێتەوە سەر بەشی بەریتانیا بە مەرجی خۆی ڕێکەوتن، ئیتر لەو سەودایە ئەو بۆچونە بەهێز دەکا، کە گوایە بەهۆی سامان کوردستان پارچەپارچە کرا، هەر لە کۆنگرەی قاهیرەی ١٩٢١ کە عێراقی لێ دروستکرا پاساوی هەرەبنچینەیی هەریەکە لە: مس بیل و برسی کۆکس لە بەرامبەر پێشنیارە چاکەکانی چەرچڵ ئەوەبو: ئەگەر داهاتی کوردستان نەخرێتە سەر عێراقە نوێیە ئەوا عێراق مقەوماتی ئابوری خۆی نابێ، بەلاّم هەمو ئەو تاوتوێیە ئەوە ناگەیەنێ کە کوردستان پارچەپارچەکراو نەگیشتە دەوڵەت بەو هۆیە، خۆ هەمان سامان درا بەعێراق و بوش بە دەوڵەت، ئینجا ولاّتانی کەنداو هەموی لەسەر بنچینەی نەوت بونە دەوڵەتی سەربەخۆ، کەواتە هۆکارەکە پێچەوانەیە، دڵنیام ئەگەر کوردستان سامانی نەوتی نەبوایە مێژوونوسەکانی خۆمان بەلایەکی تردا دەچون و دەیانگوت: خوا کوردی لە سامان بێبەش کرد بۆیە ولاّتێکی زلهێز نەهات تەماحیمان تێ بکاو بمانکات بە دەوڵەت!، ئەوکاتی

نەبونی سامان دەبوە هۆیەکی مەعقولی نەبونمان بە دەوڵەت.. کەواتە ئەو خاڵەش نەك هۆکاری نەبونی دەوڵەتە بەڵکو بە پێچەوانەوە خاڵی یارمەتیدەرە.

١٠- بەشێکی تر پێیان وایە پارچەپارچەکردنی کوردستان و دابەشی بەسەر حکومەتەکانی دەوروبەر هۆی نەبونی دەوڵەتێکی کوردیە.

وەڵام/ دەبێ بەوردی زنجیرە روداوەکانی مێژوو رێزبکەین، لەکاتی بێبەشکردنی کورد هێشتا دابەش نەکرابوو(دابەشیەکە مانای مەینەتی و نەگەیشتنی کورد بە دەوڵەتە)، بۆیە دابەشیەکە پەیوەندی بە بەردەوامی مەینەتیەکە هەیە نەك بەرپاکردنی مەینەتیەکە، لەگەڵ ئەوەشدا زۆر وڵات هەیە خراپتریش پارچەپارچە ببوو، لەوانە ئەڵمانیا لەپاش جەنگی سی ساڵەو رێکەوتنی ویستفالیای ١٦٤٨ ببوە ١٣٠٠میرنشینی جیاجیا کەچی بسمارك توانی لەساڵی ١٨٧١ کۆیان بکاتەوە دەوڵەتی ئەڵمانیا دروست بکا.

١١- سەبارەت بەکەم توانایی کوردی ئەوسا بۆ بەڕێوەبردنی دەوڵەت ئێستا خەریکە ئەو بۆچوونە زۆر باو وەرگرێ بەتایبەتی لەژێر سایەی دەسەڵاتی کوردی ئێستا، ئەسلو ئەساسی نیە، چونکە:

أ - کورد لە نێو عوسمانی بە توانا تر بون وەك لە مناقشەکەی ئەتاتۆرك لە پەرلەمان لە رۆژانی ١و٢و١٩٢٤/٣/٣ دەردەکەوێ.

ب - لەسیڤەر ناوی کوردستان بەدەر لە سیستەمی (ئینتداب) هاتوە[٢٨٩]، ئەوەش بەڵگەیە کە نەك بەتوانا بوە بەڵکو لەمیلەتانی تری عوسمانی ئامادە تر بوە بۆ دەوڵەت.

د- زۆربەی دام ودەزگاو حزب ومونەسەساتی نوێی نێو عوسمانی لە داهێنانی کورد بوە هەتا لەعیراقیش.

ف - ئەو دەوڵەت ومیرنشینانەی کورد بە توانای خۆیان بەڕێوە چوەك - لە بەڵگەنامەی بەریتانی کە لەلایەن (موفەتیشی گشتی لیوای هولێر - سکینگ نێردراوە:...أما اذا لم تقدم الحكومة على أي شيء فأن الوضع ستتدهور تدهورا خطيرا.

[٢٨٩]- لە کتێبی (سياسة البريطانية العظمى تجاة مستقبل كردستان ص٢٦٢ هاتوە کە(یانگ) پێشنیاری کردوە کوردستان بێتە (مەحمی)ی بریتانی ، ئەگەر لەتەرجەمە (مەحمی) بەهەلە لەجیاتی ئینتداب وەرنەگێردرابێ ئەوە یەکەم ئاماژەی یاسایی وسیاسیە کەکورد ئاستی سیاسی وئابوری ویاسایی لەهەموميلەتانی دەوروبەر پێش کەوتوتر بوە ، چونکە مەحمی بالاترە لە ئینتداب.

ان انطباعي عن الكرد انهم يحبون ة النظام ومطيعين للقانون وانهم اقلا ميلا من العرب للفوضى والتمرد...[٢٩٠]

ت ـ لەگەل زۆر بەلگەی تر وای کردبوو ڕۆژهەلاتناس ؤكۆنسۆلیەكان وەسفی توانای كورد بۆ دەولەت بەڕێوەبردن وەك (میجەر نۆئیل) بكەن كە دەلێ:كورد لە هەمو میلەتانی عوسمانی لە عەرەب وتورك زۆر بە توانا ترن بۆ دەولەت بەڕێوە بردن با هەمو كوردستانیان بۆ یەكخرێ لە دەولەتێك ـ راپۆرتی مانگانەی نۆئیل ١٩١٩/٧ ..، هەروەها(كۆتلۆف) لە توێژینەوەی سەبارەت بە عیراق لە بەشی (ثورة عشرين ص٢٢٥) دەلێت: بزوتنەوەی كوردی زۆر لە بزوتنەوەی عەرەب گەشە سەندووترە.هـ ـ لەبەلگەنامە بەریتانیەكانیش وا هاتوە، كە تادوا ساتەكانی عوسمانیش هەركورد ویلایەتەكانی بەغداو بەسرەشی بەڕێوە بردوە[٢٩١] ...كەواتە ئەوەش هۆكارنیە بۆ بەدەولەت نەبونی كورد.

كەواتە مەینەتی كورد هەموی بەپیلان و ڕێكەوتنێكی مێژووی نەبوو، لەپاش جەنگی جیهانی یەكەم دەست كرا بەدروست كردنی دەولەت لە سەر میراتی عوسمانی، هەركەداگیركەرێكی گەورەی جیهان چەندی لێ كەوتە ژێر دەستی دەولەتی لەبۆ دروست كرد بەپێی سیستەمی(انتێداب)و بەرژەوەندی خۆی، ئەوەی نەكەوتە ژێر دەستی زۆر پەیوەندی پێوە نەبوو..

كەواتە هۆكاری ڕاستەقینەی بە دەولەت نەبونی كوردستان چیە؟

لەوەی سەروو بەڕونی دەری دەخا مێژوو بەرپرسیار نیە لە مەینەتی كورد، واتە ئەو مێژووەی ئێستا لە پرۆگرامی خوێندن دەیخوێنین غەدر لە كورد دەكا نەك مێژوو غەدر لە

---

[٢٩٠] ـ (مكتب المفتش الاداري ـ أربيل مذكرة رقم: ١٢\١١ شباط \١٠٣٠ الى: المستشار في وزارة الداخلية)

٢٩١ ٢/١٦١ /٧٣٠ CO " التماس المقدم من شعب كردستان الجنوبية "

...كان للكرد في العهد العثماني دورا مهما في ادارة ولاية بصرة وبغداد وموصل. هناك حاليا عدد كبير من الاداريين الكرد من العهد العثماني ومن ذوي الكفاءات الجيدة والذين يطالبون باستمرار من الحكومة العراقية توظيفهم ولكن دون جدوى. يمكن التأكيد من عدد الكرد الاداريين من أيام الحكم العثماني من مراجعة سجل وزارة الداخلية. ولكن سياسة الحكومة العربية الحالية هو التقليص التدريجي لعدد الكرد في تلك الوظائف. و الموظفون الكرد الكفوؤن و الباقون في الدوائر الحكومية لحد الان سيفقدون آجلا ام عاجلا وظائفهم لأن ليس لهم فرصة لتطوير مهاراتهم الفنية. وبعد فترة قصيرة تكون الحكومة العربية العراقية قد حققت هدفها في تطهير الادارة من الكرد وقريبا لن يكون هناك ولو مسؤول كردي رفيع المستوى في اي منصب مهم في الدولة.

کورد بکا، بەگشتی فاکتەری مێژوو ئەو ڕۆڵەی نە بە سلبی و نە بە ئیجابی بۆ کورد نەبینی، بەڵام ئەوەش مانای ئەوە نیە هەندێ لەو خاڵانەی سەروو کاریگەری خۆی هەبوە، یەکێك لەو خاڵانەی، تا ئێستا بەلای دا نەچووینە، فاکتەری فقهی ئیسلامی، دەتوانین بڵێین: بەسێك لەو فقهەکاریگەریەکی سەلبی هەبوە، ئەو بەشەی کە پێی وایە عەرەب فەزلی بەسەر عەجەم هەیەو خەلیفەو ئەمیریش دەبێ عەرەب بێت، ئەو فاکتەرە ڕێگربوە لە گەشەی دەوڵەت ئیمپراتۆریە کوردیەکان بۆ پلەی خیلافەت ودەسەڵاتی شەرعی، بەتایبەتی میللەتی کوردلەو ڕوەوە (سونی و شیعی)ەکەی لێ بوە بەڵا، مەزهەب شافعی بوینەکە یەکێکە لە خاوەن ئەو بۆچونە، بەشە کوردە مەزهەب شیعەکەشی لەبەر ئەوەی ئەوانیش پێیان وایە دەبێ ئەمیر لە ئالولبەیت بێت لەویش کورد بێ چارەنوسە، لەکاتێکا ئەسلی ئیسلام نەتەوەی سونە دەڵێ: وایە نەتەوەی شیعە، کەس فەزلی بەسەر کەس نیە تەنها بەتەقوا نەبێت، دەبینین تورك لەکورد بەهێز تر نەبون چونکە پەیڕەوی مەزهەب حەنەفی بووینەو ئەومەرجەی عەرەبی (ئەمەویانەی) تێدانیە بۆیە عوسمانی گەیشتنە خیلافەت، ئەو فاکتەرە وای کرد مێژووی کورد ئەوەندە وەك خۆی پرشنگدار نەبێ، بەڵام هۆیەکی گرنگ نیە بۆ بە دەوڵەت نەبون و مەینەتیەکەی، مەینەتی کورد لەسالی ١٩٠٨ دەست پێدەکاو لەساڵانی ١٩١٦ خەست دەبێتەوە تا لە ساڵانی ١٩٢٢ ـ ١٩٢٥ دروست دەبێ، لەو کاتە دەوڵەتەکان بۆ تورکو عەرەب وخەڵکی تر دروست دەکرێ لەوکاتەمەینەتی کوردیش دروستبوو لە ژێر ئەو گۆڕانکاریانەی خوارەوە:

١ـ لەکۆتایی جەنگی جیهانی یەکەم جێبەجێ کرا.

٢ـ لەوکاتە بوو کە هاوپەیمانان بەسەر وڵاتانی تەودر (کە عوسمانی بەشێك بوو لێی) زاڵ بون.

٣ـ لەو کاتە بوو بیری عەلمانی جێی بیری ئیسلامی گرتەوە.

٤ـ لەوکاتە بوو کە بیری نەتەوەگەری بووە بنچینەی دروستکردنی دەوڵەتی هاوچەرخ لەجیاتی ئیمبراتۆریەتەکان.

٥ـ لەوکاتە بوو کە ئاشتی جیهانی و وفاق الدولی بەو نەخشەیە دروستکرا.

هۆکاری سەرەکی لەوە دێت، کە فەترەیەکی مێژوی وا ڕێکەوت پەیوەندی کورد ئەوەندە بەدەوروبەری باش نەبوە.

نەهاندەر بوو نە ڕێگریش بو، ولاَتانی هاوپەیمانیش ماندو ببون لە شوێنی بە داهات وبێ گێچەل وبەرگری دەگەڕان، شام وئەو ناوچانە کەوتە ژێر دەستی فەرەنسا، تورکیا ئێستا کەوتە ژێر دەستی یۆنان، عێراق کەوتە ژێردەستی بەریتانیا، ناوچەی کوردستانی سەرو بەشی تورکیا بۆ روسیا دانرا بوو، وابەنیازبون تورکیاش نەبێتە دەوڵەت، یان ئەگەر بووە دەوڵەتیش بە پێی (ئینتێداب) بێ، بەلاَم بەختی تورکیا ئەوەبو یۆنان بە هێز نەبوو بە ئاسانی مستەفا کمال یۆنان و ئیتالیای لەو ناوچانە دەرکرد، ئینجا توانی خیلافەتیش برووخێنی، واتە سەرووی ڕۆژئاوا کەوتە ژێر دەستی ئەتاتورك، لەسالی ١٩١٧ شۆرشی ئۆکتۆبەری روسیا بە سەرکردایەتی (لینین) سەرکەوتو بو ئەویش لە ناوچەکانی کوردستانی سەرووی ڕۆژئاوا کشایەوە، زیاتر لەوەدش لینین وڕوسیا یارمەتیدەری پێك هێنانی دەوڵەتی کوردی و سەربەخۆیی نەبون پێیان وابوکورد هەلگری ئالاَی جامیعەی ئیسلامیە[٢٩٢] ودیوارێکی رەجعیەتە کەلەلای ئینکلیزوئەمریکا دروست دەکرێ[٢٩٣]، ئەو ناوچەیە بە بۆشی مایەوە، شوێنێکی ترسناك بونەیان وێرا خۆی لێبدەن لە لایەك میللەتەکەی دڕ بوو ئینجا نزیکیش بو لە سنوری روسیای بەلشەفی، بۆ ئەمریکایان پشنیار کرد بێتە ئەو ناوچەیە دوای ئەوەی تێیگەیشت ئەو مەترسیانەی هەیە نەهات، لەلای باشوریش هاتنی بەریتانیا زۆر بەزەحمەت بوو بۆ لای کوردستان لەبەر هەمان هۆ وەك لە بروسکەکانی سەرکردەکانی بەریتانی بۆ بەرپرسانی سەربازیان ناردوە، داوایان لێکردون وریا بن زۆر نزیکی ناوچە کوردیەکان نەکەونەوە وەك بنجاپی هندی ناخۆشە[٢٩٤]، ئەوە لەلایەك سەروەریە کەکەس بە ئاسانی بوێری نەکا ناوچەکانت داگیر بکا، لێرەدا خەریکە ئەو سەروەریە دەبیتە دەردو هۆیەکە بۆ نەهاتنی هیچ هیزێك وبە بۆشایی مانەوەی، ئەگینا بەلای کەم دەکەوتە ژێر ئینتدابی یەکێك لە هاوپەیمانان وچارەنوسی باش دەبوو، لەلایەکی

---

[٢٩٢] ـ بروانە: دراسات فی الحرکە الکوردیە المعاصرە..

[٢٩٣] بروانە:دکمال مەزهەر–کردستان فی سنوات الحرب العالمیە الاولی ص٣٥٤

[٢٩٤] ـ ئەسکوێتی سەرۆك وەزیرانی بەریتانی هۆشیاری بە هێزەکانی بریتانیا دا تا نەچنە نێو کوردستان ئەو بەراوردەکی وردی نێوان کورد وخێلە باتانیەکانی پنجابی هەبوو دعثمان علی ـ دراسات فی الحرکة الکوردیة ص٢٦٨

تر هەر لەسەرەتای سەدەی ١٩ەوە وا هەست پێ دەکرا کەلەلای بەریتانیاو فرنسا ئەوجۆش وخرۆشەی بۆ عەرەب ویەهودو ئەرمەن هەیە بۆ کورد وانیە، یەکەم گورزیان کۆنگرەی١٨٣٣ی کۆتاهیە و ١٨٤٠ی لەندەنی بوو کە تیایدا بەسەر محمد علی پاشای میسر سەپێنرا کە واز لە هاوپەیمانی میری سۆران بهێنێ وپرۆژەی هاوبەشیان بۆ جێگرتنەوەی خیلافەت کۆتایی پێ هات ومیریش شکستی پێهێنرا[°]، هەر لە چوارچێوەی ئەو ستراتیژیەتە بەریتانیا رێگر بوو لەوەی شێخ عبدالقادر بە هاوکاری وەزیری عوسمانی لە ناوچەکانی ئەنادۆل هەلسن و پلانەکەی کەمالی تێك وپێك بدەن وچارەنوسێکی مەزن بۆ کوردو ئاین مسۆگەر بکەن[٢٩٤]، لەزۆربەی بەلگەنامەکانی بەریتانی وئەمریکی وفرنسی داکۆکی لەو نەخشە (ارث الإستعماری) رۆژهەلاتی ناوەراست دەکرێتەوە دژ بەکورد، لەکاتێکا سیڤەر مۆر دەکراو مافی کوردی تیابوو، هێشتا کێشەی ویلایەتی موسل ساغیش نەببۆوە، کەچی هەریەکە لە کۆکس ونیلسۆن (حاکمی بەریتانیا لە عیراق) بە نوسراوی فەرمی ژ:٣٣٣٠/٤ی ٢٢/٢/ ١٩٢١ فەرمانی دابوو بە حکومەتی تازەی عیراقی تا کوردستانی خوارەوو بخەنە سەر عیراقی عەرەبی تازە دروستکراو، هەر لە مادەی (٢٧)ی سیڤەر سنوری نێوان تورکیاو عێراق پێشنیار دەکرێ زۆر پێچەوانەی مادەی (٦٢)ی سیڤەرە کە سنوری کوردستانی دیایکردوە، هەر لەناو عێراقیش لە کاتێکا بەریتانیا لە٢٤/١٠/١٩٢٢دان بە دەسەلاتی شێخ محمود هێنرا وەك (حوکمدار)، کەچی لە رێکەوتنامەکانی بەریتانی عیراقی ناوی کوردی هەر تیا نەدەهات، لەراستیدا تێبینیەکی زۆر وورد لە کارنامە ستراتیژیەکانی بەریتانیا دەکرێت لەبارەی کورد، هەلوێستە چاکەکانی بەرپرسانی بەریتانی جێبەجێ نەدەکرا، بەلام ئەوانەی خراپ بون (پایەشیان بچوك تر بوو) جێبەجێ دەکرا، چەرچل، لوید جۆرج، کیرزن زۆر بالا دەست بون، پلانی باشیان(نسبیەن) هەبوو، لەوکاتی کیرزن لە کۆنگرە سێ قۆلیەکەی١٩١٩ی لەندەن ستراتیژیەکی باشی دارشت کەبریتی بوو لە: ١ـ کورد خۆیان بریاری چارەنوسی خۆی بدا ٢ـ جارێ ئیدارەی تورکی لەکوردستان دوور کەوێتەوە٣ـ ئەو دەوڵەتەکوردیەی دروست

---

[°] ـ لەدەشتی هەولێر دەلێن کەر لە کێ کەوتیەو کورتان لە کێ دراِیە...جێگەی گالتەجاریە ئەو پیلانە نێودەولەتیەی دژ بە میری سۆران لە ئەستۆی مەلای خەتێ دابێنن، یان ئەوەی شێخ محمودبەمشێری حەمەی مستەفاو ئەودی شێخ عبدالسلام بە سۆفی ئیبراهیم و..لەو دوایەش دەیان ویست ئەوەی قازیش لەئەستۆی بارزانی بشەتێنن ..ئیستا بەلگەنامەکانی بریتانیاو ئەمریکا ورووسیا راستیەکانیان ئاشکرا کردوە دوورە لەو تێروانینە سادانە.

[٢٩٤] ـ لەو بارەیەوە بروانە: دراسات فی الحرکه الکوردیه... ص٣٣٠

دەبێت زەمانی پێ بدرێ لە هەر هەڕەشەیەکی تورکی ٤ـ سەردڕای ئەوانەش خاڵێکی تێدا بوو کە نەهێڵن هەمو کوردستان یەکگرێتەوە لەکۆتایدا تەنها ئەو خالەی دوای جێبەجێ کرا، سیاسەتێکی نەرم بۆ ئەتاتۆرك ڕەخسێنرا لەسەروش، ناوچەکە کەوتە ژێر ڕەحمەتی سەرەنجامی ململانێ لە نێوان کوردو تورك بە کمال ئەتاتورك پڕکایەوە، کە لە سەروو(ئەو کاتی ئەوێ مەلبەنی کوردستان بو) لە خوارووش کێشە دروست بو لەگەل بەریتانیا، ئەگەر بەریتانیاش وەك یۆنان بێ هێز بوایە ئەوا حکومەتی کوردستان پێش عیراق دروست دەبوو [٢٩٦]، بەڵام وانەبو، بەریتانیا بە هێز بو چی ویست وای کرد وکوردستانی خواروشی خستە سەر عیراق، هەندێ هۆی تریش لەو دەمە یارمەتی بون بۆ نەنەگەیشتنی کورد بە دەوڵەت وجێبەجێ کردنی مادەکانی(٦٢، ٦٣، ٦٤)ی سیڤەر بەکورتی ئەوانە بوو:

١ـ جگە لە سەرکەوتنی بەسەر یۆنان سەرکەوتنی ئەتاتورك وئەنقەرە و مدرسەی عقلانی بەسەر سوڵتان و ئەستەمبۆل ومدرسەی ئیسلامیش بوە گورز لە بە دەوڵەت بونی کورد.

٢ـ گۆڕانی حکومەتی بەریتانیا (چەرچل) بە محافزین، ئەتاتۆرك بە سوڵتان، لە ئیتالیا و فرنساش گۆڕان بوو.. هەمو ئەوانە لە قازانجی پێشهاتەکانی نوێی تورکیاو نەخشەی نوێی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست بوو.

٣ـ ڕێکەوتنەکانی ئەتاتورك لەگەڵ روسیا و فەڕەنسا و بەریتانیا و ئەڵمانیا.

٤ـ چاوتیبرینی بەریتانیا لە ویلایەتی موسڵ و سازشکردن لەسەری.

٨ـ ئەمریکاو باقی وولاتی تر زۆر سور نەبون لە سەر جێ بە جێ کردنی سیڤەر و دەیان گوت هەموی لە قازانجی بەریتانی داڕێژراوە، تەنانەت ئەمریکا لە ١٤ بنەماکەی (ویلسۆن) یش پەشێمان بۆوە سەبارەت بە مافی چارەنووسی میللەتان، هەروەها فرنسا و بەریتانیاش لە لێدوانە هاوبەشە بەناوبانگەکەی ڕۆژی١٩١٨/١٠/٧ سەبارەت بە مافی

---

[٢٩٦]ـ چونکە حکومەتی کوردستانی سەرکەوتنی زۆر گەورەی بەدەست هێنا وتەواوی سوپای بریتانی لەکوردستان دەرکردو دەسکەوت ودیلی لێکردن، هەندێ مێژووناس پێیان وایە لەدوای شکستی عوسمانی لەجەنگ لە جیهانی ئیسلامی یەکەم جار بوو بتوانن هەیبەتی هێزی بریتانیا بشکێنن.

چارەنووس پەشێمان بونەوە، فرنسا یەکەم وڵات بوو هەیبەتی سیڤەری شکاند و دانی بە تورکیای نوێ هێنا، دوای ئەو ئیتالیا بوو، روسیای بەلشەفیش پشتی ئەتاتورکی گرت و یەکەم کۆبونەوەیان لە ١٩١٩/٦/٢١ لە نێوان ئەتاتورك وسیمن بودێنی گرێدرا بۆ یارمەتی سەربازی تورکیا، ئەمریکاش لەدژی ئەو هەنگاوانەی بەریتانی وەستا و داوای (سیاسە الباب المفتوح)کرد و لیژنەی (کنگ ـ کراینی) بۆ ناوچەکە دروست کرد و داوای کرد هەمو ئەو ناوچانەی لە عوسمانی جیاکراوە بخرێتە سەر مومتەلەکاتی (عصبە الامم)، بەو شێوەیە لەسەر یەك ڕەئی نەبون و هێزی جێبەجێکردنی سیڤەریان لاواز کرد، دەرفەتەکەش کورت بوو کورد تیایدا بە جێ ماو نەبوە دەوڵەت

## هۆیە یارمەتیدەر ویارمەتینەدەرەکان بۆ بە دەوڵەت نەبونی کورد

### أ ـ یارمەتی نەدەر

زۆر بەکورتی ئەو هۆکارو فاکتەرانەی خوارەوە ڕێگری بە دەوڵەت بونی کورد بون و بونە هۆی مەینەتی:

١ ـ ڕۆژ ئاوا[٢٩٧] ٢ـ سەرکەوتنی هاوپەیمانان ٣ـ مدرسەی عەلمانی ٤ـ ئایدۆلوژیای ناشیونالیزمی ٥ـ سەرهەلدانی دەوڵەتانی هاوچەرخی وەك عیراق و تورکیاو سوریا ٦ـ شۆرشی ئۆکتۆبەری رووسی ٧ـ بزوتنەوەی شەریفی مەکە ٨ـ پرۆژەی دەوڵەتی ئیسرائیل ٩ـ بزوتنەوەی کمالی ١٠ـ عشایرو عەلمانیەتی کورد ١١ـ بزوتنەوەی پان ئەرمەنیزم (تارادەیەك) ١٢ـ ڕێکەوتنەکانی (سایکس بیکۆ، سان ریمۆ، فرسای،

---

[٢٩٧] ـ لەو سەردەمی یارمەتیە مادیەکانیشیان هەر بەشێك بوە لە پیلان بروانە ئەو بەلگەنامە ئەمریکیە: وزارة الخارجية الأميركية، الوثائق الدبلوماسية السرية المنشورة - الشرق الأوسط، منشورات الجامعة الأميركية.

القنصلية الأميركية، حلب ، سورية ٣ – آذار – ١٩٢٥ الموضوع – الانتفاضة في كردستان

واشنطن سري الى: سعادة وزير الشؤون الخارجية

...يقر عدد من الدبلوماسيين الفرنسيون في جلساتهم الخاصة بأن لهم تعاون وثيق مع ضباط الأستخبارات العامة البريطانية بالنسبة للأوضاع في تركية، و بدأ يراقبون تحركات بعض الكرد العملاء لهم. و بدأت الشائعات تنتشر خلال ١٠ أيام الماضية عن تخصيص بريطانيا ٤٠ ألف باوند لتمويل حركة التمرد بين الكرد و الحاق منطقة التمرد في كردستان-تركية الى الأدارة البريطانية في العراق...

موريس دبليو آلتافر نائب القنصلية الأميركية

قاهیره، لۆزان) ١٣ ـ پرۆژەی ناشیۆنالیزمی عروبی وتۆرانی ١٤ـ لکاندنی ویلایەتی موسل بە عیراقەوە ١٥ـ سەربەخۆیی لە جیاتی ئینتداب ١٦ـ هەرسیٚ ڕێکەوتنامەی بەریتانیاو عیراق ١٧ـ یاسای نێودەوڵەتی و ڕێکەوتنەکان (تارادەیەك) ١٨ـ جامیعەی عربی وکۆنگرەی ئیسلامی

**ب — یارمەتی دەر:** ئەو هۆکارانەی یارمەتی دەری (بەدەوڵەت بون) بون:

١ ـ دەوڵەتی عوسمانی (ئەستەمبۆڵ) ٢ـ پرۆژەی پان ناشیۆنالیزمی عەرەبی دژ بە ئیمپریالیزم(تارادەیەك) ٣ـ جامعەی ئیسلامی ٤ـ شۆرشی بیست[٢٩٨] ٥ـ بزوتنەوەی کوردی رەسەن ٦ـ بزوتنەوەی تاشناقی ئەرمەنی(تارادەیەك) ٧ـ بزوتنەوەی رزگار خوازەکان ٨ـ ڕێکەوتنامەی سیڤەر ٩ـ لیژنەی کنگ کراین(تا رادەیەك) ١ـ عصبە الامم (تا رادەیەك)[٢٩٩] ١١ـ پرۆژە ئیسلامیەکان

### ئەگەرەکان و چارەنوسی کورد:

کۆمەڵێك ئەگەری زۆر دەگمەنی بیٚ نەخشە کۆبونەوە وایان کرد کورد نەبیتە دەوڵەت و مەینەتی بۆ دروست بیت، بەتیکرا دەتوانین ئەو سەرنجامەی کورد پیٚ ی گەیشت بەنەخشەو پلان نەبوو زیاتر رەوتی ڕووداوەکان وای سوڕاند، بۆیە ئەگەر ئەو ئەگەرانەی خوارەوە بە جۆریکی تر ئارستەی وەربگرتایە ئەوا زنجیرەی ڕووداوەکان ئەو رەوتەی وەرنە

---

[٢٩٨] ـ کوتلوف لەکتیبی(الثورة العراقیة ص١٤٤ )دەڵێت: ((أثناء ثورة العشرین طرحت مسألة تأسیس دولة کردستان لأول مرة في تأریخ تلك المنطقة))

[٢٩٩] ـ الکتاب معنونة الی ر.جیب سلید ضابط الجناح -دائرة استخبارات القوة الجویة الملکیة البریطانیة مقر القیادة ، ذوبیان

بأن عصبة الأمم طلبت دوما من بریطانیا ان تحکم الکرد ضمن نظام الأنتداب و ان یکون هناك "ولایة کوردستان المستقلة" ضمن العراق و تتعامل مع الحکومة بوجود المندوب السامي البریطاني الذي یکون کحلقة الوصل بین الکرد و الحکومة المرکزیة و تکونت ادارة کل الأمور الداخلیة بید الکرد. و ان الکرد ینظرون بعین الریبة و عدم الأحترام لکل الأوامر الصادرة من الحکومة المرکزیة التي تسیطر علیها العرب...

کەواتە لەلایەن زۆربەی کورد عوسبەتولئومەم بەخراپ ناوزەد کراوە پێداچوونەوەی دەوێت، بۆ زیاتریش (عصبة الأمم) لەوەڵامی سکاڵایەکی کۆمەڵێك سەرکردەی کورد لە ڕێنماییەکی تایبەتی بۆ بریتانیای دەولەتی(ئینتداب) نارد کەبریتی بوو لە ٣ مادە تیایدا لەمادەی دووەم داواکرابوو حکومەتێك بۆ کورد پێك بهێنرێت وچیتر بە هەلە لێکدانەوە بۆ بڕیاری رۆژی١٦/١٠/١٩٢٥ نەکرێ، دەقی بڕیارەکەی (عصبە الامم) لە ل٤٥٧ی (المشکلة الکردیة فی الشرق الأوسط) بخوێنەوە.مەبەست لە بڕیاری رۆژی ١٦/١٠/١٩٢٥ئەو بڕیارەیە کە ولایەتی موسل خرایە سەر عیراق بەپێی لیژنەکەی عوسبە.

دەگرت کە مەیینەتی بۆ کورد دروست بکا، رەنگە کوردیش بەمافی خـۆی دەگەیـشت. وا بەشیك لەو ئەگەرانە تۆمار دەکەین:

١ـ ئەگەر جەنگی جهانی یەکەم هەلنەگیرسابوایە، ئەگەریش هەلگیرسا ئەلمانیاو ولآتانی تەوەر سەرکەوتووبونایە لەوانەش عوسمانی ئەوا کورد وای بەسەر نەدەهات

٢ـ ئەگەر بەریتانیا ئەو ناوچەی ئێستا پی دەوتریت عیراقی داگیر نەکردبایە، لەلای فاویش نەبوایە بەڵکو بەلای کوردستان دابهاتبایە، بەرە و خواروو وەك فەتحی عوسمانی سالی ١٥٣٤ جۆرە سەرەنجامیکی جیای لەگەل ئێستا دەبوو.

٣ـ مادام بەریتانیا هەرهات وەك لە پیشدا بۆی دیایکرابوو تەنها بەسرای داگیر بکردبایە و لەسەر داوای حکومەتی مستعمرەی هندی بیخستبوایە سەر میلاکی حکومەتی هندی، بوەستابایە یاخود لەو وەختی جەنگی جهانی یەکەم بوەستابایە، یان مانگێکی تری بخایاندبایە هێزەکانی بەریتانی بگەیشتبانایە تەواوی ناوچەکە ..دیسان ئەو نەخشەیە بە جۆریکی تر دەگۆڕا دوور لەوەی ئێستا.

٤ـ ئەگەر ئەو بەرگریە هاوبەشەی عوسمانی - کورد - شیعە - لە شوعەیبەو ناوچەکانی تر سەرکەوتووبایە ئەو مەینەتیە بۆ کورد هەردروست نەدەبوو.

٥ـ تەنانەت ئەگەر دەقی رێکەوتن نامەی سایکس بیکۆش جیٚ بەجیٚ بکرابایە بە بیٚ هەموار کردن هەرچەندە زۆر خراپیش بوو بەلاّم لەو دۆخە دەگمەنەی دوای کە لە سان ریمۆ و قاهیرە هاتەدی زۆر باشتر دەبوو، رەنگە ریگە چارەو رزگاری بەدەست بهینابایە لەناودراستەکانی سەدەی بیست.

٦ـ ئەگەر شۆرشی بیست لەخواروو سەرکەوتوو بوایە بەریتانیا نەدەماو کورد بەسەربەخۆیی شاد دەبوو.

٧ـ ئەگەر حکومەتی ئەنقەرە بەسەر حکومەتی ئەستەمبۆلٚ زال نەبوایە لەخوارووش حکومەتی بەغدا بەسەر حکومەتی کەربەلا زال نەبوایە... ئەوا کوردستان وا پارچە پارچە نەدەبوو

٨ـ کۆنگرەی سان ریمۆ هەر نەکرابایە وسیڤەریش نەگۆڕابایە بە لۆزان دیسان بەدەست هینانی ئازادی ئاسان تر دەبوو وەکو گەلانی تر لەماوەیەکی کورت سەربەخۆیی بەدەست دەهات.

٩ـ ڕاپۆرتی ویلایەتی موسل ئەو بەشەی بە عیراق نەدابایە دووبارە سەربەخۆیی ئاسان تر دەبوو.

١٠ـ ئەگەر ئەتاتورك بەسەر سوڵتان زاڵ نەبوایە عەلمانی و عەشایرە کوردەکان پشتی ئەتاتورکیان نەگرتبایە هەر لە مادەکانی (٦٢ ـ ٦٤) ی سیڤەر کورد بەمافی خۆی دەگەیشت.

١١ـ ئەگەر شۆرشی ئوکتوبەری ١٩١٧ هەر نەکرابایە ئەوا دیسان تورکیای ئێستا دەبوو بەشی رووسی و ئەو مەینەتیەی بەتەنها بۆکورد دروست نەدەبوو.

١٢ـ ئەگەر فکری عەلمانی و دەوڵەتی هاوچەرخ و میری نەتەوەگەری نەهاتبایە ئەو ناوچە جۆرە نەخشەیەکی سیاسی تر دەخەملی تیایدا کورد ژێر کەوتە نەدەبوو.

١٣ـ ئەگەر پرۆژەی ئیسرائیل لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕست نەبوایە بچووبوایە ئەمریکای لاتین یان ئەفریقا ئەوا کورد دووچاری ئەو مەینەتیە نەدەبوو.

١٤ـ هەندی ئەگەری زۆر سادە هەیە بە جۆریکی تر بوایە لە زەمان و زەمینی خۆیدا جۆرە سەرەنجام و نەخشەو پلانیکی تر بۆ ناوچەکە دروست دەبوو هەر تەنها (د. عبدالله جودەت و ئیسحاق سکوتلی) ی کورد بیری عەلمانیان نەبوایە ئەوانە نەدەبونە هۆی دروست کردنی (اتحاد الترقی لە ١٨٨٩) ئەگەر ئەوەش نەبوایە ئنقلابەکەی ١٩٠٨ نەدەبوو ئیتر بالی تۆرانی زاڵ نەدەبوو تورکیای نوی نەدەهاتە کایەوە و... سەرەنجام کوردستانیکی یەکگرتوومان بۆ دەمایەوە...

لەگەڵ زۆر وورده ودرشتە ئەگەری تری هەیە سەرەنجامی ناوچەکەیان پی دەگۆرا، ئەگەر بەووردی سەرنج بدەین دەبینین زۆربەی ئەو هەنگاوانەی بونە هۆی مەینەتی کورد وەك مەشروتیەت و مەبعوسان و سەربەستی حزبایەتی و مەدەنی و دەوڵەتی مودیرن و وەچەرخان و نەمانی ئیمپراتۆریەت و وەچەرخانی مەلەکی بۆ کۆماری و بەعەلمانی کردن.. هەمو ئەوانەش لەسەرەتادا بەشی زۆری کورد پی ی خۆشحال بووە دوای تیگەیشتین کە لەزەرەریەتی.

**بەردەوامی مەینەتیەکەی (بەدەوڵەت نەبون) لەئەستۆی کێ یە:**

تەمەنی مەینەتی کورد دوو قۆناغی سەرەکیە، دروست بونی وبەردەوامی، لە هەردوو قۆناغدا لایەنە بەرپرسیاریەتەکە وەك یەك نیە، وەك لەوەی خوارەوە بۆمان دەردەکەوێ:

لە تویژینەوەکانی رابردوو بەروونی گەیشتین چەند ڕاستیەك لەبارەی کێشەی کورد، لەوانە:

١- کێشەو مەینەتی کورد تەمەنی هەزار سال و سەدان سال نیە، بەڵکوتەمەنی لە سەدەیەك تێپەڕ ناکات، لە نێوان ١٩٠٨ بۆ ١٩٢٤ سەری هەلدا.

٢- ئەو لایەنانەی بەرپرسیاری بون لەدروست کردنی مەینەتی کورد بریتی بون لە عەلمانیەتی جهانی (بەریتانیا، فرنسا، رووسیا..) عەلمانیەتی ئیقلیمی (بزوتنەوەی ئتحاد الترقی و کمالی..) تارادەیەکیش بزوتنەوەی شریفی، ئینجا عەلمانیەتی کورد کە بەو دوولایە هەلخەلەتان.

٣- واتە گەلانی ناوچەکە لەعەرەب و تورك و... خودی دەولەتی عوسمانیش بەرپرسیارنین لە دروستبونی مەینەتی کورد، هەروەها ئەو کاتی حالەتی ئیسلامی بریتی بوو لە شۆرشەکانی خەتابی لە مەغریب، عمر مختار لە لیبیا سەنووسی و عبدالقادر جزائری لە جزائر، مهدی لە سودان، شۆرشی بیست لەعیراق و حکومەتی شیخ محمود شۆرشی شیخ سعید لەکوردستان... ئەوانە دژی ئەو تەوەرانەی سەروو بووینە، لەسەروو بزوتنەوەی شریفیشمان لەخانەی دژ پۆلین کردن، دەبی خوینەر لێ ی تیك نەچی میژوو نووسەعەرەبەکان ئەو بزوتنەوەیەی بە (الپورە العربیە الکبری ـ شۆرشی عەرەبی مەزن) ناوزەد دەکەن، کەچی ئەوە شۆرش نەبوو، جاشایەتیەکی مەزن بوو بۆ بەریتانیا، بونە ئامرازیك بۆ جی بەجی کردن و بەرجەستەکردنی ئەو نەخشەو پلانەی ڕۆژئاوا بۆ ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست دایڕشتبوو، هەر شریفیەکان بون بۆیەکەم جار لەدوای صلاح الدین[٣٠٠] قودسیان لەدەست عوسمانی دەرهێناو خستیانە بەردەستی ئینگلیز بە پێی ڕێکەوتنی (شریف ـ ماکماهۆن)، ئەویش پێش کەش بە یەهوودی کرد بە پێی بەڵێنی

[٣٠٠]- رۆژی هەینی رێکەوتی ٢/١٠/١١٨٧ز لەلایەن صلاح الدین قدس رزگارکرایەوە

بەلفۆر، لەپاداشی ئەوهەنگاوانە عیراق دروست کرا بۆ فەیسەلی کوری، کەواتە بزوتنەوەی شریفی لەریزی شۆرشەکانی سەروو نین، بەڵکوبەرپرسە لەمەینەتی کورد.

هەمو ئەوانە لە دروستکردن و بناغەی دارشتنی مەینەتی کورد بەشدار بووینە، بابزانین قۆناغی دوەم ودریژە کیشانی لەئەستۆی کێیە؟

زۆر بەکورتی هەر لەئەستۆی لایەنەکانی سایکس بیکۆزادەیە، واتە رۆژ ئاوا یەکیتی سۆڤیەت و هەمو ئەوانەی لە خولگەی ئەوانە دەسورێنەوە، لەگەل فاکتەرێکی نوێی تریش، ئەویش بریتیە لە: ئەو وڵاتانەی بە پیّ ی ئەو نەخشەیە دروست بون، وەك (عیراق و سوریا و تورکیا و ئیسرائیلیش - کە بووە پاریزگاری سایکس بیکۆ و بە لفور و دژی کورد)، ئەو وڵاتانەی تر کەدروست کرا و ئیتر خالی (٣) ی سەرو وەرچەرخا، واتە میللەتانی ناوچەش بەرپرسیاریەتیان کەوتە ئەستۆ، ناکری بەچەند فەرمایشتیکی دبلۆماسی کە زۆر دووبارە دەکرێتەوەودەڵێن: کوردو عەرەب و تورك بران بەڵام دەسەڵاتەکان زوڵم لە کورد دەکەن، ئەوە تەواو نیە، راستیەکەی ئەوەیە بە پێی ئەو ئەزمونە دەولەمەندەی لە ٨٠ سالی رابووردووی مەینەتی کورد بینیمان میللەتی تورك و عەرەبیش بەرپرسن لەبەردەوامی ئەو مەینەتیە، هەروەك میللەتی کوردیش خۆشی بەرپرسیارە، هەر بەنمونە لەشۆرشی نویّ ی کوردستان کە لە ١٩٧٦ د وە دەستی پی دەکا دەبینین ژمارەی جاش و خۆفرۆش ٣٥٠ جار بە ئەندازەی ژمارەی پیشمەرگە بوە، بەشێکی زۆر لەو خۆفرۆشە دەسەلاتدارە کۆمەلایەتیانەی کورد وەك جەنەرالە عەسکەریەکانی داگیر کەر بەرژەوەندیان لەوەیە شۆرشی کورد نەسەرکەویّ نەکۆتایشی بیّ، کەواتە دیسان میراتی رۆژ ئاوا و سۆڤیەت و میراتی کەمالی و میراتی عەلمانیەتی کوردو عەشایرەکانی کوردونەبونی ستراتیژیەکی زانستی لەلایەن سەرکردایەتی عەلمانی کورد... بەرپرسیاربوینە لە دریژە کیشانی مەینەتی کورد، هەمان ئەو نەخشە جهانیە رەنگی داوەتەوە ناو کوردستان و دەولەتەداگیرکەرەکانیش، ئەگەر بەوردی ئەو میژووە بپشکنین لەدوای مەینەتی (واتە لە سالی ١٩٢٤ تا ٢٠١٠) دەبینین لیبرال دیمکوراس و عەلمانی ناشیونالیزمی لەنێو دەسەڵاتی داگیر کەر (کە لە خولگەی رۆژ ئاوا دەسورینەوە) زیاتر دژی کوردن، وڵاتەکانیش زیاتر ئەوانە بەرێوەی دەبەن، لەهەمان کاتدا شیوعی و چەپیەکانیش هەلویستیان بەو ئەندازەیەی روسیای کۆن خراپ بوینە، شیوعیەکان پێیان

وابو میللەتی کورد ئومە نیە بە پێی ئەو مەرج و بنەمایانەی، کە ستالین بۆ ئوممەی دایناب‌و!، بۆیە گەلی جار لەلایەن شیوعیەکان بزوتنەوەی کورد بە تەقەلای نازی و فاشی و دەرەبەگی و رەجعی و لەخزمەت ئیستعمار پۆلین کراوە، هەربۆیەش عیراقچیەتیان بەسەر کوردستان چەسپاندوە، تا ئەو رادە بەشیك لەو چەپیانە لەدوای راپەرینیش لەسەر دیوارەکانی کوردستان دەیان نوسی (کوردایەتی شەرمەزاریە)، هەرچەندە ئێستا تارادەیەکی چاك ئەو دۆخە شازەیان چاکردۆتەوە بە پێی تۆبەیان کردو حزبی شیوعی کوردستانی دروستکرا، بەکورتی هەرلایەن و مەدرەسەو دام و دەزگایەك لەسەر بنەمای عەلمانی و بەهای سەرمایەداری و بنەمای بەرژەوەندی بیت، ئەوە زیاتر لەخزمەت بەرجەستە و پتەو کردنی سایکس بیکۆیە، کۆنکریتی زیندانی کورد تۆکمە و ئەستور تر دەکا، دەرگا داخراوەکان پۆلایین تر دەکا، پیچەوانەش بە پیچەوانەوەیە. ئەوەش کۆدی کۆمەڵێك بابەتی گرنگمان بۆ دەکاتەوە، لەپیش هەموان دارشتنی ستراتیژیەتیك بۆ رزگاری کورد، بەهۆیەوە تێدەگەین لەو هەمو گۆرانکاریانە لەو هەمو مدرسە سیاسیانە، لەتەیارە فکریەکان... کامیان لە بەرژەوەندی کوردەو کامیان لەدژە کامیان نەرم ترە کامیان زۆر رەق...

کەواتە تەنها دروست بونی مەینەتی کورد لە ئەستۆی عەلمانی نیە، بەڵکو بەردەوامیەکەشی هەر عەلمانیەتە ئەگەرچی ناسنامەی هۆی بەردەوامی تارادەیەك جیایە لەگەڵ لەدایکبونەکەی.بەرپرسیاریەتی ئەسلی هاوپەیمانان بەڵام ئەوبەرپرسیاریەتەی ئێستا بریتین لە تەیاری عروبی [**] وتۆرانی وشۆڤێنی کە لە فەرهەنگی ئەوانە ناووزاراوەی کوردستان قەدەغەیە، ئەوانەش زاڵن بەسەر دەسەڵاتە دروست بوەکانی ناوچەکە، ئەگەر ئیمپریالیزم ومەدرەسەی عەلمانیەتو پرۆژەی ئیسرائیل مەینەتی کوردیان دروست کردبێ بە دابەشی کوردستان بەسەر دەوڵەتە داگیرکەرەکان، ئەوا ئەوانەش بەرپرسیاری یەکەمن ئێستا بەنەگێرانەوەی ئەو مافە، زیاتر لەوەش لە جیاتی ئەوەی نازی کورد رابگرن کە زولمی لێکراوە ئەوانیش هەڵساون بە پەیرەوی سیاسەتێکی رەگەزپەرست بەرامبەر کورد هەر لەسەرەتای کێشەکە، بەڵکو زیاتریش هەوڵیان داوە بە دەستوریانە ویستویانە کورد و

[°] وەك چۆن معمر قەزافی لە کۆنگرەی سەرانی عەرەب لە بەغدا وتی: ئیستعمار سنوری لەنێوانمان دانا و (حوسنی)یش (اسلاك شائکە)ی بۆ زیاد کردوە..

کوردستان بتوێنەوە، بەو مادەیەی کە دەڵێت عێراق یان سوریا* (جزء من الأمة العربیة)، لە دەستوری تورکیاش (ئەنایاسا) لە مادەی (٦٦) دەڵێ: هەرچی لە تورکیا دەژی تورکە، ئەوەش دەقەکەیەتی:

Türk valandaşlığı
MADDE ٦٦. – Türk Devletine vatandaşlık bağı ile bağlı olan herkes Türktür. Türk babanın veya Türk ananın çocuğu Türktür. (Son cümle mülga: ٣,١٠,٢٠٠١ - ٤٧٠٩/٢٣ md Vatandaşlık، kanunun gösterdiği şartlarla kazanılır ve ancak kanunda belirtilen hallerde kaybedilir. Hiçbir Türk، vatana bağlılıkla bağdaşmayan bir eylemde bulunmadıkça vatandaşlıktan çıkarılamaz. Vatandaşlıktan çıkarma ile ilgili karar ve işlemlere karşı yargı yolu kapatılamaz.

لەسەر ئەو بنچینە زانایانی بەریتانی زانیویانە ئەو دۆخەی بەریتانیا بەرپای دەکا لەناوچەکە ناثارامی وشۆرشی لێ بەرپادەبێت، تۆینبی دەڵێت: لکاندنی بەشێك لەکوردستان بە عێراق چواندنی عیراق وکوردستانە پێکەوە، شارەزایەکی وەزارەتی ناوخۆی بەریتانی لەو بەڵگەنامەیەی خوارەوە ئەوهەنگاوە ڕون دەکاتەوە[٢٠١]

ئەو پرۆژە ئایدیۆلوجیانەی تر کە لە ناوچەکە ئیشیان کردووەجگە لە چەپیەکان ئیسلامیەکانیش کەمێکیان بەر دەکەوێ، بەتایبەتی ئیسلامی عەرەب، ئەوانەشی بێ سەلبیات نەبووینە لەتێنەگەیشتن لە دۆزی ڕەوای کورد بەڵام بەو ڕاستەوخۆییە زیان بەخشی نەبووینە و بەرپرسیاریەتیان لە ئەستۆ نیە سەبارەت بە دروستبون و بەردەوامی مەینەتی کورد.

---

*ـ سەیری دەستوری عیراق ١٩٦٨ بکەو ودوایش هەردووبارە دەبۆوە: المادة الأولى: الجمهورية العراقية دولة ديمقراطية شعبية تستمد أصول ديمقراطيتها وشعبيتها من التراث العربي وروح الإسلام. الشعب العراقي جزء من الأمة العربية هدفه الوحدة العربية الشاملة وتلتزم الحكومة بالعمل على تحقيقها. دەستوری سوریاش١٩٧٠ و، ١٩٧٣: المادة الأولى ١- الجمهورية العربية السورية دولة ديمقراطية شعبية واشتراكية ذات سيادة لا يجوز التنازل عن أي جزء من أراضيها وهي عضو في دولة اتحاد الجمهوريات العربيه.٢- القطر العربي السوري جزء من الوطن العربي. ٣ـ الشعب في القطر العربي السوري جزء من الأمة العربية يعمل ويناضل لتحقيق وحدتها الشاملة.لەو دەستورە ٤٩جار وشەی عەرەبی لێهاتوە بۆ یەکجاریش ناوی کوردی تیا نەهاتوە.

ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ ئایدیۆلۆژیە ڕەگەزپەرستیەکانی شۆڤینی لەفرنسا وفالانژیسی لە ئیسپانیاو نازی لە ئەلمانیاو فاشی لە ئیتالیا و(شعب الله المختار)ی یەهودی و...، لەمادەی (٤)ی بەرنامەی(نازی)- حزبی سۆشیالیستی کریکاری ئەلمانیا- هاتووە: (هاولاتی ئەلمانیا ئەوانەن کە خوینیان ئەلمانە) بروانە مەوسوعەی جودی –مادەی: نازی.

[٢٠١]ـ رقم: ١٢\١١ شباط ١٠٣٠\١ الى: المستشار في وزارة الداخلية

...لا اريد أن أعطي انطباعا بأنني خبير في التنبوء بحصول الثورات والتمرد ولكن ما أريد التأكيد عليه هنا ان خبرتي حول العشائر في الجنوب العراق يمكنني ان أتوقع بحصول انهيار وفوضى في كردستان اذا استمر الغلاة من القوميين العرب في مواقفهم وممارساتها الحالية ضد الكرد في المنطقة الجبلية وستكلف ذلك الحكومة العراقية جهودا اكثر لتهدئة الأوضاع من تلك التي كلفت الحكومة في الماضي من أجل السيطرة على الوضع .توقيع: سجينغ المفتش الإداري لواء اربيل

## هۆیەکانی ئالۆز بونی کێشەی کورد

دوای هەردوو جەنگ میللەتانێکی زۆری جیهان رزگاریان نەبوو، ئەوانە دووبەش بون:

١ـ ئەو میلەتانەی کەوتنە ژێر دەستی ئیستعمار و ولاتە زل هێزە گەورەکانی وەك بەریتانیاو فرنسا وئیتالیا وپرتغال و.. وەك میلەتانی (جەزائیر، لیبیا، ئەنگۆلا، ڤیتنام، ....)ئەوا بە هۆی گەشەی یاسایی ومەدەنی جیهان لەلایەك وخەباتی ئەو میلەتانە بە ئاسانی رزگاریان بووو ئێستا دەوڵەتن.

٢ـ بەشەکەی تر ئەو میلەتانەی کەوتنەژێر دەستی دەوڵەت ومیلەتێکی بچوك و دەڤەری، کێشەکەیان زۆر قورس بوو[٣٠٢] ئەوانەش دووبەشن:

أـ ئەو میلەتانەی تەنها کەوتنە سەر یەك حکومەت وەك(ئەریتریا، تەیمور، خوارووی سودانی ئێستا، ...).

ب ـ ئەو میلەتانەی بە دابەشی کەوتنە سەر چەند حکومەتێك لە تەنیشت یەکتر ئەوا کێشەی ئەوانە زۆر ئالۆزو سەخت بوو، لەوانە (کوردستان، باسك، بەربەر، بلوش، فلستین ...)، بەشێکی زۆر لە برایانی عەرەب زۆر بە توندی دژی ئەوەن کێشەی کوردو فلستین پێك بچوێنی، بۆیە هەلوەستەیەکی خێرای لەسەر دەکەین، چونکە ئەوان دەڵێن فلستین دۆزێکی ڕەوایەو خاکی داگیرکراوە بەڵام کێشەی کوردلەو ئاستە نیەو لەگەل برای خۆیتی[٣٠٣]، بۆیە لایەنە لەیەکچوەکانی پیشان دەدەین:

١ـ هەردوولایان لەدوای جەنگی جیهانی یەکەم ولە کۆنگرەی (سایکس پیکۆ) نەخشەی دابەشی ومەینەتیان بۆ دانرا.

٢ـ مەینەتی هەردوولا لەوە هات ناوچەکەیان دابەش کردو دەوڵەتیان بۆ دروست کردن کەچی کوردو فلستینیان بێ بەش کرد.

---

[٣٠٢] ـ لەو بارەیەوە تێبینی ئەوە بکە بریتانیا سەربەخۆی بە زۆربەی موستەعمەرەکانی خۆی دا کەچی لەگەل ئیرلەندای سەروو هەروا کێشەی هەیە ..ئەوە ڕاستی ئەو تیۆرە دەسەلمێنێ کە لە پەرەگرافی(٢) هاتوە

[٣٠٣] بۆ وەلامی ئەوە وا چاکە ڕای (ئیمام نیین تەیمیە بهێنینەوە کەتا ڕادەیەك لایەنگیری عروبیە) ودەڵێ: داگیرکەر هەر داگیرکەرە ئەگەر مەسحەفیشی لەسەر سەری بوو.

٣ـ مەینەتی هەردوولا لەیەك كارخانە دروست بووە، داكیركەری هەردوولا بەیەك (بەشی ٧ی سیڤەر)دروست بون، عیراقی داگیركەری كوردستان بە پێی مادەی ٩٤ دروست بوو ئیسرائیلی داگیركەری فلستینیش بە مادەی ٩٥[٣٠٤]

٤ـ كوردستان بە پێی بڕیارەكانی سایكس پیكۆو سان ریمۆو لۆزان بۆ چوار بەشی سەرەكی دابەشكرا فلستینیش بە هەمان بڕیارو لەكۆتاییەكەی بە بڕیاری ١٨١ بۆ چوار پارچە دابەشكرا، بەو شێوەیە:

أـ ٥٥٪ی فلستین بۆ دەوڵەتی ئیسرائیل تا ئێستاش عەرەبی ئەو ناوچەیە بە عەرەبی ١٩٤٨ ناودەبرێن.

ب ـ غەزە بۆ میسر.

ج ـ زیفە بۆ ئوردەن.

د ـ ناوچەی قودس بۆ نێودەوڵەتی

٥ ـ هەردوولا بە پێی (مادەی ٢٢ی بەشی یەكەمی عەهدی عوسبەتولئومەم)كەوتنە ژێر سیستەمی ئینتدابی دەوڵەتە داگیركەرەكەو لەوێش بۆ ژێر ئینتدابی بەریتانی[٣٠٥]

---

[٣٠٤]ـ رێكەوتنامەی سیڤەر ...بەشی (حەوتەم) سوریا و میزۆپۆتامیاو فەلەستین

مادەی (٩٤): هەریەكە لە سوریا و میزۆپۆتامیا(عیراقی ئیستاـ م ع) و بەشێوەیەكی كاتی دەبنە ولاتی سەربەخۆ بە پێی مادەی (٢٢)ی بەشی یەكەمی (میساقی كۆمەڵەی كەلان) دەكەونە ژێر راوێژی ولاتانی ئینتداب كراو بەسەریان هەتا ئەوكاتەی دەتوانن لەسەر پێی خۆیان بوەستن. بۆ ئەو مەبەستەش لەدوای ١٥ رۆژی تر لیژنەیەكی سێ قۆڵی (بەریتانی، فەرەنسی، ئیتالی) و ئەندامێكی عوسمانیش پێك دەهێنرێت، بۆ بەدواداچوونی ئەو سنورانەی لە مادەی (٢٧) هاتوون بەجۆرێك بۆ دەستنیشانكردنی سنوری سوریا نوێنەرێكی ئەوان بەشدار دەبێت بۆ سنوری میزۆپۆتامیاش نوێنەرێكیان ئامادە دەبێت، بریاردان لەسەر سنوری تری ئەو دەوڵەتانە و دیاركردنی و هەڵبژاردنی جۆری ئینتداب لە ئەستۆی هاوپەیمانە سەرەكیەكانی دەبێ.

مادەی (٩٥): لایەنەكانی ئەو رێكەوتنە قایلن بە جێبەجێ كردنی ناوەرۆكەكانی مادەی (٢٢) بۆ ئیدارەی فەلەستین بەوەی لەژێر ئینتداب بێ لە چوارچێوەی ئەو سنورەی هاوپەیمانان بۆی دیاری دەكەن، ئینتدابكەر بەرپرسە لە چالاك كردنی جارنامەی ١٩١٧/١١/٢(مەبەستی بەڵێنی بەلفۆرە-م ع) كە لەلایەن بەریتانیاوە دەرچووە و لایەنەكانی تری هاوپەیمانانیش گرتویانەتە بەر، بۆ ئەوەی قەوارەیەكی نیشتمانی بۆ گەلی جولەكە لە فەلەستین دابمەزرێ، دەبێ رونیش بێت هیچ شتێك رێگر نەبێ لە مافە ئاینی و مەدەنیەكانی غەیرە جو هەروەك جولەكەكان لە ولاتی تر هەیانە.

لایەنی ئینتداب بەڵێن دەدا بەخێرایی لیژنەیەك پێك بهێنن لەگەڵ سەرۆكێك كە لەلایەن (كۆمەڵەی گەلان)ەوە دیاری بكرێ بۆ ئەوەی لەو بەندە بكۆڵێتەوەو چی پێویستە بۆ چین و توێژە جیاجیاكانی بكرێن.

[٣٠٥]ـ هەردوو لائیحەی ئینتداب لە كۆتایی ئەو نوسینە بخوێنەوە

٦ـ بە هۆی ڕێکەوتنی مەلیك فەیسەل وحایم وایزمان عێراق وفلستین دروست کران، تیایدا هەردوولا کەوتنە مەینەتی

٧ـ هەردوولا ئەو ڕێسایەیان بەسەر پیادەدەبێ کە جمال عبدالناسر بۆ (جۆن کەنەدی) نوسیویەتی لەوەڵامی ئەودروشمەی (هرتزل ـ نیشتمانێکی بێ خاوەن بۆ میلەتێکی بێ نیشتمان)دەڵێ: فلستین نیشتمانی بێ خاوەن نیە تا پێشکەشی میلەتێکی بێ نیشتمان بکرێت، کوردستانیش ئاوا نیشتمانێکی بێ خاوەن نیە ....، لەلایەکی تر دەڵێ:(لقد اعطى من لایملك، وعدا لمن لایستحق، ثم إستطاع اثنان (من لایملك ومن لایستحق)بالقوة والخدیعة ان یسلباصاحب الحق الشرعی حقة فیما یملکة وفیما یستحقة)[٣٠٦]، ئەوە کت ومت کوردستانیشە

٨ ـ هەردوولا دووچاری داگیرکاریەکی دەوڵەتی تازە دروستکراوو نامۆ بون

٩ـ هەردوولا دووچاری چەوساندنەوە وپاکتاوی ڕەگەزی بوینە، لە فلستین (مستەوتنی یەهودی) لەکوردستانیش(مستەوتنی تەعریب)

١٠ـ شۆرشی هەردوولا بەتیرۆروتێکدەرو ناوناوتۆرەی تر وەسف دەکرێت، لە پرۆتۆکۆلی(ژ:١٩) شۆرش بە (سەگ بە فیل ڕەوین ) وەسف دەکات

...لەگەل زۆر لای تری وێك چوو.

جیاوازیەکانی: هەندێ جیاوازیشی هەیە

١ـ کوردستان هەر دەسەڵاتی کوردی تیا بوە لە فەلستین دەسەڵاتی تایبەتی عەرەبی تیا هەلنەکەوتوە  تەنها لە چوارچێوەی خیلافەتی ئیسلامی بوە

٢ـ لەسەردەمی عوسمانی قودس سنجاق بوو کەچی کوردستان لەسەرووی ویلایەت ولە ئاستی ئیالەت بوو.

٣ـ ناوەکەشی گوزارش لە پەیوەندیەکی مێژوویی وجوگرافی وکۆمەلآیەتی و سیاسی ویاسایی خاکی کوردان دەکا، بەلآم فلستین ناوێکە گوزارش لەو پەیوەندیە لەگەل عەرەب ناکا، لە بنەچەشدا ناوەکە یۆنانیە ودەگوترێ یەکەم جار هیرۆدۆتس بەکاری هێناوە.

---

[٣٠٦]ـ دەقی نامەی جمال عبدالناصرلەوەلآمی نامەکەی١١/مایۆ/١٩٦١ی (ج کەنەدی) سەرۆکی ئەمریکالەکتێبی((فلسطین في رسائل عبدالناصر وکندي )

٣ـ شان بەشانی عەرەب گەلی یەهودیشی لێبوە ناویان (سابرا) بوە، لە کوردستان عەرەبی لێنەبوەبەکۆمەل.

٤ـ ئەوان ئێستا ولاّتانی عەرەبیان لە پشتە بەلاّم کورد بێ پشتیوانە.

٥ـ دەولّەتی داگیرکەری فلستین لە چاو داگیرکەری کوردستان بە ویژدان ترو دیموکراسی ترە.

٦ـ داگیرکەری فلستین هەردوولا یەك رەگەزن هەرودك لە دیباجەی رێکەوتننامەی فیصل وایزمان هاتوەو لە ئەدەبیاتی نەوەی یەکەمی تەیاری عروبی وادەهات، کەچی داگیرکەری کورد (جگە لەفارس) ئەوانی تر لەگەل کورد یەك رەگەز نین. ...لەگەل زۆر ووردە خالی تر.

بەو جۆرە کێشەی کورد بە ئەندازەی فلستین ئالۆزتریشە، بەلاّم ئەو چەند دەولّەتێکی عەرەبی لە پشتە وکورد بێ پشتیوانە، بۆ ئەوەی رزگاری تەواو بێتە دی، یان دەبێ چەند دەولّەتێکی کوردستانی دروست بێت، یاخود لەسەرەتادا پێویست بەوە دەکا کە هەنگاوی یەکەم کوردستان لە ژێر سایەی داگیرکەرێك کوردستان کۆکەیەوە، نەك لەژێر سایەی چەند داگیرکەرێك بن وهاریکاری یەك بکەن، بۆ ئەو مەبەستە لەبەلگەنامەی ئەمریکی ـ بروسکەی ژ:٩٠٤بالوێزخانەی ئەمریکی لەبەغدا بۆ وەزارەتی دەرەوە لە ١٩٦٢/٩/٢٠ هاتوە: کە بارزانی پیشنیاری بۆ شای ئێران کردوە کوردستانی دیوی عێراقیش بە ئێران بلکێندرێ و سەرجەم کوردستانێکی یەکگرتووی خودموختار دروست بێت[٣٠٧]

ئەوە پیشنیارێکی ستراتیژی بوە بۆ کردنەوەی ئەو گرێکوێرە ئالۆزانەی دوچاری کوردستان بوە، لەو جۆرە پێشنیارانە بەنا فەرمی دەووترێت کە مام جلالیش بۆ تۆرگۆت ئۆزال وەها پیشنیارەکی کردوە، لەوانە بە روون تر بۆمان دەردەکەوێ کەستاندنی ویلایەتی موسل لەلایەن بەریتانیا لە فرنساو دوایش لە تورکیا بەشێکە لە ئالۆزبونی کێشەی کورد

[٣٠٧]ـ کوردو کوردستان لە بەلگەنامەی ئەمریکی ل٧٧

لێره بەولاوه باس لەوه دەكەین كەكێشەی كورد ئالۆزیەكەی ئەوەندە سەختە بۆ ئـەوەی ڕزگاری بێت چی بەسەرهاتوه چی پێویستە، ئەوەش هەر بریتیە لە بەردەوامی گفـت وگـۆ لەبارەی هۆیەكانی ئالۆز بونی كێشەی كورد..

# بەشی چوارەم

## دەروازەکانی رزگاری کوردستان

بارودۆخی نێو دەوڵەتی: دوای خەملینی ئەو نەخشە سیاسیەی جهان و سەرهەڵدانی دەوڵەتان لەسەر بنچینەی ناشیونالیزمی عەلمانی، بستێك خاك نەما بێ سەرودری و تاپۆی یاسایی دەوڵەتیکی دیایکراو، ئیتر ئەو میللەتانەی نەبونە خاوەن دەوڵەت کەوتنە سەردەوڵەتیکی تر، بە پێی کتێبی بەناوبانگی (اقليات فى خطر)٢٣٣کەمایەتی چالاك لە٩٣ ولاّت هەیە بۆیە بەشی هەرە زۆری دەوڵەتانی جهانی لەفرە نەتەودو فرە رەگەزو ئاین و چین و توێژ پیك هاتون، دەگوتریّ سەرجەم تەنها١٢ولاّت هەیە نزیکە بتوانین بڵێین: لەیەك میللەت ویەك رِەگەز پێکهاتبێت، لەوانی ترکێشەیەکی زۆرسەری نایەوە لەدابەشکردنی دەسەلاّت و ئەرك ماف، هەندێکیان لەکاتی دروست بونی سنور پەرِینەوە لە شێوەی ئالّ وگۆرِ وەك نێوان تورکیاو یۆنان لە ١٩٢٠، لە نێوان ئەلمانیاو پۆلزانۆ لەسەرووی ئیتالیا لە١٩٣٠تا ١٩٤٥، لەو دواییەش پاکستان وهندستان ..، بە هۆی فرە لایەنی بەشی هەرە زۆری ولاّتانی جهان تیزو سیستەمی سیاسی و دەستوری ولاّتیان گۆری لەدەوڵەتی ناشیولیزمی بۆ دەوڵەتی نیشتمانی، کەتیایدا نەتەوەو رِەگەزێك سەرودرو پلەیەك نەکرا، بەڵکو دەوڵەت ویاساسەرودر کرا، تاکەکانی ئەو دەوڵەتەش لەرِیّ ی نەتەوایەتی وناشیولیزمی کۆنەکرانەوە، بەڵکو لەسەر بنچینەی بونیان لەو ولاّتە کۆکرانەوە، لەوەش زاراوەی هاولاّتی وکۆمەڵگەی مەدەنی سەری هەڵداو جیّ ی هاونەتەوەیی گرتەوە، بەمەش زۆربەی کێشەکان چارەسەر کرا، ئیتر بنەمای (کەفائە ـ تواناو خەڵکی شایستە لەشوێنی شایستە) کەوتە نێو پرۆسەی دەوڵەت، جیاوازیەك نەما لەنێوان تاکەکانی ئەو دەوڵەتە، دەرفەت بۆ هەمو لایەك وەك یەك رِەخسێنرا، بەپێی توانا ئەرکیشی بە یەکسانی دابەشکرا، ئیتر سیستەمی دەسەلاّتی سیاسیش بەدیمکراسیانە بەرِێوە چوون، بەو شێوەیە تارادەیەکی چاك کێشەی جیایی پێکهاتەو بونی فرەنەتەوە و رەگەز و ئایین لەیەك ولاّتی ئاوادا چارەسەر کرا.

هەرچی بەشێکی تر لەو وڵاتانە هەر پەیوەست بون بە دەوڵەتی ناشیونالیزمی و سیستەمی توتالیتاری و سەربازی و دیکتاتۆری، تیایدا رەگەزسالاری حوکم ڕان بون، وەکو وڵاتانی عەرەبی و تورکیاوسربیاو هەندی وڵاتی ئەفەریقی و ئاسیایی تر، لەو وڵاتانە نەتەوەی سەردەست و نەتەوەی بن دەستی لێ سەرهەڵدا، سەرەنجامەکەشی ئەوەیە، ئەگەر ئەو نەتەوانە ردسەن و بەربەرگری بن ئەوا وەردەچەرخێنە شۆرش و بەرگری و رزگار بون، ئەگەر میللەتێکی لە رزۆك (بەرگەی - مقەوەماتی) نەتەوەییان نەبێ ئەوا بەرەبەرە دەتوینتەوە لەنیو نەتەوەی سەردەست، لە عیراق و تورکیا و سوریا نمونەی زۆر زیندووی ئەو بابەتەن، عەرەب لە تورکیا توایتەوە، تورکمانیش لەهەمو ناوچەکانی عیراق هەبون توانیەوە تەنها لە کوردستان ماون، ئەویش بەهۆی بەرگری کورد لەو وڵاتانە، ئەو ڕەوتەی وڵاتانی عەرەب و تورکیا وسربیا سەرەنجامەکەی ئەوەیە:عەرەب لەگەل هەمو نەتەوە دراوسێکانیان لە (بەربەر، مسیحی، دارفۆری، قبتی، کورد، حوسی، شیعە، تورکمان) ناکۆکن، بەهەمان شێوەش تورکیا لەگەڵ هەموان ناکۆکەو پیش ناکەوێ، سربیاش پارچە پارچە بوو

لە سەر ئاستی نێو دەوڵەتی ویستراوە چارەسەریەکی ئەو کێشەیە بکرێت، میساقێك بۆ نەتەوە یەکگرتوەکان داڕژاوە پێکهاتوە لە١٩ بەش و (١١١) مادە)، بەشی یەکەم تایبەتبە (مەبەستەکانی) دامەزراندنی نەتەوە یەکگرتووەکان و لە یەکەم مادە باس لەوە دەکا بۆ ئەوە دروستبون تامیللەتان بەمافی چارەنووسی خۆیان بگەن، کەچی تا ئەو ساتەش بە دەیان کێشەی وەك کورد لەجهان ماوەتەوە لە ئاسیا لە ئەفریقا و هەتالە ئەوروپاش، هەردوو ئەمریکاش، وەك مادەی یاسایی دەقی لەسەرە پشتگیری میللەتانی ژێر دەستە دەکا لە پەرەگرافی (٢)ی مادەی (١) و مادەی (٥٥)ی میساقی نەتەوە یەکگرتوەکان، هەروەها لەبڕگەی(٣)ی مادەی (٢٩) و بڕگەی(٢)ی مادەی(٢٦)ی جاڕی مافی مرۆڤ [٣٠٨]، لە بنەچەدا بەو پاساوە یاساییانە ئەو مافەی چارەنووس هاتووە:

١- پاراستنی ئاشتی

٢- قە لاچۆی چەوساندنەوە.

---

[٣٠٨]- میساقی نەتەوەیەکگرتوەکان لە ١٩ بەندو١١١مادە پێکهاتوە، جاڕنامەی مافی مرۆڤیش لە ٣٠ مادە پێك هاتوە، بەپێی بڕیاری ٢١٧ لقی (أ) (خولی-٣) لە ١٠ /دیسمبر/ ١٩٤٨ئەو جاڕنامەیە لەلایەن نەتەوەیەکگرتەوەکان کەواهی کرا.

٣ـ پێکەوە نەژیانی چەند پێکهاتەیەك پێکەوە.

٤ـ مافی مێژوویيان لە سەر خاکی خۆیان.

٥ـ نەبونی راپرسی کەپیشانی بدا بە پێکەوە ژیان قایلن.

٦ـ یان پیێ شێل کردنی رێکەوتنێکی نێوانیان ...بۆیە بەردەوام برِیاری تر لەو بارەیەوە دەرچوە، لەوانە: چەندین بریاری تریش دەرچوو لەوانە:

١ـ لە ساڵی١٤/دیسمبر/١٩٦٠ برِیارێکی تری ( مافی چارەنووسی ) درا بە ژمارە ١٥١٤ خولی(١٥)بەسەردێری: (إعلان منح الأستقلال للبلدان والشعوب المستعمره) تیایدا هاتوە: (إن الجمعية العامة تعلن لجميع الشعوب حق في تقرير مصيرها، ولها بمقتضى هذا الحق أن تحدد بحرية مركزها السياسي، وتسعى بحرية الى تحقيق نمائها الأقتصادي والاجتماعي والثقافي).

٢ـ برِیارِی ژ:٢١٠٥ خولی ٢٠ ـ ١٩٦٥

٣ـ مافی بەرگری لە پێناو چارەنوس ـ بریاری ژ:٢٦٢٥ خولی ٢٥ لە٢٤/ئۆکتۆبەر/١٩٧٠

٤ـ مافی بەکارهێنانی چەك لە پێناو چارەنوس ـ بریاری ژ:٣٠٧٠ خولی٢٨لە ١٩٧٥

٥ـ بریاری ٣٣١٤ساڵی ١٩٧٤

بەڵام لەلایەکی تر ئەو میللەتانەی بی دەوڵەتن و دەنگی یاساییان نیە نازانن چۆن ئەو مافە بەرجەستە بکەن، چۆن لەو جهانە نوێیە گوزارش لە بونی خۆیان بکەن، چۆن بە ئاشتیانە ئەو برِیارِانە بیان گرێتەوە، ئینجا بون بەئەندام لە (UN) شمولی میللەتان ناکا جگە لەدەوڵەت هەروەك لە بەشی دووەم لەمادەی (٣) تا (مادەی (٦) میثاق الامم المتحدة) باسی بەئەندام بون دەکا، بۆ نمونە لەپەرگرافی (١) ی مادەی (٤) وا دەڵی: ((العضوية فی الامم المتحدة مباحة لجميع الدول الاخرى المحبة للسلام والتى تاخذ نفسها بالالتزامات التى يتضمنها هذا الميثاق والتى ترى الهيئة انها قادرة على تنفيذ الالتزامات وراغبة فية )) لەمادەی (٥) ی بەڵێڵی شتیکی بە جیێ هێشتوە، لە کۆتایداتەنها دەوڵەت دەناسی نەك میللەتان، کەواتە ناوەکەش هەڵەیە، کە دەڵێن: (أمم المتحدة) بە لکو راستیەکەی ئەوەیەدەوڵەتە یەکگرتوەکانە، بۆیە ئەو بریارو مادانەی جیێ بەجیێ ناکرێ ئەگەر میللەتەکە خۆی پشێویەکی گەورە دروست نەکاو نەیکاتە دیفاکتۆ (ئەمری واقع)،

بۆیەش دەنگی میللەتانی ژێر دەستە لەخنکان دایە، لەهەموی سەیرتر ئەو دەنگە ئەو کاتە یاسایی دەبێ، کە لەری ی ئەو دەوڵەتەی داگیری کردوون ئینجا وەردەگیری، ئەوەش ئەستەمە و نەشیاوە، چونکە خۆی داگیرکەرە ئەو جۆرە دەوڵەتانە دەنگی ئەوانە بەسەلامەتی و دروستی ناگەیەنێ بەو شێوەیە زۆربەی میللەتانی ژێر دەستە لەسەرەتایی سەدەی بیستەم دووگرفتی مەزنیان بۆ دروست بو، یەکەمیان خودی داگیر کەرەکە، دووەمیان سازنەبونی باری نیو دەوڵەتی، ناچار بەشیکی زۆر لەو میللەتانە سوودیان لەناکۆکیە جهانیەکان وەرگرت و دەرباز بون، وەك سوود وەرگرتن لە: هەردوو جەنگی جیهانی، ناکۆکی ڕۆژ هەلاتی و ڕۆژ ئاوایی کە لەسیەکانی سەدەی(٢٠) دەستی پێکرد تاکۆتایی سەدەکە، یان ناکۆکی ئیقلیمی وەك جەزائیر و بەرەی پۆلیساریۆ لەدژی مغرب، پاکستان و کشمیر لەدژی هند، بەشی زۆری میللەتان ڕزگاریان بوو، بەڵام کوردو هەندێ میلەتی تریش مایەوە... بابزانین هۆیەکەی چیە؟ ئاخۆ ڕەسەن نیە؟ شۆرش و بەرگریان نەکردووە؟ ئاتەبان؟ بێ سەرکردەن؟

نەخیر ئەوانە هۆی سەرەکی نیە، ئێستا ئەو هۆیە دیاری دەکەین کە بووە هۆی دریژەکیشانی شۆرش کورد لەسالی(١٩٢٥)ەوە تا ئەو ساتەو نەگەیشتووە بە ئامانج، هەلبەتە لەسەرەتادا نەبونە دەوڵەتمان باس کردو گفتوگۆمان لەسەر فاکتەرەکان کرد، ئەوە جیایە لەگەل ئەو باسەی ئێستا، ئەو هۆی بەدەوڵەت نەبون بوو، لەسەرەتای سەدەی بیستەم لە کاروان بە جی ماو بووە میللەتێکی ژێر دەستە، بەڵام دیسان ئەو میللەتە ژێر دەستانەی وەك کوردیش رزگار بون بۆ چی شۆرشەکانی کوردی یەك لەدوای یەك بی ئاکام بون هۆیەکەی بەگشتی ئەوەی خوارەوەیە: وەك لەسەروو باسمان کرد میللەتان دووگرفتیان هەبوو کەچی بۆ کورد سێ یە:

لەراستێدا کۆمەڵێك هۆکارو کەم و کوری لە پلان و ستراتیژیەت و پەرتەوازەیی هەبووە، کە: بەشێکی زۆر لە سەرۆك عەشیرەت و بەرژەوەند پەرستانی کورد لە لایەك وبازرگانانی شەڕ لە دەوڵەتە داگیرکەرەکان لێرە بەرژەوەندیان یەك دەگرێتەوە کە شۆرش ونائارامی نەکۆتایی بێت و نەسەریش کەوێ

بەلاّم سەرەکیەی ئەوانە نیە، بەڵکو ئەوەیە کە میللەتانی ترلە قۆناغی رزگاریدا ڕوبەروی دووگرفت دەبونەوە یەکەمیان: خودی داگیر کەرەکە.

دووەم: ئەرەخسانی بارو دۆخی دوەلی، کەکەمتر هاریکاری بزوتنەوەی رزگاری و میللەتانی ژێردەستەیان داوە، زیاتر بەرژەوەندیان لەگەڵ دەوڵەتەکە بووە، سەرەڕای ئەوەش (ویفاق)و ئاشتی لە فەرهەنگی نەتەوە یەکگرتوەکان ئاشتی نێوان دەوڵەتەکان بوە، نەك میلەتان، وایکردوە میلەتی بێ دەوڵەت گرفتێکی گەورەی لەگەڵ یاسای نێو دەوڵەتی هەبێ، هەرچی کێشەی کوردە ڕوبەڕوی سێ گرفتی ترسناك بویتەوە.

یەکەم: کێشە لەگەل داگیرکەرەکە.

دووەم کێشەی جهانی وهاوبەشە لەگەڵ میلەتانی ژێردەستەی تر.

سێیەم کێشەی ئیقلیمی ئەوکێشەو گرفتە سەربارو تایبەتە بەکورد وچەند میلەتێکی تر، بەدەگمەن هەندی کێشەی تری ئاوا هەیە وەك بەربەرەکان لە ئەفریقا کەدابەش بووینەوە (٢٢ ـ ٢٥)٪ کەوتۆتەجەزائر بەشێکی نادیار لەمەغریب و مۆریتانیایە، تارادەیەك کێشەی باسك کە (٣) هەرێمی کەوتۆتە دیوی فرنساو (٤) هەرێمیش کەوتۆتە دیوی ئیسپانیا[٣٠٩] ...، ئەو جۆرە دابەشیە گورزیکی کوشندەیە لەو میللەتانە، چونکە داگیرکەرەکان کە دراوسێ ی یەکترن هاریکاری دەکەن لە دژی بزوتنەوەی رزگاری خواز، کەلێنێك ناهێڵنەوە بۆ یارمەتی وەك باقی بزوتنەوە رزگاری خوازەکانی تر.

دوای ئەوەی کوردستانیش لە سایکس بیکۆ دابەشکرا و بە تەواوی لە لۆزانی ١٩٢٣ جی بەجی کرا ئەوا کوردستان بوە چوار پارچەی سەرەکی (عیراق و سوریا و تورکیا و ئیران)، لەو کاتیەوە هەر چواریان هاریکاری یەکتریان کردوە دژ بە جولانەوەی رزگاری کورد، یەکەم هەنگاوی ئەتاتورك قایل کردنی هاوپەیانان بەوو بە هۆی ڕێککەوتن وازهێنان لە مافی تورکیایی نوێ بەسەر زۆر لە ئاو خاك درا بە ڕوسیا ویۆنان ودەوروبەری تر، کە لە ژێر دەستی بەریتانیاو فرنسا بون، یەکێك لەوانەش ویلایەتی موسل بوو، زۆربەی ڕێکەوتنامەکانی جێبەجێ کرد، تەنانەت گوایە دژ بە سیڤەر بوو بە مەرگی تورکیای وەسف دەکرد بەتایبەتی مادەی (١٣٢) دوای هەموشی جێبەجێ کرد ئەوەی کوردو ئەرمەن نەبێ، مستەفا کمال دوو ڕێکەوتنی لەگەل ڕوسیای (لینینی)کرد،

---

[٣٠٩] ـ بۆیە دروشمی بزووتنەوەی رزگاری ئیستای باسك بریتیە لە ٣+٤=١

یەکەمیان لە٣٠/١/١٩٢٠، دووەم لە ١٦/٣/١٩٢١ تیایدا بە ڕوونی پشتگیری لە ئەتاتورك کردو دژی سیڤەر وەستاو بیری کوردستانی سەربەخۆی بە گەلالەی ئیمپریالیزم وەسف کرد، لە سالی ١٩١٩ تا ١٩٢٠بری١٠٠ملیۆن ڕۆبلی وەك یارمەتی لەلایەن روسیا بە ئەتاتورك درا [٣١٠]، لە بەرامبەردا هەرێمی (قرم)ی عوسمانی بۆ ڕوسیا لە١٦/٣/١٩٢١ بە یەکجاری بە جێهێشت، لە٢٠/ ١٠/ ١٩٢١ناوچەی کلیرکیای بۆ فرنسا بە جێهێشت، بوە هۆی ئەوەی یەکەم هاریکاری دژ بەکورد لەوە بێت وکاتێ هێزی شۆرشگێرانی کورد دیاربەکریان گەمارۆ دابو بەسەر ناوچەکە زالببون، لەو کاتە هێزەکانی فرنسا ڕێیان بۆ سوپای تورکیا کردەوە بەناو خاکی سوریابێت گورزی کوشندە لە دواوەی کورد بوەشێنێ بوە هۆی تێکشکانی شۆرش لە نیسانی ١٩٢٥، لەو کاتە شیخ عبدالقادر لەمانگی ٧/١٩٢٥نامەیەکی بۆ مەندوبی بەریتانیای نارد لەعیراق، تیایدا داوای هاریکاری کرد، بەلام بەریتانیا داواکەی ڕەتکردەوەو داوای لە تورکیا کرد، کە هاریکاری یەکتر بکەن دژ بە کورد [٣١١]، بۆیەش کاتی براکەی شێخ سعیدی پیران پەنای بۆ سنوری عیراق برد وایزانی بەریتانیەکان هاریکاری دەکەن بەلام پێچەوانە دەرچوو هەمو چالاکیەکیان خستە ژێر چاودێری و وەستاندیان، لە دیوی عیراقیش چەندین ڕێکەوتنامە ئەنجامدرا یەکەم جار لەگەلّ بەریتانیا لە ١٩٢٢، ئینجا ڕێکەوتنی دووقۆلی وسێ قۆلی داگیرکەرانی کوردستان دەستی پێکرد، لە ڕێکەوتنامەی٥/٦/ ١٩٢٦ی دیایکردنی سنوری نێوان تورکیاو عیراق (کە بە سنوری برۆکسل ناوزەد دەکرێ) لە بەشی دوەم مادەی (٦) هەردوولا ڕێکدەکەون کە چەکدارانی یاخی بدەنەو یەکترو هاریکاری ئاسایشی سنور جێبەجێ بکەن [٣١٢]، لە ٢٢/٤/١٩٢٦ ڕێکەوتنی دووقۆلی تورکیاو ئیران مۆرکرا پێك هاتبوو لە(١١)بەند لە بەندی پێنجەم و شەشەم دژ بەکوردبوو، لەسالی ١٩٢٦ یەکەم ڕێکەوتنی سێ قۆلی تورکی عیراقی ئێرانی (بەناوی دراوسێی) مۆرکرا و کورد تیایدا گەمارۆ درا، لە گەرمەی شۆرشی ئاگری لە١/٩/١٩٣٠ تورکیاداوای لە عیراق (نوری سعید)کرد کە ڕێی پێ بدرێ هێزەکانی بەناو خاکی عیراق بسورێنیتەوە بۆ لەناوبردنی شۆرشەکە، بەلام عیراق نەیتوانی

---

[٣١٠] ـ بروانە: قضیة الکوردیة فی المؤتمرات الدولیة ص٧٤ـ٧٥

[٣١١] ـ المقاومة الکردیة للإحتلال ص٥٩ـ٦٠ ایوب بارزانی

[٣١٢] ـ ئەو ڕێکەوتنە لە ئەنقەرە لەلایەن نوری سعید (عیراق) و رشدی پاشا( تورکیا) وبەنامادەبوونی ئندسی بریتانی مۆر کرا، پێك هاتبوو لە١٨ مادە

بەوئەندازەیە یارمەتی تورکیا بدات [٣١٣]، چەندین ڕێکەوتن وپرۆتۆکۆلی تر مۆرکرا، لە هەموان زەقترو بە نێو دەوڵەتی کردنی لەپەیماننامەی سعد ئابادی٨/٧/ ١٩٣٧ [*] دەست پێدەکات، ئینجاپەیمانی بەغدای[**] ١٩٥٥، چەندین ڕێکەوتنی دوو قۆڵی و سێ قۆڵی و چوار قۆڵی تر...، لە هەندێکیشیان ڕێکەوتنی سەربازیشی تێدایە، لە ١٩٤٦/٣/٢٤ تورکیاو عیراق یەکەم ڕێکەتنی سەربازیان مۆر کرد دژ بە هۆزە کوردە یاخی بوەکان [٣١٤]، لە ساڵی ١٩٦٣ش کە شۆرشی ئەیلول دەستی پێکرد هاریکاری سێ قۆڵی سەربازی زیندوو بۆوە و، بە پێی بروسکەیەك کەلەلایەن هەواڵگری کورد لە١٩٦٣/٧/٢ ڕاوکراوە ودەڵێت: بۆ فق١ + فق٢ لە (حرکاتەوە) ژ:٣٤٧٨س ڕێ بە فرۆکەی تورکی وئێرانی بدەن لەسەرووی هێڵی ٣٦ تالەخراپەکاران بدەن [٣١٥]، هەر لەساڵی ١٩٦٣ پسپۆرانی شەڕی پارتی زانی جەزائیری وفرۆکەوانانی یەمەن[*] و هێزی سوریا بە فەرمی هات یارمەتی عیراقی دا بەپێی مادەی(٢)ی (معاهدە الدفاع المشترك بین دول الجامعە العربیە)کە لە ١٩٥٠/٤/١٣، لەوێشەوە بۆ هاوپەیمانیەکی سەربازی نێوان سوریا وعێراق کە لە ١٩٦٣/١٠/٨بەسترا بوو، دەقەکەی لەخوارەوەیە [٣١٦]، بەو هۆیەوە یەکێتی سۆڤیەت سکالایەکی بەرزکردەوە بۆ نەتەوە یەکگرتوەکانو تیایدا ئەو پەلامارە عربیەی بۆ سەر کوردستان بە جینۆساید لە قەلەم دا ـ ئەوەی خوارەوە دەقی سکالاکەیە [٣١٧]، (دەقی

---

[٣١٣] ـ دراسات فی الحرکة الکردیة المعاصرة ص٥٤٩ دعثمان علی

[*] ـ لەمادەی(٧)ی ئەو ڕێکەوتنامەیە بە ڕاشکاوانە باس لە هاریکاری دژ بە یاخی بوان وڕێکخراوی سیاسی دەکات، ئەوەش دەقەکەیەتی:کل طرف من الأطراف السامیة الموقعة یأخذ علی نفسه عهداً باتخاذ التدابیر الإحتیاطیة ضمن منطقته الخاصة ضدتشکیل ونشاطالجماعات المسلحة والجمعیات والمنظمات التی تهدف الی إسقاط المؤسسات القائمةحالیاًوالمسؤلة عن ضمان الأمن والنظام فی ای جزء من حدودالطرف المقابل- کردستان ترکیا د مجید جعفر

[**] ئەو ڕێکەوتنە لە ١٩٥٥/٢/٢٣لە نێوان تورکیاوعیراق کرا ، دوای بریتانیاوئێران وپاکستانیش هاتنە ناوی بوە (حلف بغداد)

[٣١٤] ـ بڕوانە:کوردو کوردستان لە بەڵگەنامەکانی برتانی –وکمال مزهر ل٢٨٢

[٣١٥] ـ تەواوی ئەو زانیاریە لە ل١٢٣ی کتێبی (مسعود بارزانی- بارزانی وبزوتنەوەی ڕزگاری کورد)

[*] ـ لە کتێبی (ڕۆژانی لە مێژووی شۆرشی ئەیلول ل١٦٨) باس لەوانەو باس لە هێزی هندی وپاکستانیش دەکاکە یارمەتی عیراقیان دابێت، لە بەرامبەریشدا هێزەکانی حزبی دیمکراتی کوردستانی ئێران بە(احمد تۆفیق)ی سکرتێرشیەوە هاتن یارمەتی شۆرشی ئەیلولیان دا.

[٣١٦] ـ میثاق الوحدة العسکریة بین سوریا والعراق بغداد - دمشق ١٩٦٣/١٠/٨.... ثانیا: تشکیل مجلس دفاع اعلی مؤلف من القائد العام للقوات المسلحة للجیش الموحد، وثلاثة أعضاء من کل قطر یعینهم المجلس الوطني لقیادة الثورة. دەقی ئەو ڕێکەوتنە لە پاشکۆی ژ:٣ لە کۆتایی ئەو نوسینە بخوێنەوە

[٣١٧] ـ رقم E/٣٨٠٩ ٩تموز ١٩٦٣ الجلسة ٣٦، المادة رقم١ في جدول الاعمال.

وەڵامی عیراقی و بڕیارەکەی نەتەوە یەکگرتوەکان لە پاشکۆی ژ:٤ لەکۆتایی ئەو نوسینە بخوێنەوە)، لە سالی ١٩٧٥ بەفەرمی ڕێکەوتنی عیراقی ئیرانی مۆر کرا خاك وئاوی عیراق بەرامبەر تواندنەوەی شۆرشی کوردلەلایەن ئیران، لەساڵی ١٩٨٤ ڕێکەوتنێکی سەربازی لەنێوان عیراق و تورکیا مۆرکرا بۆ هەردوولا مۆڵەت درا هەریەکە بتوانن ٢٠کم سنوری یەکتر ببەزێنن بۆ لێدانی شۆرشی کورد.

ئەوانە ڕێکەوتنی ڕاستەقینەی دژبەکوردن زۆر جیایە لەگەڵ ڕێکەوتنە کۆنەکانی عوسمانی وسەفەوی کە ئەو مەبەستەی تێدانەبوو، بەداخەوە لەلای پرۆگرامی هاوچەرخی کورد تێکەل کراوە، لەو سەردەمی ئەو ڕێکەوتنانەی خوارەوە مۆر کراون لە نێوان عوسمانی‌و سەفەوی: پەیماننامەی سالی ١٥٣٥، پەیماننامەی ئەماسیەی١٥٥٥، پەیماننامەی١٥٦٨، پەیماننامەی١٥٨٩ی ئەستەمبۆل، پەیماننامەی دوەمی ئەستەمبۆلی ١٦١٣، پەیماننامەی سەراوی ١٦١٨، پەیماننامەی زەهاوی ١٦٣٩، پەیماننامەی١٦١٣، پەیماننامەی ئەرزەرۆمی یەکەم١ ٨٢٣، پەیماننامەی ئەرزەرۆمی دووی ١٨٤٧، پەیماننامەی ستاتوکوی١٨٧٠، پرۆتۆکۆلی تارانی١٩١١، پرۆتۆکۆلی ئەستەمبۆلی١٩١٣...زیاتر هودنە بوە، نەك ڕێککەوتن، بەووردتر لە کتێبی (بەشێك لە پەیماننامەکانی دژی کورد) وەك لەناو کورد باوە گوایە هەمو ئەوانە دژ بەکوردن، بەڵگەیان ئەو مادانەن کە داوای گەڕانەوەی هەڵاتوەکان دەکا، وەك لەنمونەی فەسلی پێنجەمی ڕێکەوتنامەی دوەمی ئەرزەرۆم داوای گێڕانەوەی هەڵاتوەکان دەکاتەوە، بەڵام کە لێی وورد دەبیەوە دەبینی داوای هەڵاتوی ئەو سەردەمی کە زۆربەی هەرە زۆری لە بنەماڵەی دەسەڵات بوە، داوای گێڕانەوەی ئەوان دەکەن، نەك کورد، ئەو کاتی کەی کورد

---

" سياسة حرب الابادة ضد الكرد من قبل الحكومة العراقية" طلب اضافة فقرة جديدة الى جدول الاعمال - رسالة رئيس بعثة الاتحاد السوفيتي الى الامم المتحدة الى رئيس المجلس الاقتصادي والاجتماعي

سعادة مستر ا. باتينو الرئيس ، جلسة السادس والثلاثون من أجتماع المجلس الاقتصادي والاجتماعي " استنادا الى بنود المادة٦٢ من ميثاق الامم المتحدة وقرار الجمعية العمومية رقم ٩٦(١) والصادر في ١١كانون الأول ١٩٤٦ الخاص بجريمة حرب ابادة الجنس البشري ، تطالب ممثلية الاتحاد السوفيتي من المجلس اضافة فقرة مهمة وعاجلة في بنود الجلسة الحالية بعنوان " سياسة حرب الابادة ضد الكرد من قبل الحكومة العراقية"

نلحق بهذا الرسالة مذكرة توضيحية ومسودة قرار ستقدم للأمم المتحدة حول المسألة.

أكون شاكرا لكم لو قمتم بنشر هذه الرسالة وملحقاتها لتكون ضمن الوثائق الرسمية المنشورة للجلسة رقم ٣٦ للمجلس الاقتصادي والاجتماعي للأمم المتحدة.

ايس .بورسيف رئيس البعثة السوفيتية الى الجلسة رقم ٣٦ للمجلس

هەڵدەهات و بۆ هەلدەهات، ئەو لێکدانەوەیە بە پێی واقعی ئێستایە کە زۆر جیایە لەگەڵ ئەو سەردەم، هەرچی ئەو ڕێکەوتننانەی ئێستا جیایە وبە روونی دژ بە جموجۆلی کوردایەتی و بەرزەوتکردنی سنورە لە چوارچێوەی ستراتیجیەتی دەوڵەتە داگیرکردنەکانە.

فاکتەری ئیقلیمی وای کردووە ئاستی شۆرشی کورد لە سەقفێکی دیاری کراو بداو لێی ڕەت نەبێ، بۆیە شۆرشەکانی کورد لەسالی ١٩٢٧ تا ١٩٧٩ هەر لە خولگەیەکی داخراو دەخولایەوە کە بریتی بو لە: جموجۆڵ ـ ڕێکخستن ـ شۆرش ـ مەینەتی و ئاوارەیی و مال وێرانی ـ ڕێکەوتنێکی (وفاقی ئیقلیمی) ـ رووخانی شۆرش وچاوەڕێی لێبوردنی حکومەتی داگیرکەر.

ئەزمونەکان سەلماندوویانە لە چوارچێوەی بنەمای (بەرژەوەندی) و مەدرەسەی عەلمانیەت ئەو فاکتەرە چارەسەری نیە، بۆیەش تا وولاتی داگیرکەر بە عەلمانی مانەوە ئەوا ئەو فاکتەرە ناوە ناوە گورزی خۆی لەکورد وەشاندوە، تا ئێران لە سالی (١٩٧٩) شۆرشی کرد ویەکەم نمونەی لە (ئەنتی عەلمانی) لەناوچەکە دروست کرد، بۆ یەکەم جار ئەو فاکتەرە تا رادەیەك خاو بۆوە، چونکە بۆ یەکەم جار سیستەمێکی سیاسی و یاسایی پەیروە کرالە ئێران تیایدا بە پێی بەرژەوەندی کارنەکرا بەڵکو بەپێی ئایدۆلۆژیا کارکرا

بەدرێژی لە ئاسایشی نەتەوەیی ومافی چارەنوسی دەگەڕێینەوە سەری، ئەوەی جێی سەرنجە لەتوێژینەوە ستراتیجیەکانی کورد ئەو فاکتەرە بەو شێوەیە دیاری نەکراوە، بۆیە لە بنەچەدا نە ئیش بۆ سیستەمێکی وا کراوە نە کە هاتە کایەوە رەچاوی ئەو دەستکەوتە کرا[٣١٨]، بەڵکو بە پێچەوانەوە کورد لە سەردەمی شا بەلای بێ دەنگی لار ببۆوە کە بەشێك بوو لە (وفاق ئیقلیمی) لەسەر حیسابی کورد، چەندین گورزی جەرگ بڕی لەکورد دابوو، بەلام کەشا گۆرا سیستەمێکی (ئەنتی عەلمانی) هاتەکایەوە کوردچەکیان هەلگرت و بەهاریکاری دەوڵەتی عیراق درووشمی ڕوخانی کۆماری ئیسلامی ئێرانیان هەڵگرت، تەنانەت بەشێك لە بزوتنەوەی کوردایەتی ئێراقیش بەگەر ئەو ڕەوتە چەوتە کەوت.

---

[٣١٨] ـ لەنامەیەکی (ئەحمەدتۆفیق) بۆ بارزانی لە ١٩٦٤/٢/١٨لە خالی (٢)ی نامەکە هەولی دا باسی وەها ستراتیژیەك لەسەر پێکوەنەگونجانی مەدرەسەو حوکمەکان دەکا، لەنامەکە پێشنیار دەکا دەلێ با پشتی ناسریەکان بگرین لە عێراق چونکە ئەگەر لەعێراق ناسری دەسەلاتدار بن ئەوا (ویفاق اقلیمی) تێك دەچێت وئەو سێ لایە(تاران، ئەنقەرە، قاهیرە) نیستدام دەکەن و سودی بۆ کورد دەبێت دەقی نامەکە لە:مسعود بارزانی-بارزانی وبزوتنەوەی رزگاری خوازی کورد ل٤٤٤

هەر لە درێژەی کێشە ئیقلیمیەکەی کورد کرفتێکی تری سەرباری بۆ دروست بوە، ئەویش ئەوەیە کاتی ڕۆژئاوا جیهانی دابەش کرد بەو شێوەیە یەکێ لە مەبەستەکانی ئەوەبوو کە ناوچەیەکی پڕ ئاژاوەی هەمیشەی پێك بهێنێت و جیهانی ئیسلامی یەك نەگرنەوە، لەو میانەدا کورد بووە قوربانیەکی زۆر گەورە، لە لایەك رای گشتی جیهانی ئیسلامی بەلای مافی چارەنووسی داناچێت گوایە جیابونەوە زیاتر برینەکان قوڵ دەکاتەوە و (تجزئە الجزئە)یە یاخود (تقسیم المقسم)ە، لەلایەکی تریش ڕۆژئاوا خۆی نەندازیاری ئەو دابەشیە بوو، جیهانی ئیسلامی و زانایانی ئاینیش زیاتر هاوسۆزیان لەگەڵ میللەتە موسلمانەکانی ژێر دەستە (غەیرە ئیسلامین) هەیە وەکو: فلستین،کشمیر، چیچان، مۆرۆ هتد

بەڵام لەگەڵ کورد کەمتر و تەنانەت نەکورد توانیویەتی بەچاکی پێناسەی کێشەکەیانی بۆ بکا نەخۆشیان ئەوەندە خولیای تێگەیشتنی ئەو کێشەیە بووینە، بۆیە گەلێ جار بە دیمەنێکی وەرگەڕاویش پیشان دراون، مەزلومە بە زالم پێشان دراوە، لەکاتێکدا ئیمپریالیزم و ئاژانسەکانی یەهود کوردستانیان وا دابەش کرد کەچی، کە بەرگریەك دەکا زۆر بەسانایی بەکرێگرتەی ئەوانە لە قەلەم دەدرێن، کاریگەری ئەوەش چی لە بەو فاکتەرەی سەروو کەم تر نیە

## ئاسایشی نەتەوەیی و مافی چارەنووسی

تا ئەو ساتە ئەو بابەتە وەك كۆمەڵێك بنەما و مادە (لائیحە) نەنوسرایتەوە بەفەرمی، تا هەمو لایەك لەسەری رێككەون [(٣١٩)]، بونی لائیحەكی وا ئەو پانتاییە دیاری دەكا كە بریتیە لە سەوابتەكانی كوردستان لەلایەكی تریش دەبێتە هێڵی سور بۆ نەبەزاندنی نەبونی ئەو لائیحە زیاتر دەگەرێتەوە بۆ كاریگەری مدرسە ئایدلۆژیەكانی جیهان لە كوردستان، چونكە دیاری كردنی ئەو لائیحە بەپێی مدرسەی شیوعیەت یاخود سۆشیالیست زۆر جیایە لەگەڵ مدرسەی لیبرالی، هەر دووكیشیان لەگەڵ ئاینی جیان، بەگشتی لەلای ئیسلامی و عەلمانی جیایە، بەڵام ئێستا ئەو مدرسانە كاڵ بووینەوە، رەنگە بتوانین لەسەر بنچینەی بەرژەوەندی كوردستان ئەو لائیحە دیاری بكەین و هەمو لایەكیشی پێی قایل بین

چەمكی ئاسایشی نەتەوەیی:

لە كۆنەوە رۆلی هەبووە و ئیشیشی پێ كراوە بەڵام بەددقی ئەو ناوە نەبووە، بەپێی هەندێ سەرچاوە یەكەم جار بەو ناوە لەلایەن (لویسی چواردەمی)ی فەرەنسی بەكار هات، كاتێ لەدەورو بەری وڵاتەكەی جمو جۆڵی داگیركاری و گۆرانی هاوسەنگی هێز بەرێوە دەچوو، پێی وابوو ئەوە هەرەشەیە لەسەر ئاسایشی نەتەوەیی، بەو جۆرە ئەو چەمكە سەری هەڵداو بەكورتیش مانای دابینكردنی ئاسایشی سیاسی و سەربازی و ئابووری و كۆمە لایەتی بۆ كیان و دەوڵەتەكەت، یان هەندێ ئینسیكلۆبیدیا بەسادەتر گوزارەش دەكەن و دەڵێن: پاراستنی دەوڵەت لە هەرەشەكانی دەرەكی و ناوەكی بریتیە لە بنەماكانی ئاسایشی نەتەوەیی.

لێرە مانای زیاتر پاراستنی دەوڵەت دێت، بەو مانایەی دەوڵەت قاوغە فراوان و گشتیەكەیە كە مولكی میللەتە، نەك حكومەت كە حزبێك یان (ئیئتیلافێك)

---

[٣١٩] ـ وەك سەردتایەك لە موسوعەی جودی وهەندێ سەرچاوەی تر نوسرایتەوە

فەرمانڕەوایی دەکا، لیرەوە بنەماکانی ئاسایشی نەتەوەیی ئەمریکا ڕەهەندی جیهانی وەردەگرێت، جیایە لەگەڵ ئاسایشی نەتەوەیی دەوڵەتێکی وەك کویت، هەر دووکیان جیان لەگەڵ ئاسایشی نەتەوەیی ئیسرائیل کە دەوڵەتێکی نامۆیە لە ناوچەکە پێویستی بە بنەمای زۆر تایبەتی هەیە، ئاسایشی هەر هەموویان جیایە لەگەڵ دەوڵەتێکی وەك ئیران، لەولاشەوە ئاسایشی نەتەوەیی وەك یابان لەهەر هەموویان جیایە کە بریتیە لە ئاسایشێکی فەراهەم بکرێت بۆ بازار دوور لە عەسکەرتاری، بەو شێویە ئاسایشی نەتەوەیی جۆراوجۆر هەیە، بوار نیە بەدرێژی پۆلینیان بکەین، بەلاَم بەگشتی دوو جۆر هەیە کە لەگەڵ ڕەوشی توێژینەوەکەمان دەگونجێ، ئەویش بریتیە لە ئاسایشی نەتەوەیی دەوڵەتداران و میللەتانی بێ دەوڵەت. کەواتە ئاسایشی نەتەوەیی میللەتانی بێ دەوڵەت چۆنە؟ هەیە یاخود نیە؟ چی جیایە لەگەڵ ئەوانی تر؟

هەڵبەتە بەپێی دابەش و جیایی بەرژەوەندی ئەو بنەمایانەش لێك جیادەبن، لە بنەچەدا وا پێویست بو سەرجەم مرۆڤایەتی برا و هاریکاربن، هەر وەك ئیمامی عەلی ئەو بنەمایەی لە ڕوانگەی ئاینی ئیسلام داناوە لەنێوان هەمو مرۆڤی جیهانەوە دەڵێ: اما اخ لك في دين او نظير لك في خلق، واتە: ئەگەر هیچ پەیوەندیەك نەبێ لەنێوان دوو مرۆڤی سەر ئەو زەوی یە یەك ڕەگەز نەبن خزم نەبن، هاولاَتی نەبن، هاوچین و هاوباوەڕ نەبن، هیچی یەکتر نەبن ئەوە هاوتان لەبون، واتە لە خزمیش نزیك ترن

لەو سەردەمە سیستەمی عەلمانی سەرمایەداری زاڵە بەسەر پەیوەندیە نێو دەوڵەتیەکان، ئەوەش وای کردووە کۆمەڵگەی نێو دەولّتی و بەشەریەت دابەش بن، هەر کۆمەڵە دەست بە بەرژەوەندی خۆی بگرێ و گەلێ جار لەسەر حیسابی خەڵکی تر، یان لەسەر بنچینەی (گەیشتنی دوو بەرژەوەندی لەسەر حیسابی سێیەم)، گەلێ جاری ترلە جیاتی برایەتی بنەمای (مصائب قوم عند القوم فوائد) پەیرەو کراوە، واتە بەرژەوەندیەکان تێك دەگیرێن و شینی هەندێکیان دەبێتە شایی بۆ بەشێکی تر، کەباسی عەولەمە و کۆمەڵگەی نێو دەوڵەتی و ڕایگشتی جیهانی و نەتەوە یەکگرتووەکان دەکرێ وەك یەك میللەت و یەکسانیەك دێتە پێش چاو، زۆرجار ڕۆشەنبیری کورد بە خێرایی بەسەر ئەو گفتوگۆیە تێدەپەرێ و وەسفی عەولەمە بەوە دەکا و دەڵێ جیهان بوێتە گوندێکی بچوك ...، ناوەستێ لەسەر ئەوە ئاخۆ ئەو گوندە هەمو وەك یەکن، یاخود

جیاوازی تێدایە، دابەش بوینە بەسەر: ڕەش و سپی، سەروخوارو، تێر و برسی، دەوڵەمەند و هژار، نەتەوەی سەردەست و بن دەست، شارستانی و فەرهەنگی جیاجیا... بەئاسایی لە هەمو شوێنێکی ئەو گوندە جێت دەبێتەوە، ئەگەر بە نەشارەزایی وبێ چاوساغ دەرگای ئەو گوندە بکەیەوە، دەچیتە گەرەکێك بە خزمەتکار وەرتدەگرن، بۆیە دەبی ناسنامە و شوێنی خۆت لەو گوندە دیاری بکەیت، ڕەنگە هەبێ قایل نەبی و بڵێ جیهان یەکە و ئەوروپا و ئاسیا نەماوە، سەروو و خواروو نەماوە....هتد، باشترین بەڵگە تورکیایە، خۆ ئێمەی کورد لە تورکیا پێشکەوتوترین لەساڵی (١٩٢٢) و (١٩٢٤) بەڕەسمی عەلمانیەتی ڕاگەیاندووە، تەنانەت جل و دیاردەی ئیسلامی و ئاینی قەلاچۆکرد، پیتی ئیسلامیشی کردە لاتینی، لەساڵی (١٩٣١) بۆ کۆنگرەیەکی ئیسلامی لە قودس بانگێشت کرا نەچو و وەلأمیشی ئەوەبو: خۆ ئێمە دەوڵەتی ئیسلامی نینە...، لەوکاتیەوە هەتا ئێستا لەتەقەلای چونە نێو یەکێتی ئەوروپایەو وەرنەگیراوە، کەچی بەشێك لەخاکەکەشی کەوتۆتە ئەوروپا، شکستی ئەو تەقەلایە یارمەتی دەرێکی مەزن بو پارتی دادوگەشە بەناسنامەیەکی ئیسلامی ئاوا سەرکەوتنی بەدەست هێنا، ئەوە ئەزمونێکی زۆر دەوڵەمەندە و پێویست ناکا ماندومان بکەن بەتاقی (تاقیکراوە)، هەر لەئێستاوە ناسنامەو شوێنی خۆمان لەو گوندە عەولەمیە دیاری بکەین، ئەگینا خزمەتکارین و خزمەت کاریش بەمرۆڤی تەواو پۆلین نەکراوە وناکرێ،

کەواتەڕاستیەکەی ئەوەیە ئەو عەولەمەیەی ئێستا پێکهاتوە لە سەروخوارو، هەبودونەبوە، پێش کەوتو وپاشکەوتو، سپی و ڕەش، داگیرکەر و داگیرکراو، خاوەن ڤیتۆ و بێ ڤیتۆ، ئەوروپی و ئاسیایی، لیبرالی و مەبادئی، عەلمانی و ئاینی... هتد،دۆزینەوەی بونی خۆت ودیاری کردنی ناسنامە و ئینتما لەو جیهانە نوێیە ئاسان نیە، بۆ بناغە دانانی بنەماکانی ئاسایشی نەتەوەیمان پێویستمان بە دیاری کردنی ناسنامەی کورد و کوردستانە لە عەولەمەی نوێدا ...بەو شێوەی خوارەوە:

١ بەشێکین لەکۆمەڵگەی ڕۆژهە لاتی لەڕوی جەمسەری جوگرافیەوە

٢ ئێمە سەر بە فەرهەنگی ئیسلامین لەرووی ئاینەوە

٣. ئینتمای نەتەوەییشمان کوردنە رووی رەچەلەکیەوە،کوردستانیش لەرووی نیشتیمانیەوە

٤. سەر بەرزگاری ـ نیشتیمانین لەرووی ئایدیۆلۆژیەوە

٥. سەر بە وولاَتی جیهانی سێ یەمی تازە پێ گەیشتووەکانین لەروووی شارستانیەوە (٣٢٠)

لێرەوە دەردەکەوێت ئێمە کێین و شوێن و (کۆ ئۆردینەیتمان) لەکوێی عەولەمەیە، هەر لەوەشەوە دەچینە ناو دەروازەکانی ئاسایشی نەتەوەیی وزۆر لای تر. ئەگەر بەبێ رێنوێنی و چاوساغی و بێ ناسنامەی تایبەتیمان خۆمان خستە نێو ئەو گوندەی عەولەمە ئەوە لە باشترین دۆخدا بەپێی بنەمای (هاولاَتی بون) و رەگەزی کۆمەلَگای مەدەنی هەلس و کەوتمان لەگەلَ دەکرێ و جێ ی داواکردنی مافی نەتەوەییمان نابێ، جا ئەگەر ئەو داوایە نەکەین لە ولاَتانی عیراق و تورکیا و ئیرانیش مافی هاولاَتیمان پێ دەدرێت ....، بۆیە فەرهەنگی عەولەمی رۆژئاوایی زامنکردنی مافی کوردومافی چارەنووسی تێدانیە، بەتایبەتی بنەمای (تاکبژیانە)کەی، کەواتە لە بنەماکانی ئاسایشی نەتەوەییمان پێویستە تۆمار بکرێ ئێمە بەشێك نین لەفەرهەنگی رۆژئاوایی وسەرخانەکانی، هەر تەقەلایەکی واش دژی بنەماکانی ئاسایشی کوردە ...(١)

کێشەی کورد بەو مانایەی وەك دۆزێکی نەتەوەیی و چەوساندنەوەی نەتەوەیی و پەیدابونی نەتەوەی سەردەست و بن دەست مێژوی راستەقینەی دەگەرێتەوە بۆ سەرهەلَدانی دەولَەتی نەتەوەیی تورکیا و عیراق و سوریا ...، ئەوانەش لە دەوروبەری ١٩٢٠ دروست بون، ئەوەش لەو کاتەبوو کە:

١ جەنگی جیهانی یەکەم تەواو بوو

٢. وولاَتی رۆژئاوا بەسەر وولاَتی تەودر (بەعوسمانیشیەوە) زالَبون

٣. زالَبونی مدرسەی عەلمانی بەسەر ئاینی

[320] ـ بروانە: مەوسوعەی جودی ل١١

٤. زاڵبونی واقعی بیری نەتەوەییان و چەمکی هەرێمایەتی بەسەر بیری ئیسلامی و چەمکی ئومە و (دار الاسلام)

٥.داڕوخانی خیلافەتی ئیسلامی وسەرهەڵدانی دەوڵەتی هاوچەرخی عەلمانی

لەو ئەنجامە ئەوسنورو دەوڵەتانەی لێهاتە دی کە کوردستانیان بەسەردا دابەشکراوە، کەواتە بونی ئەوددەوڵەتانەو پاڕاستنی یەك پارچەییان، ئاسایشی نەتەوەییان، پێچەودانەی ئاسایشی نەتەوەیی کوردستانە ...(٢)

لەدوای دروست بونی ئەو دەوڵەتانە بنەمایەك سەری هەڵدا بەناوی (وفاقی الاقلیمی - تەبایی هەرێمایەتی) واتە: هاریکاری یەکترکردن لە چوارچێوەی بەرژەوەندیە هاوبەشەکانی ئابوری و سیاسی و ئاسایش یەکێ لەو بەرژەوەندیانە ئاسایشی نەتەوەیی هاوبەشیان بریتیە لە پاڕاستنی سنور و باری ئاسایشی ناوخۆ، ئەوەش وادەکا هاریکاری بکەن لەدژی بزوتنەوەی کوردایەتی، زەق ترین هەنگاوی فەرمیان ڕێکەوتنی سنوری نێوان تورکیاو عیراق تا سعد ئاباد بوو لە ١٩٣٧، لەو کاتیەوە بزوتنەوەی کورد گەشە دەکا بە هۆی خەباتی سیاسی و شۆڕش تادەگاتە سەقفی ئەو وفاقە وتێك دەشکێ، ئەو سەقفە تا ئەو ساتە بە تەقەلای کورد ناشکێ، بەو شێوەیە شۆڕشی شێخ سعید ١٩٢٥، ئاگریداخ احسان پاشا١٩٢٧- ١٩٣٢، شیخ محمود ١٩١٩- ١٩٣٢، کۆماری مهاباد ١٩٤٥- ١٩٤٦، شۆڕش مەلا مستەفا ١٩٦٢-١٩٧٥بەو دەردەچوون، ئەو دیمەنە تراجیدیایە دووبارە دەبۆوە تا شۆڕشی ئیرانی لەسالی ١٩٧٩ بە ئاڕاستەیەکی ئیسلامی سەرکەوت ئەو سەقفە و فاقیەی تێك شکاند، مەرج نیە بۆ ئێمەی تێك شکاندبێ، بەشێك لە دروشم و ڕێبازی وا دەخوازی، بەو شێوەیە گەورەترین لەمپەر لەبەردەم ئاسایشی نەتەوەیی کورد هێور بۆوە، ئەوەش مانای ئەوە دەدا کە هەر تەیار و مەدرەسەیەك لە دەوروبەری کوردستان سەر هەڵبدا و لەمپەربێت لەبەردەم و فاقی ئیقلیمی ئەوا تۆماتیکی لەقازانجی ستراتیژیەتی کوردستانیەولەخزمەتی ستراتیژی کوردستانە(٣)

ئەوەش قەتیس نامینێ لەسەر بزوتنەوەی ئیسلامی و دەوڵەتی ئیسلامی رادیکاڵ، بەلکۆ هەر تەیارێکی (بەمەبادیئی) خاوەن پەیامی وەك شیوعیەتیش ئەو کاریگەریەی هەبووە، بەڵام لەو سەردەمەدا دەبینین بنەماکانی شیوعیەت و باقی مەدرەسەکانی عەلمانی وا کاڵ و بچووك بوویتەوە کەوتۆتەوە ژێر بەرژەوندی تایبەتی و بەرژەوەندی باڵای

دەوڵەت، کەوا داخوازی ئەویش لەپێناو پاراستنی بەرژەوەندی وڵات بنەماو ئایدولۆژیا و مەبادیئەکانی بداتەلا، ئەویش بنەمایەکانی وفاقی دەولی و هەرێمایەتیەکە ڕەچاو دەکا، تیایدا ڕەهەندی کورد دۆڕاوە، بۆیە لەو سەردەمەدا زیاتر بزوتنەوە ئیسلامیەکان و دەوڵەتی ئیسلامی رادیکاڵی ئەو خزمەتە بەستەراتیژیەتی کورد دەکا، واتە تا لەدەوروبەرمان ئەو بزوتنەوە ئیسلامی و دەوڵەتی ئیسلامی دروست بێت و بزوتنەوە دەوڵەتە عەلمانیەکان لاوازترین بواری (وفاقی اقلیمی و جیهانی) کەمتر دەبێتەوە، بواری گۆران و مەودای جموجۆل فراوان تر دەکا، واتە تەنینەوە و فراوان بونی ئیسلامی و لاواز بونی عەلمانیەت لەسەر ئاستی جیهانیش لەخزمەتی ئاسایشی نەتەوەی کوردستانە...(٤)

ئەگەر ئەو هاوکێشە سیاسی و سیتراتیژیە سەروو فراوان تر بکەین بۆ نێو دەوڵەتی، دەبینین ئارامی جیهان و هەماهەنگیەکەی دووبارە دەبێتەوە لەمپەر لەپێش ستراتیژیەتی کورد و ئەو گۆرانکاریانەی چاوەروانیەتی، لەژێر سایەی ئەو رێسایانەی یاسای نێودەوڵەتی کە بناغە کۆنکریتیەکان لەسەر بنچینەی بەرژەوەندی دروست بوە، بەدەگمەنیش زەحمەتە دەرفەتێك بۆ کورد بڕەخسێ تا لە ژێردەست ڕزگاربێت بەپێی بنەمای بەرژەوەندی، واتە بۆ میللەتی کورد واچاکە توخمی ئەخلاقی سیاسی، یاسایی ویژدانی، مافی مرۆڤایەتی بکەوێتە نێو رێساکانی یاسای جیهانی و پەیوەندی نێودەوڵەتی، ئەوەش لەچوارچێوەی ئەو وڵاتەی جیهانی ئێستا بەدی ناکرێ و چەندین جارە ئەزمونەکان دەیسەلمێنێتەوە، کە رزگاری کوردستان، مافی چارەی خۆنوسی لە بەرنامەو ئەجندای ئەوانە نیە، ئەگەر بەووردی یان درشتی سەرنج بدەینە پرۆژەکانی چاکسازی رۆژهە ڵاتی ناوەڕاست کەبریتین لە:

١- ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستی (step by step)ی کیسنجر ١٩٧٥
٢- ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستی گەورە ١٩٩١ ج - بۆشی باوك (سیستەمی نوێی جهانی)
٣- پرۆژەی ئەوروپی بۆ چاکسازی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست (کۆنگرەی برشلۆنە ١٩٩٥)
٤- ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستی تازە ٢٠٠٤ز - ج بۆشی کوڕ
٥- ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستی فراوان ئەلمانیا و فرنسا - ٢٠٠٤ز
٦- پرۆژەی ئیسرائیل (شمعون پیرس)

٧- پرۆژەی جامیعەی عربی(دیکۆمینتی نەسکەندەریە) [٣٢١] هەمو ئەوانە لە چوارچێوەی سایکس بیکۆ و بنەما تەواوکاریەکانی دەرناچێت، کە بریتیە لە: عدم المساس بالحدود الاستعماریه الموروپە، بنەمای ئایزنهاور، پرۆژەی دابەشی رۆژهەلاتی ناوەراستی بچووك و گەورە.... هتد، ئەوانەش بریتیە لەپتەوکردنی مەینەتی کورد، بۆیە بۆکورد واباشە پرۆژەیەك بێت نەخشەی سیاسی سایکس بیکۆ تێك بدات، باوەری بەو سنورە دەستکردانە نەبێت کە لەسەر بنچینەی سایکس بیکۆ دروست بوە، ئەوەش لەو سەردەمە بەدی ناکرێ جگە لە بزوتنەوەی ئیسلامی و ئەو دەولەتانەی پەیامی ئیسلامی پێیە، با لەپرۆژەکانیشیان بە راشکاوانە باسیان لەمافی چارەنووسی کورد نەکردیتەوە، بەلام هەلوەشاندنەوەی ئەو نەخشە سیاسیەی رۆژهەلاتی ناوەراست (مەینەتی کورد پێ دروست بو) بەرەو ئاراستەیەکی تەریبی رزگاری کوردستانە، بەکورتی هەر بنەمایەکت بینی ناتەبابێت لەگەلّ نەخشەی سیاسی سایکس بیکۆ ئەوا لەخزمەتی ستراتیژی بزوتنەوەی کوردستان دایەو پانتایی ئاسایشی نەتەوەی کوردستان فراوان و جێگیردەکا ....(٥)

بابزانین ئەوهاوکێشانەی سەروچەندە بۆ ناو کوردستانیش گونجاوە، کۆمەلگەیەکی خاوەن دۆز لە قۆناغی وەرچەرخان (قۆناغی رزگاری نیشتیمانی) وەك میللەتانی ترنیە، قۆناغێکی وەرچەرخانی هەستیارودوورە، لەشێوەی پزیشك و نەشتەرگەری دلّە، هەر هەلّەیەکی بچوکیش بیکەیت سەرەنجامەکی ترسناکی لە ئاستی ئەنفال وکیمیاویت روبەرو دەبێتەوە، بۆیە پێویست بەوەدەکا هەنگاوەکانت هەموی لەژێر سایەی توێژینەوە و نەخشە و پلانی وردبێت، پێویست بەوە دەکا ژێرخانی سیستەمی ئابووری و سیاسی و فکری و فەرهەنگی بە (مەرجەعیەتی) رزگاری نیشتیمانی دیاری بکرێت، لەو روەوەش ئەزمونی کوردستان تاقانە و دەگمەنە، بۆیە لاسایی و کۆپی هەر شوێنێك بەتایبەتی ئەوروپی وێرانت دەکا، بەلّکو پێویستی بە داهێنان و مونەزیری تایبەتی خۆت هەیە، پێویستت بەوە هەیە کۆمەلگەیەك ئامادەبکەی بە خێرایی پێشوازی لە هەر رێنماییەکی سیاسی هەبێت لەلایەن سەرکردایەتیەکەی، ئەوەش ئەوە دەخوازێ: لەسەردوە راڕەوێکی بە رەوشت پڕ مەبادیئو بەبیروبڕوا پەیرەو بکەی، دوور لە راڕەوەی سیاسی میکافیلی و

---

[٣٢١] - بروانە: رسالة ماجستیر للطالب ابراهیم محمد عزیز-اشکالیة الإصلاح السیاسی فی الشرق الأوسط ص٥٥-

تیۆرەکانی سیاسی وەك: سیاسەت بەرژەوەندی و (فن الممکنە) و ئەوانە ئەو بنەمایانە وێراندەکەن، لەلای خواردوەش پێویستت بەوە هەیە کۆمەڵگەیەکی بەڕەوشت و بە ئەمەك و ڕاستگۆ و هاریکار و دلسۆز و بەبەزەیی و لێبوردەو بوێرو کوردپەروەر دروست بکەی، دوور لە نەفامی و هەڵەشەیی و بەرژەوەندی پەرستی و خۆویستی و بیگانە پەرست و درۆزن و گەندەڵی، ئەو ئەرکەش لەهەردوو باری سەروخوارو لەو سەردەمەدا بە مەدرەسکانی عەلمانیەت ناکرێت، کە بەراشکاوانە پەیرەوی بنەمای بەرژەوەندی تایبەت دەکا، پەیرەوی سیاسەتی میکافیلی و بنەمای پراگماتیکی دەکا، بۆیە بەدیلی ترمان نیە جگە لەوەی لە ناوەخۆش پەیڕەوی بنەماکانی ئاینی بکەین، بۆ ئەوەی بەو مواسەفاتانەی سەروو سەرکردەو کۆمەڵگەیەکی ئاوامان هەبێت ئامادەبێ بۆ رزگاری و قەبوول نەکردنی داگیرکاری، دەبێ خۆ دوورخەینەوە لە مەدرەسە و تەیارەکانی عەلمانی بەهەرسێ باڵی (سۆشیالیسی، شیوعی، لیبرالی)، تەنانەت ئایدۆلۆژیای نەتەوایەتیش لەبەردەم بەرژەوەندی تایبەتی شکستی هێناوە، بۆیەش دەبینین زۆربەی بزوتنەوە رزگار خوازەکانی ئێستا ئاینین لەوانە: خواروی لبنان، فلستین، چیچان، خواروی فلیپین، کشمیر....) بە پێچەوانەوە دیمەنی عەلمانیەت ناشیرینتر بوە، زیاتر خەریکی دەسەڵاتبازی و خۆویستیە، بۆیە گەلێ جار لەسەر هیچ هێلی سور و پاراستنی ئاسایشی نەتەوەیی ناوەستێ، سەودا لەگەڵ دووژمنی ژمارە یەکیش دەکەن، هەروەك بینیمان لە فلستین لەکاتی هێرشی ئیسرائیل بە سەر غەزە لە سەرەتای ٢٠٠٩ ڕێکخراوی فتح یەکێ لەو چوارلایە [٣٢٢] بو کە لایەنگیری ئیسرائیلیان کردن، هەروەها ئەو دۆخە لەنێو حزبە کوردستانیەکانیش بە ئاشکرا بینرا

بۆ هەمو ئەوانە لەناوەخۆ لەسەر ئاستی سیاسی و فەرهەنگی، لەئاستی خوارو سەرو بۆ پاراستن و بەرجەستەکردنی بنەماکانی ئاسایشی نەتەوەیی کوردستان ناوەرۆکی بزوتنەوەی کوردستان ئاینی بێت، یاخود بە ووردتر نابێت کوردایەتی و ئاین جیا بکرێتەوە، ئەوەش کۆڵەگەیەکی تری ئاسایشی نەتەوەییمان بۆ فەراهەم دەکا ....(٦)

عیراق پێکهاتوە لە ٣ پێکهاتەی سەرەکی و چەند کەمایەتیەکی تر، هەر لایەی درێژکراوەی ئیقلیمی هەیە، بەجۆرێك سوننەی عەرەب کە لە ١٩٢١ ەوە دەسەڵاتدار لە

---

٣٢٢- میسر و سعودیة و فتح و ئوردن

نێو ئەوان بووە تا ٢٠٠٣ و گورزی بێ ویژدانەیان نە کورد وەشاندوە، ئەوانە کەمایەتین، بەڵام جامیعەی عەرەبی و ڕۆژئاواش پشتگیریان بوە، ئیسرائیلیش لێیان ڕازی بوە، ئەوانە درێژکراوەی هاوپەیمانی عەرەبن، شیعەش زۆرایەتین و بێ دەسەڵات بوینە و زیانیان بۆ کورد نەبوە، ئەوانەش درێژکراوەی شیعەی ئێرانن بەلایەنی کەمەوە لەو دەمە، تورکمانیش کەمایەتیەکی زۆر کەمن و هەرچەندە لە بنەچەدا ڕەگەزیان لەگەڵ تورکیا جیایە، ئەوانە لەناوەڕاستی ئاسیا لەگەڵ شەپۆلەکانی مەغۆل و تەتەر و تورکمانیا هاتون، لەسەردەمی عوسمانی زیاتر لایەنگیری سەفەوی بون (جگە لەناوچەی تلەعفەر نەبێت)، هەرچی کوردیشە درێژکراوەی کوردستانیە...، ئەوەش بەڕونی دەریدەخا کە دروستکردنی دەوڵەتس عیراق لەو پێکهاتانە هەڵەیەکی گەورە بوە، کەواتە نەك دەوڵەتی عیراقی یاخود حکومەت و دەستور، بەڵکو خودی عیراق هەڵەیە، مەینەتی کورد و پیناسی بزوتنەوەی کوردایەتیش لەو هەڵەیە سەرچاوە دەگرێ، کەواتە وردەکاریەکی زانستی و سیاسی زۆر بەستاندەری دەوێ بۆ چارەکردنی ئەو هەڵەیە، چونکە لەژێر سایەی ئەو جۆرە عیراقە بنەمای (مصائب قوم عند القوم فوائد) پەیرەوکراوە بە پێچەوانەوە بنەمای مرۆڤایەتی و ئاینی (مثل المؤمنین ...)، بۆیە هەر تەباییەکی هەردوو پێکهاتە لەسەر بنچینەی (عروبی ـ إثم) دەبێتە گورز بۆ ئاسایشی کورد، یان بەکورتی بێ چارەسەری دادگەریانە دوزی کورد هەر تەباییەك لەنێوان پێکهاتەکانی عیراقی مەرگی کوردە، پێچەوانەش بە پێچەوانەیە، ئەو فاکتەرانەی پێکهاتەی شیعە و سوننە یەك دەخاتەوە بریتییە لە چەمکی عروبی نیشتیمانی، یاخود عەلمانی عروبی کە سورشتێکی شۆفینی هەیە، بە پێچەوانەوەش هەر خودی فاکتەری ئاینی لەگەڵ هەڵەی عیراق یەکناگرێتەوە و دەبێتە سەنگەرێکی بەرگری بۆ کورد بەربەرەکانی چەمکی عیراقی عروبی دەکا، ئەو کاتی دەبێتە لێك ترازانێك لە نێوان شیعە و سوننە، ئیسلامی و عەلمانی، تەیاری شعوبی و عروبی... ئەوەش خزمەتێکی مەزن بە ئاسایشی نەتەوەیی کورد دەکا، هەر ئەو فاکتەرەی ڕابونی ئاینی کە لە دوای ١٩٧٩ جێی ڕابونی نەتەوەیی گرتەوە بوە هۆی گۆرینی نەخشەی کۆمەڵایەتی عیراق لە (٧٥٪عەرەب و٢٢٪ کورد)بۆ (٥٥٪ شیعە

و٢٢٪ کورد و٢٠٪ سونه[٣٢٣] ٣٪ کەمیەتی). تیایدا کورد لە خنکە خنکی کەمایەتی رزگاری بوو یەکەم جارلەودۆخەسەرۆککۆماروفیدرالی وهەرێمی بۆدیایکرا، کەواتەوەرچەرخانی فاکتەری نەتەوەگەری بۆ ئاینی گەورەترین خزمەتی ئاسایشی نەتەوەیی کوردستانی کرد.... (٧)

بە ئەزمون بۆمان دەرکەوتوە لەو بارودۆخەی عیراق بینیومانە چەندە سەرودەری لاواز بێت قازانجی کوردە، تا بەغداش بەهێزبوو‌بێت هەڕەشە بوە لەسەر بزوتنەوەی کوردایەتی، هەموئەو دەسکەوتانەی ئێستاش لەسایەی بێ دەسەڵاتی عیراق هاتوە، بەتایبەتی دوای ئەوەی بەفەرمی بەپێی بڕیاری ٦٦١ی ١٩٩٠ی نەتەود یەکگرتودکان عیراق خرایە بەندی حەوتەمی میساق، سەرجەم ٦٥ بڕیاڕی لەسەر دەرچوە، وای کردوە سەروەری لاواز بێت و ئاستی بزوتنەوەی کورد بۆ یەکەم جار بگاتە بەڕێوە بردنی حکومەتودروست بونی پەیوەندی نێودەوڵەتی وبەرپا بونی بەرژەوەندی دەوڵەتانی زل هێز لەکوردستان...(٨)

کەواتە ئێستادەتوانین (بە کۆکردنەوەی زانیاری سەروو)بنەماکانی ئاسایشی نەتەوەیی کوردستانی لە قۆناغی رزگاری بەو شێوەیەی خوارەوە دیاری بکەین:

١ پاڕاستنی بەهاونەریت ئاین ورەسەنایەتی کوردستان وهەموئەو دەروازانەی دەرژێتەوە سەری

٢. پاڕاستنی یەك ریزی میللەت و پابەند بە ڕێنمایی سەرکردایەتی کۆڵەگەی ئاسایشی نەتەوەیی کوردستانیە

٣. ئارام نەبونی ناوچەکە و گۆرانکاری لە شێوەی جەنگی جیهانی یا خود هەر گۆرانێك تیایدا سەروەری سنور وئارامی نێو دەوڵەتی لەسەر بنچینەی ئەو نەخشەیە هەلوەشێنیتەوە، یاخود هەرگۆرانێك لەو یاسای نێو دەوڵەتی بەو ئاڕستەیە

---

[٣٢٣]ـ لە زۆربەی سەرچاوە مێژوویەکان ئەگەر باسی سونەو کوردکرابێ ئەوە ووتویەتی کورد زیاتر بوە ، بۆ ئەو مەبەستە با بەلگەنامەیەکی بریتانی بەکار بهێنین چونکە لای سونیشیان گرتوە:

CO ٧٣٠/ ١٦١/٢ سكان كردستان: ينكر الكرد بكونهم اقلية في العراق لأن عدد السنة العرب ليس اكثر من الكرد ولكن اعتبارهم مع الشيعة فقط كعرب يعطي لهم الاكثرية. واذا اجريت احصاء دقيق ولم يحسب الكرد ضمن عرب السنة يكون عدد الكرد والعرب متساويا.فمثلا تم تجاهل عدد الكرد في لواء ديالى ذات الاغلبية الكردية والاقضية الكردية في كوت في الاحصاءات السابقة.

٤. تەنینەوەی بزوتنەوەی ئیسلامی یەکان لەناوچەکە

٥. تەبا نەبونی ولاتانی داگیرکەر لەگەل وفاقی هەرێمایەتی و جیهانی واتە بەرپا نەبونی هاوپەیمانی وهاریکاری ئیقلیمی بەرپا نەبونی گونجان لەنێوان ئەو دەولّەتە داگیرکەرانەی کوردستان و کۆمەلگەی نێو دەولّەتی.

٦ دارشتنی سیستەمەکانی ئابووری و سیاسی و فەرهەنگی دەسەلاّتی کوردی لەسەر بنچینەی قۆناغی رزگاری نیشتیمانی، زال بونی ئایدیۆلۆژیا بە سەر بەرژەوەندی

٧. تەبا نەبونی پێکهاتەکانی عیراق لەسەر بنچینەی عروبی و شۆفینی و عیراقی چەوت بەگشتی سەرنەکەوتنی ئەو دەولّەتانەی کوردستانیان دابەش کردووە ولە کۆتایدا لە رِووی یاسایی بە (دول الفاشلە )پۆلین بکرێن چاکە، جا ئەوەش زۆر لا دەگرێتەوە وەك نائارامی ولاّت و پێك نەهاتنی پێکهاتەکان و گیرو گرفتی لە گەل دەوروبەر و نەبونی مەرکەزی

٨. هاندانی هەر ماکینەیەك کە بەپێچەوانەی بینای سایکس بیکۆ و نەخشەی سیاسی رِۆژهە لاّتی ناوەرِاست بێت، کە بنەماکانی ئایزنهاوەر و(عدم المس بالأرث الإستعمار)یش دەگرێتەوە، لە سەرخانیش هەمو ئەو دەولّەتانە دەگرێتەوە کە بەهۆیەوە دروست بووینە بە ئیسرائیلیشەوە، یاخود زیاتر میکافیلیانە هەرگۆرانێك لە دژی مەبین(جمود) خێرە.

٩. دروست نەبونی کۆمەلگەی مەدەنی لەسەر بنچینەی بەرژەوەندی مادی پێگەیشتنی عەقلیەتی چینەکانی خەلّکی کوردستان و وەرگرتنی زانیاری سەردەم و پێش خستنی تەکنەلۆژیا و هان دانی عەقلیەتی داهێنان و پەروەردە کردنی تاکی کورد بە بەهای مرۆڤ دۆستی و یەکتر قەبوول کردن و بەردەوامی رێزگرتن لە پێکهاتەکانی تری کوردستانی بەشێکی گرنگی ئاسایشی نەتەوەییە

بە کورتی چی لە بەرژەوەندی یەکێتی و ئاسایشی نەتەوەیی ئەو وولاّنە بێ پێچەوانەی بنەماکانی مافی چارەی خۆووسی کوردە کە بیەوێ تەواو خۆی ساغ کردبێتەوە بۆ گەیشتن بە دەولّەت

به پێچەوانەوەش ئەو بنەمایانەی خواردوە هەرەشەکانن لەسەر ئاسایشی نەتەوەیی کورد:

أ ـ یەکپارچەیی و ناوەندیەتی وڵاتە داگیرکەرەکان

ب ـ تەبایی و هاریکاری نێوانیان

ج ـ هاریکاری پێکهاتەکانی عیراق لەژێر سایەی دەوڵەتی عیراقی عروبی

د ـ ڕێسایاکانی یاسای نێودەوڵەتی و نەریتی پەیوەندی نێودولەتی لەسەر بنچینەی بەرژەوەندی

هـ ـ تەنینەوەی بەهای عەلمانیەت و هەمو ئەو بینایانەی لەسەر ئەو چەمکە دەکرێتەوە وەك: ئایدۆلۆژیای نەتەوایی عروبی و تورانی و شۆفینەکانی تر، دەوڵەتی نەتەوەیی، بنەمای بەرژەوەندی، ڕاڕەوی سیاسەتی میکافیلی

ع ـ تەنینەوەی بەهاکانی عەلمانیەت لەنێو کۆمەڵگەی کوردەواری و دەسەڵاتی دا دەبێتە هۆی هەڵوەشاندنەوەی بینای کۆمەڵگەکە و داروخانی کەسێتی کورد لەجیاتی نەریت و بەهاکانی خۆویستی و بیٚ بەڵێنی و هەڵەشە و خیانەت و قۆڵبڕی و دەروون ناسکی و.. ئەوەش دەبێتە هۆی داگیرکردنی تاك و خاك پێکەوە، چونکە عادەتەن کە خاك داگیردەکریٚ دەروونی تاك داگیرناکریٚ بۆیە بەرگری نیشتیمانی لیٚ سەر هەڵدەدا، هەروەك لەنامەکەی ئەسکەندەری مەکدۆنی بۆ ئەرستۆی ناردبوو لەکاتی داگیرکردنی وو لاٚتی فارسی ووتبووی: ئەوا خاکم داگیر کردوون بەلاٚم تاکم داگیر نەکردوون چی بکەم، لە وە لاٚم دا ئەرستۆ ووتبووی: بەهاو نەریت و رەسەنایەتیان برووخێنە لەریٚ ی پەرتکەوزال بە ...بەو هۆیەش ئەسکەندەر زاڵ بوو(ئەوەی خوارەوە دەقی نامەی ئەسکەندەر ووەلاٚمی ئەرستۆیە)[٣٢٤]، کەواتە هەر مدرسەو ئایدۆلۆژیاو چا لاٚکیەکی

[٣٢٤]: نامەی ئەسکەندەر: أنّه شاهد بإيرانشهر رجالا ذوي أصالة في الرأي، وجمال في الوجوه، لهم مع ذلك صرامة وشجاعة، وأنه رأي لهم هيأت وخلقا، لو كان عرف حقيقتها، لما غزاهم، وأنّه إنّما ملكهم بحسن الاتفاق والبخت، وأنّه لا يأمن - إن ظعن عنهم - وثوبهم، ولا تسكن نفسه إلّا ببوارهم. وەلاٚمی ئەرستۆ: « فهمت كتابك في رجال فارس. فأما قتلهم فهو من الفساد في الأرض ولو قتلتهم لأنبت البلد أمثالهم لأنّ إقليم بابل يولّد أمثال هؤلاء الرجال، من أهل العقول والسداد في الرأي، والاعتدال في التركيب، فصاروا أعداءك وأعداء عقبك بالطبع، لأنّك تكون قد وترت القوم، وكثرت الأحقاد على أرض الروم منهم وممن بعدهم، وإخراجك إياهم في عسكرك مخاطرة بنفسك وأصحابك. ولكني أشير

سیاسی حزبی و دەسەڵاتی كوردی بێ یان داگیركەر ببێتە هۆی داروخانی بینای كۆمەڵگە و تاكی كورد هەڕەشەی هەرەمەزنە لەسەر ئاسایشی نەتەوەی كوردستان

ف ـ سیستەمەكانی خویندن و ئابووری و سیاسی كۆمە لآیەتی و فەرهەنگی لائیكی دەبێتە هۆی ئەو داروخانە لەخاڵی (٥) باس كرا، بۆیە بزوتنەوەو حزبی عەلمانی و لائیكی زیانی هەیە بۆ ئاسایشی نەتەوەیی كورد

ك ـ پەرتەوازەیی و سەرهەڵدانی كێشە ناوخۆیی و هەمو ئەو هۆكارانەی دەبنە ئەو هۆیە پشت شكێنی ئاسایشی نەتەوەییە

م ـ بەهێز بونی وولآنی داگیركەر بەتایبەتی لەژێرسایەی دەوڵەتی ناوەندی

ه ـ پاش كەوتوویی و هۆشیار نەبونی خەڵكی كوردستان

كەواتە سەرجەم بنەماكانی ئاسایشی نەتەوەیی كورد پێك دێت لە پاراستن و رێ گرتن لەو هەڕەشانەی بەشی دوەم وكاركردن لەسەر بەرجەستەكردنی بەشی یەكەم،...دەبا بزانین ئاسایشی نەتەوەیی كوردستان و عیراق كەی تێك دەكاتەوە و كەی دژن؟واتە دەتوانین ئەو پەیوەندیە دژوارەی(مصائب قوم عند قوم فوائد)ی٨٠سالی رابووردووكەبالی كێشا بوو بەسەر پەیوەندی نێوان پێكهاتەكانی عیراقی ودرچەرخێتە (مثل المؤمنین فی توادهم ...)، وەپەیوەندیان چیە بەمافی چارەنووسی و دەروازەكانی رزگاری كوردستان

## ئاسایشی نەتەوەیی كوردستان و ئاسایشی نەتەوەیی عیراق:

لەراستیدا لەگەڵ دروست كردنی عیراق بەو هەڵەیەی كە لەپێشوو باسمان كرد ئاسایشی نەتەوەیی عیراق نەك هەر دژی بنەماكانی ئاسایشی نەتەوەیی كوردە، بەڵكو دژی پێكهاتەكانی تر و تەنانەت دژی ئاسایشی نەتەوەیی عەرەبیشە لەسەر بنچینەی پان

---

علیك برأی هو أبلغ لك في كلّ ما ترید من القتل، وهو أن تستدعی أولاد الملوك منهم، ومن یستصلح للملك ویترشح له، فتقلّدهم البلدان، ویتولیهم الولایات، لیصیر كل واحد منهم ملكا برأسه، فتتفرّق كلمتهم، ویجتمعوا على الطاعة لك، ولا یؤدّی بعضهم إلى بعض طاعة، ولا یتّفقوا على أمر واحد، ولا تجتمع كلمتهم. » سەرچاوە: تجارب الأمم لمسكویه الجلد الأول

عەرەب، بۆ ئەم مەبەستە پێویست دەکا زۆر بەکورتی مەبەستەکانی سایکس بیکۆ و دروست کردنی ئەو (دەوڵەتە بێژیانە)ی ناوچەکە روون بکەینەوە سەرجەم ژمارەی کۆنگرەو تەقەلاکانی دابەشی رۆژهەلاتی ناوەراست گەیشتە ١دانیشتن[٣٢٥]، هەڵبەتە هەر رێکەوتنامەیەك دەکرێ چەند مادەیەکی ئاشکرای هەیە مۆری لەسەر دەکرێ، بۆ تێگەیشتنی تەواو لە مەبەست و دیوە نهێنیەکانی پێویستت بەبەراییەکانی ئەو رێکەوتنەکە هەیە، رێکەوتنی سایکس بیکۆ لە ١٦ \ ٥ \ ١٩١٦ بەستراو پێك هاتبوو لە (١٢ ) مادەی[٣٢٦]، ئەو رێکەوتنە لەنێوان بەریتانیاو فرنسا و روسیا کراوە، لە لایەن (مارك سایکس)ی بەریتانی و (جۆج بیکۆ)ی فرنسی و (سازانۆف)ی رووسی مۆرکراوە، ناوبراوە بە (سایکس بیکۆ)، بۆ دابەش کردنی میراتی عوسمانی بە زیندیەتی چاوان، زۆر بە نهێنیش کراوە چونکە پریەتی لە مادەی وا کە لەگەڵ رێکەوتن و بەڵێنەکانی تری رۆژ ئاوا لێك جیابوو، لەوانە: رێکەوتنی ماکماهۆن ـ شریف،هەروەها بنەماکانی مافی چارەنوس کەلە لێدوانی مافی چارەنووسی گەلان لەلایەن بەریتانیا و فرنسای ١٨\ ١١\١٩١٨[٣٢٧]، هەروەها لەگەڵ ١٤ بنەماکەی ویلسۆن[٣٢٨] وبەیانەکانی بەریتانیا لە بەسرە و بەغدا... لەهەمو ئەوانە بەڵێن بە میللەتان درابوو بۆ مافی چارەنووسی و رزگاری ئارەزوومەندانە، کەچی لەسایکس بیکۆ هەموی پەرش و ب لاو کردبون، بۆیە بە نهێنی

---

[٣٢٥] كردستان فى سنوات الحرب العالمية الأولى ص٣١٦

[٣٢٦] دەقی رێکەوتنەکەلە ل١٢٣ی ئەو کتێبە بخوێنەوە

[٣٢٧] دەقی لێدوانەکە:((ان الغاية التي ترمي اليها كل من فرنسا وبريطانيا العظمى في خوض غمار الحرب في الشرق من جراء اطماع ألمانيا، وهي تحرير الشعوب التي طالما أرزحت تحت أعباء استبداد الأتراك تحريرا تاما ونهائيا وتأسيس حكومات وادارات وطنية وتستمد سلطانها من رغبة نفس السكان الوطنيين، ومحض أختيارهم))

[٣٢٨] دەقەکەی (بە پوختەیی): المبادئ الأربعة عشر

١. تقوم العلاقات الدولية على مواثيق سلام عامة، وتكون المعاهدات الدولية علنية وغير سرية.
٢. تأمين حرية الملاحة في البحار خارج المياه الإقليمية في السلم والحرب، إلا ما ينص عليه الاتفاق الدولي خلافا لذلك.
٣. إلغاء الحواجز الاقتصادية بقدر الإمكان وإيجاد مساواة بين الدول المتعاونة في المحافظة على السلام.
٤. تخفيض التسلح إلى الحد الذي يكفل الأمن الداخلي.
٥. وضع إدارة عادلة للمستعمرات تنفذ ما يحقق مصالح سكانها.
٦. الجلاء عن الأراضي الروسية كلها والتعاون مع أي حكومة روسية يختارها الشعب.
٧. الجلاء عن أراضي بلجيكا وتعميرها.
٨. الجلاء عن فرنسا ورد الألزاس واللورين وتعمير ما خرب منها بسبب الحرب.
٩. إعادة النظر في حدود إيطاليا بحيث تضم جميع الجنس الإيطالي.
١٠. منح القوميات الخاضعة للإمبراطورية النمساوية حق تقرير مصيرها.
١١. الجلاء عن صربيا ورومانيا والجبل الأسود، وإعطاء صربيا منفذا إلى البحر وإقامة علاقات جديدة بين دول البلقان كافة مبنية على أسس قومية وتاريخية، وضمان حريتها السياسية والاقتصادية.
١٢ ضمان سيادة الأجزاء التركية وإعطاء الشعوب الأخرى غير التركية التي تخضع لها حق تقرير المصير، وحرية المرور في المضائق لجميع السفن بضمان دولي.
١٣. بعث الدول البولندية بحيث تضم جميع العنصر البولندي، وإعطائها منفذا إلى البحر، وضمان استقلالها السياسي والاقتصادي دوليا.
١٤ إنشاء عصبة الأمم.

لەگەرمەی جەنگی جیهانیش (١٩١٤– ١٩١٨) بوو، بە کورتی مەبەستەکانی ئەو ڕێکەوتنە و دواییش ڕێکەوتننامەکانی تری ئاشتی پاریس و سان ریمۆ ١٩١٩ – ١٩٢٠، سیڤەر ١٩٢١، لۆزان ١٩٢٣...دروست کردنی ئەو دەوڵەتۆکانەبوو بۆ ئەم مەبەستانەی خوارەوە:

١ دابەشی ئوممەتی ئیسلامی بۆ نەتەوەی جیاواز و نەتەوەش بۆ عەشیرەت و تایفە

٢ دابەشی (دار الاسلام) بۆ نیشتیمان و لەویش بۆ پارچەی تر

٣. دابەشی خیلافەت و یەکنەگرتنەوەی بۆ هەتاهەتایە

٤. بۆ ئەوەی ناوچەکە ئارام نەبێت وو لاتی دەستکرد و نا سروشتی لیّ دروست کرد

٥. بۆ ئەوەی ناوچەکە پێش نەکەویّ وهەر بازاری ساغ کردنەوەی ئەوان بێت

٦ ئەو وو لاتە ناوخۆییانە وەك عیراق و سوریا و ئوردن ...بە نامۆیی دروست کرد تا جیّ ی وو لاتێکی نامۆیّ وەك ئیسرائیلیش ببێتەوە لەناوچەکە

٧. بۆ ئەوەی هەردەم نائارام بن سنوری ئەو وو لاتە دەستکردانەشیان بەپێی ستاندەری نێو دەوڵەتی و سنوری سروشتی نێو دەوڵەتی پیادە نەکرد، کەسنوری سروشتی بریتیە لە سنوری جوگرافی و یان کۆمە لایەتی یان نەتەوەیی بەڵکو سنورێکی دەستکردیان بۆ دروست کردن بەشێوەیەك بەشێکی فارس خرا سەر عەرەب، عەرەبیان خستە سەر فارس و تورکیا، کوردستانیان بەسەر هەر چوار لا دابەش کرد،،، بەو شێوەیە تا هەر نائارامی بێت هەروەك نا ئارامیە

ئەو وولانە لەسەر ئەو بنچینەو بەو گیانە دروست کراون، هەر لەسەرەتاشەوە ناوەرۆکێکیان بۆ چێنرا لەگەڵ ئەو مەبەستانەوە بێتەوە، ئەوە بوو لە دەستووردکان و لەبناغەی ئەو دەوڵەتانەش ئەو مەبەستانە چینراون، بۆیەش ریفۆرم لەو دەوڵەتانە ئەستەمە، هەر لە یەکەم دەستوری عیراقی سالی (١٩٢٥) بنەماکانی لائیحەی ئینتدابی ([٣٢٩]) وورد کرابۆوە، دەستوری تورکیاش بنەماکانی لۆزان و مەبەسەتەکانی سایکس بیکۆی لیّ ی بەرجەستە کرابوو، ئەگەر بەووردیش سەرنج بدەینە مێژووی ئەو دەوڵەتانە

---

[٣٢٩] لائیحەی ئینتیداب لە (٢٠) مادە پێك هاتبوو ، دەقەکەی لەکۆتای ئەو کتێبە بخوێننەوە.

رێك و پێك ئەو مەبەستانەی لە سایكس بیكۆ بۆی چێنرابوو پەیرەوی دەكەن ٬ كەواتە هەر وو لاتێك لەوانە كێشەیەكە بۆ ناوچەكە و میللەتانی عەرەب و كورد و تورك و فارس و ئەوانی تریش، پێویستی بەچاكسازی هەیە، جێگەی داخە ئەو پرۆژە چاكسازیانەی گە لاڵە كراوە بۆ رۆژهەلاتی ناوەڕاست نەچووە بەلای ئەو دەردە رییشەییەوە، كە ئەو دەوڵەتانەی لیٚ ی دروست بووینە دەستكردن بە ئارەزووی میللەتانی ناوچەكە دروست نەبووە، بەڵكو بەئارەزووی دەرەكی و لەسەر دوو بەرژەوەندی ستاندەری رۆژئاوای و بەرژەوەندی ئاسایشی نەتەوەیی ئیسرائیل دروست بووە[330]

كەواتە ئاسایشی نەتەوەیی ئەو دەوڵەتانە نە ستاندەر دەبێت ونەپێكەوەش دەگونجێن، مەگەم لەسەر (زولم )یەكبگرن، بۆیەش لەسەرەتا تا ئەو ساتە جەنگی ئاسایشی نەتەوەیە لە ناوچەكە، تەنانەت لەنێو خودی ئەو دەوڵەتانەش.

## شەڕە ئاسایش:

توێژینەوەی ئەو بابەتە بەدەرد لە ئاخافتنی دبلوماسی و رەچاوی پەیوەندی برایەتی پێكهاتەكانی عیراق، بەڵكو پێویست بەوە دەكا بابەتیانە لەسەر بنچینەی مافی چارەنووسی لێكی بدەیتەوە، لەراستیدا ئەزموونی دەوڵەتانی رۆژئاوا و رۆژهە لات تا رادەیەكی زۆر سەركەوتووبووە، دەبینین ئینتمای هاولاتی بە پلە یەك بۆ وو لاتەكەیە و ئینتمای ستوونی نەتەوەیی وتایفی و بنەماڵەیی لەنێو توایتەوە، هۆیەكەشی ئەوەیە دەستوور و سروشتی وو لاتەكە چاكساز بووە، لەوو لاتێكی نەتەوەیی وەرچەخاوە بۆ وو لاتێكی نیشتیمانی مەدەنی، ڕاستە لەسەرەتادا وولاّنی رۆژئاوا لەسەر بنچینەی نەتەوەیی دروست بوو لەدوای رێكەوتنی ویستیڤالیای ١٦٤٨[331] دەوڵەتەكانی بەریتانیا و فرنسا و هۆڵەندا و ئیسپانیا بەتەواوی خەملین، بەلاّم یەكەم وەرچەرخانی دەوڵەتی نەتەوەی بۆ دەوڵەتی نیشتیمانی ئەمریكا بوو لەدوای شۆرشی ١٧٨٠، لەو ئەزموونەوە مۆدێلی دەوڵەتی نیشتیمانی تەنیەوە بەئەوروپا و دواتریش بەهەمو جهان، بەتایبەتی لەدوای

---

[330] لە كتێبی (سیاسةالبریطانیة العظمی تجاة مستقبل كردستان ص١٥٥ گفت وگۆیەكی بەریتانیەكانی گواستۆتەوە (ویلسۆن)كۆتایی پیٚ دێنیٚ ودەلیٚ ئەو عێراقە بەو سنورەو لكاندنی كوردستانی خواروو پێی تاكە پێوەرە كەلەخزمەت بەرژەوەندیە دوورو نزیكەكانمان بێت.

[331] ئەو رێكەوتنە لەدوای شەڕی ٣٠ ساڵەی تایفی ورەكەزی بوو لەسەر خاكی ئێستای المانیا بەسترا

شکستی ئەزموونەکانی دەوڵەتی نازی لەنەلمانیا فاشی لە ئیتالیا ڤالانژیسی لە ئیسپانیا.. ئەزموونێکی (نسبیەن) سەرکەوتووە، تیایدا لەجیاتی هاونەتەوەیی چەمکی یاسایی و سیاسی هاوڵاتی دێتە جێ ی، ئەوەش مانای بنەمای کۆمەڵگەی مەدەنی دەدا، لەوو لاتی وادا وو لاتی سەروەری دەستوور و خەڵکی شایستە لە شوێنی شایستە دەبێ، بەگشتی تاك لە وو لاتی وادا ئنتیما ستوونیەکانی رەگەزی عەشایەری و بنەماڵەیی و نەتەوەیی هەڵدەوەشێتەوە بۆ ئنتیمایە ئاسۆییەکانی حزبی و یاسایی و مەدرەسی ونیشتمانی.. یاخود هەرتەواو بۆ ژیان و پیشەی وەردەچەرخێ کەپێی دەوترێ: (مرۆڤی یەك رەهەند ـ انسان ذو بعد الواحد)، لەو وولانە مانایەك بۆ کەمایەتی و زۆرایەتی، نەتەوەی (س) و (ص) نامێنێت، زۆر ئاسایە عبدالسلام ئاین موسڵمانە ببێتە سەرۆکی دەوڵەتی هیند، علی خامەنەئی بەرەگەز ئازارەریە و ببێتە (مرشد الاعلی)ی ئێران،کارلۆس مونعیمی ڕەچەلەك شامی ببتە سەرۆکی بەرازیل، ئۆباما سەرۆکی ئەمریکایە بە رەگەز کینی ....هتد، هەندێ ولاتی تر ماون کەمێك کێشەی ئاینی ماوە کە لەدەستورەکان تۆمار کرابێت، لەوانە:لە مادەی (٤)ی دەستوری سوێد واتۆمارکراوە کەدەبێ سەرۆك مەسیحی بێت، بەهەمان شێوەش لە مادەی(٩)ی دەستوری ئیسپانیا، مادەی(١) و(٤٧)ی دەستوری یۆنانی ومادەی(١، ٢)ی دەستوری دانیمارکی ومادەی (٥٤) کۆلۆمبیاو (٦٦)ی کۆرسیکا(١٢)ی سلڤادۆرو(٢٤)پورتوگال (٣) پاراگوای و(٢)ی ئەرجەنتین و [٣٣٢] بەلابەلا ئاماژە بەوەها مەرجێك دەکا، ئەگینا کۆت وبەند لەسەر ئینتمایە ستونیەکان نەماوە، ئەوانەش وایکردووە وو لاتی ئارام و پێکەوەژیانی تەبایی بێت، بەدەگمەنی هەندێ کێشە ماوە لە ئێرلەندای سەروو لە نێوان (ئێرلەندا و بەریتانیانی)، لە ئیسپانیا لەنێوان باسك و ئیسپان...، ئەوەش دەگەرێتەوە بۆ ئەو پاشماوەیە جیاوازی ئاینی و فەرهەنگیەی لەسەروو باسمان کرد، بەلام بەگشتی روو لە چارەسەریە،تەنانەت بەشێك بە ئارەزووی خۆی جیابونەوەی ناوێت، ئەوە بوو لە ١٩٩٨ هەڵبژاردنێکی ئارەزوومەندانە بۆکیبیکیە فرنسی زمانەکان کرا ئاخۆ لەگەڵ کەنەدی (ئینگلیزی زمان) دەژین یاخود جیا بونەوەیان دەوێ، دەرکەوت لە ٥١٪ دەنگیان بە ژیانی هاوبەشی دا

[٣٣٢] الإسلام والعلمانية..ص٢١

هەرچی وولاَنی عەرەبیە هێشتا وو لاَتی نەتەوەیین، هەریەکە شانازی بە ناسنامەی عروبی بۆ وو لاَتەکەی دەکا و لە دەستووریش وا تۆمار کراوە، لەدەستووری عیراقی پێشوو لەمادەی (١) عیراق بەشێکە لە ئوممەی عەرەب، سوریا، میسر، لبنان[٣٣٣] تەنانەت لە مادەی(١)ی دەستوری فلستینیش ئەوە هاتوە، مادەی ٦٦ی دەستوری تورکیاش هەمان رەگەزپەرستی تێدایە[٣٣٤]، بۆیە زۆر سەرەنجامێکی لۆژیکیە کە کێشەی نەتەوەیی و تائیفی و رەگەزی لەسەرانسەری وولاَنی عەرەبی سەرهەلّبدا لە میسر لەگەلّ قیبتیەکان، لە جەزائر و مەغریب لەگەلّ بەربەرەکان، لەلبنان لەگەلّ مەسیحی، لەسودان لەگەلّ مەسیحی و دارفۆری، لەبەحرەین لەگەلّ شیعە، لەیەمەن لەگەلّ زەیدی و حوسیەکان، لەعیراقیش لەگەلّ کورد و شیعە و تورکمان ...، ئەو تێڕوانینە ڕەگەزپەرستیە هەر لەناو ولاَت نەبوو، بەلّکو لە چالاکیە دیپلۆماسی پەیوەندیە نێو دەولّەتی پرۆژەکانی (وحدە العربیە)ش بە ئاشکرا گوزارش دەکرا، لە پرۆژەی یەکگرتنەوەی میسرو سوریا وعیراقی ١٧ / ٤ / ١٩٦٣ لەدیباجەی بەیانەکە دەلّێت: ..فالوفود الثلاثة تعلن باسم الشعب العربي في مصر وسوريا والعراق ارادة هذا الشعب في قيام الوحدة الاتحادية[٣٣٥] ...، هیچ حیسابێك بۆ بونی کورد لە عیراق وسوریاو قیبتی لە میسر نەکراوە، ئەوە لە عیراق زیاتر کاریگەر بوە، تەنانەت ئێستاش لەدوای ٢٠٠٣ دەولّەتی عیراق لەژێر ئەو فەرهەنگە ستوونیە دەرنەچووە، هەرچەندە هەمو لایەك بەشدارن لەدەسەلاَت و سەرۆك کۆمار کوردە بەلاَم لەمادەی (٣) دەستوور وا تۆمارکراوە: عیراق ئەندامێکی دامەزرێنەری کارای کۆمکاری

---

[٣٣٣] سەیری دەستوری عیراق ١٩٦٨ بکەو ودوایش هەردووبارە دەبۆوە: المادة الأولى: الجمهورية العراقية دولة ديمقراطية شعبية تستمد أصول ديمقراطيتها وشعبيتها من التراث العربي وروح الإسلام.
الشعب العراقي جزء من الأمة العربية هدفه الوحدة العربية الشاملة وتلتزم الحكومة بالعمل على تحقيقها. دەستوری سوریاش ١٩٧٠و١٩٧٣,:
المادة الأولى ١- الجمهورية العربية السورية دولة ديمقراطية شعبية واشتراكية ذات سيادة لا يجوز التنازل عن أي جزء من أراضيها وهي عضو في دولة اتحاد الجمهوريات العربيه.٢- القطر العربي السوري جزء من الوطن العربي.
٣- الشعب في القطر العربي السوري جزء من الأمة العربية يعمل ويناضل لتحقيق وحدتها الشاملة .لەو دەستورە ٤٩جار ووشەی عەرەبی لێهاتوە بۆ یەکجاریش ناوی کوردی تیا نەهاتوە
ئەوەش دەگەرێتەوە بۆ ئایدیۆلۆژیە رەگەزپەرستیەکانی شۆڤینی لەفرنسا وفالانژیسی لە ئیسپانیاو نازی لە ئەلمانیاو فاشی لە ئیتالیا و(شعب الله المختار)ی یەهودی و... ، لەمادەی (٤)ی بەرنامەی(نازی)- حزبی سوشیالیستی کریکاری ئەلمانیا- هاتووە: (هاولاَتی ئەلمانیا ئەوانەن کە خوێنیان ئەلمانە) بروانە مەوسوعەی جودی –مادەی: نازی
تەنانەت فلستین ژێردەستیشە کەچی لە مادەی (١)دەستوریان تۆماریان کردوە کە فلستین بەشێکە لە نیشتمانی عەرەبی !! المادة ١: فلسطين جزء من الوطن العربي الكبير، والشعب العربي الفلسطيني جزء من الامة العربية والوحدة العربية هدف يعمل الشعب الفلسطيني من اجل تحقيقه.
[٣٣٤] لە مادەی ٦٦ هەمان شێوەی وەرکرتوەو دەلێ ئەوەی لەتورکیا بێت تورکە
[٣٣٥] بيان اتفاق الوحدة الثلاثية بين مصرسوريا والعراق-القاهرة - ١٧ / ٤ / ١٩٦٣

عەرەبیەوپابەندی میساقەکەیەتی، هەر بۆ زانین لە مادە(١)ی میساقی جامیعەی عربی ناسنامەی ئەندام بون بە مەرجی عەرەبیە هیچ پێگەیەك بۆ غەیرە عەرەبی تیا نیە دەقەکەی لەخوارەوەیە[٣٣٦]، واتە بەلایەکی ترەوە دانت نا کە عیراق بەشێکە لە (ئومەی عربی)، ئەوەش هەمان مادەی دەستوری لبنانیە کە لەدیباجەکەی بەو شێوەیە هاتوە: لبنان عربي الهوية والإنتماء، وهو عضو مؤسس وعامل في جامعة الدول العربية وملتزم مواثيقها، كما هو عضو مؤسس وعامل في منظمة الامم المتحدة وملتزم مواثيقها والاعلان العالمي لحقوق الانسان. وتجسد الدولة هذه المبادئ في جميع الحقول والمجالات دون استثناء[*]، هەر لەسەر ئەو بنچینەیەلە رێکەوتنی تائیفی ٢٣/١٠/١٩٨٩ داکۆکیەکی توند لەسەر ناسنامەی عروبی لبنان لە برگەی (ب) مادەی (١)کراوە، ولآتانی عەرەبی و لایەنە سونیەکان هێشتا قایل نین لەبارەی عیراق، داوای ناسنامەیەکی روونی عروبی بۆ عیراق دەکەن و ناسنامەی کورد و تورکمان و پێکهاتەی تر تێك بشکێنن، ئەوەش سەرچاوەی کێشەکانە لە وو لآتی عەرەبی، نەك وەك گۆتە دووبارە بووەکەیان گوایە ئەوە دەستی ئیمپریالیزم و زایۆنیە !!

لەسەر ئەو رەوتەی عیراق، بەو ناسنامەیە عروبی و ناوەندیەتی هەردەم هەڕەشەیە لەسەر ئاسایشی نەتەوەیی کورد، بەجۆرێك بەهێز بون و سەلامەتی ئاسایشی نەتەوەیی دەوڵەتی عیراق لاواز بونی ئاسایشی نەتەوەیی کوردستانیە، پێچەوانەش بە پێچەوانەیە، لەوەش زیاتر هەرەشەکانی سەر ئاسایشی نەتەوەیی عیراق بە ئۆتۆماتیکی فاکتەری بەهێزی ئاسایشی نەتەوەیی کوردە، تا ئەو رادەیە هەرزیانێك بەریەکیان کەوێ دەبێتە قازانج بەوی تر ئیتر بە سانایی بنەمای(مصائب القوم عند القوم فوائد..)جێی (مثل

---

[٣٣٦] مادة ١: تتألف جامعة الدول العربية من الدول العربية المستقلة الموقعة على هذا الميثاق و لكل دولة عربية مستقلة الحق فى أن تنضم الى الجامعة، فإذا رغبت فى الانضمام ، قدمت طلباً بذلك يودع لدى الأمانة العامة الدائمة، و يعرض على المجلس فى أول اجتماع يعقد بعد تقديم الطلب. میساقی جامعەی عربی لە ٢٠ مادە پێك هاتوە لە ٢٢/٣/١٩٤٥ نوسراوە

[*] دەبوایە کورد بەو جۆرە دارشتنەی دەستور قایل نەبوایە ، دەشلێن ئەو دەستەواژە لەلایەن مام جلالەوە پیشکەش کراو تۆمارکرا ، لەوە راست تر ئەو پیشنیارە دەستورەی مەلا مستەفای بارزان بوایە کە لە ١٢/٣/١٩٦٥ بۆ بەغدای نارد ، پیك هاتبور لە١٣ بەند ، لەبەندی(٣)دەلیت:گەلی عەرەب لە عیراقدابەشێکە لەمیللەتی عارەب...

المؤمنون..)دەگرێتەوە هەروەك گرتیتیەوە [٣٣٧]، هەڵبەتە ئەوە دۆخێکی دروست نیە بەڵام ئەوە دەگەڕێتەوە بۆ سروشتی دەوڵەتی عیراقی ئەو مەبەستانەی پێی دروست کراوە لە سایکس بیکۆ بەدواوە ورەفتاری دەسەڵاتدارانی عیراقیش، ئەگەر بە ووردی سەرنج بدەینە بنەماکانی ئاسایشی نەتەوەیی کوردستان کە تۆمارمان کرد بەسروشتی خۆی دژ بەئاسایشی عیراقە، بەدەگمەن بەندێك نادۆزیەوە هاوبەش بێت، بەهەمان شێوەش ئەگەر بنەماکانی گشتی ئاسایشی نەتەوەیی عیراق لەژێر ئەو ڕەوشە عروبیە (هەروەك لە ئەدەبیاتی حزبی بەعس لە بارەی ـ امن القومی)دیاری بکەین دەگەینەوە هەمان ئەنجام، کە ئەوانەی خوارەوەیە:

١ عیراقێکی توند و تۆڵی و مەرکەزیانە خاوەنی هێزو و سوپاو ئاسایشی بەهێزبێ بتوانێ ڕۆل ونەرکی عروبی ببینی

٢ پاڕاستنی یەك پارچەیی ویەکێتی خاك و گەلی عیراق دوور لەجیاوازی و پارچەپارچەبون و دابرین

٣. گەشەی دەوڵەتی عیراق لەرووی ئابووری و کۆمە لآیەتی و بەرەو دەوڵەتێکی تەکنەلۆجیدار و ....وبەکورتی چەسپاندنی پایەکانی دەوڵەتی عیراقی مۆدرێن

٤. ئارامی و ئاسایشی ناوخۆ

٥. پاڕاستنی پەیوەندی و هاریکاری (وفاق اقلیمی و عربی و جیهانی)

٦ توند و تۆلکردنی پەیوەندیەکانی عیراق بەوڵاتانی عەرەبی بەجۆرێك کە ئاسایشی نەتەودیی عیراق ببێتە بەشێك لەئاسایشی نەتەوەیی عەرەب ([٣٣٨])

---

[٣٣٧] لە بەلگەنامەیەکی بریتانی باس لە فلسەفەی ناشیۆنالیزمی دەکاو دەڵێ بورن وهێزی یەکەمیان لەسەر توانەوەو لاوازی دوەم دەوەستێت وبەو فلسەفەیەش تورکیاو عیراق و.. ئەوانە دروست بوونە: Foreign Office .... و يعتقد أنه في حالة عدم قيام الترك بصهر الشعوب الأخرى ، بطريقة القوة أو بالطرق الأخرى ، فأن الشعب التركي ستنقرض. توقيع W.J. Childs - ١٩٢٩/٨/١٧

[٣٣٨] بروانە دەقی (تعريفات ببعض المصطلحات.. مادە: امن القومی). لە ڕێکەوتنی میسرو سوری وعیراقی سالی ١٩٦٣ هەڕەشە لەسەر ئاسایشی نەتەودیی ودوژمنیان نیشتمان پەروەرانی کوردو لایەنی تر ئەوانە بوە کە لەدەقی بەیانەکەی جاڕدانی هاتووە:

اتفاق الوحدة الثلاثية بين مصر ،سورياوالعراق القاهرة ١٧/٤/ ١٩٦٣ وتشمل فئة اعداء الشعب العناصر التالية: ا- المعزولون سياسيا بمقتضى القوانين المقررة لذلك.

ب - كل من حكم ثوريا وأدين بانه انفصالي او متآمر او مستغل.

ئەگەر بەووردی سەرنج بدەینە ئەو بنەمایانە دەبینین بە سروشتی خۆی هەردشەن لەسەر ئاسایشی کوردستان وتەعریب وتوانەوەی کوردە، ...چارەسەری زانراو تا ئێستا لە لایەن بەغداوە ئەوە بوە ئاسایشی نەتەوەیی کورد تێك وپێك بشکێنی تا ڕادەی قڕ کردنی میللەتی کورد، ئالێرەدا پرسیارە ئالۆزەکە دەست پێ دەکا: ئاخۆ چۆن ئەو دوو جۆرە ئاسایشە پێکەوە دەحەوێنەوە، ئایا چارەسەر مانای چ دەگەیەنێ، ڕاشکاوانەتر بیلێن هیچ بوارێك ماوە بۆ ئەوەی ئەو دوو بنەما ئاسایشە بەیەك بگەن و ئاسایشێکی نەتەوەیی هاوبەش دروست بێت؟ هەر چەندە زەحمەتە بەڵام ئەستەم نیە، لەوبڕگەی خوارەوە زیاتر وەڵامەکە وەرگرە.

## سروشتی کوردایەتی و پیلان دژبە عەرەب

شۆڤینی عەرەب لەدوای دارشتنەوەی نەخشەی سیاسی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست ودروستکردنی وڵاتانی عەرەبی نزیکەی سەدەیەکە بانگێشەی ئەوە دەکەن کە: ١ ـ پێلانیان لەسەرە لەلایەن ئیمپریالیزم وزایۆنی٢ ـ پیلانی دووبارەدابەشی وڵاتانی عەرەبی(دابەشکراو ـ تقسیم المقسم او تجزئه الجزأ) لە ئارادایە ٣ ـ پێلانی یاخی وجیاخوازی ٤ ـ پیلانی دژبەیەکگرتنەوەی ئومەی عەرەب...لەگەل چەندین بانگێشەی تر، ئەوەی پەیوەندی بەبابەتەکەو کوردستان هەیە ئەو چوار پێلانەیە گوایە بزوتنەوەی کورد بەشێکە لەو پێلانە، لەچوارچێوەی پێلانی زایۆنی ورۆژئاوا کە کەمایەتیەکانی جهانی عەرەبی هان دەدەن تا ئەو وڵاتەڕۆڵی عەرەبیەکەی پەك کەوێ...بۆ ئەوەی خوێنەری کوردو عەرەب وخەڵکی تریش لای ڕوون بێت ئەو ڕاستیانەی خوارەوە زۆر بەکورتی دەخەینە ڕوو:

١ ـ بە ڕاستی سایکس پیکۆو دابەشی ناوچەکە عەقلی میلەتانی کوردو عەرەبی تێك داوە، ئەگینا ڕاستیەکەی ئەوەیە ئەو وڵاتانەی عەرەبی لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بەشێکە لە نیعمەتی ئیمپریالیزم وزایۆنی بۆ عەرەب(ئەگەر ئەو وەزعە نیعمەت بێت)، واتە ئەو نەخشەیەی وڵاتانی عەرەبی وناوچەکە بەشێکە لە پرۆژەی زایۆنی ئیتر بۆچی پێلانی دژ بکا بە پێچەوانەوە دەیپارێزی هەروەك وا دەبینین ئەو پاڕاستیتی.

---

٢ ـ شۆڤینی عەرەب دڵنیا دەکەینەوە کە ئیمپریالیزم وزایۆنی نەویستویەتی ونەدەیەویٚ ولاٚتانی عەرەب دابەش بکا، چونکە خۆی وای دابەش کردوەو بە (ستاندەرو عەیاریٚکی) وورد دابەشی کردوە کە دەقاودەق لە بەرژەوەندی خۆی بیٚت،

زۆرسیناریۆی دابەشی بۆ رۆژهەلاٚتی ناوەڕاست پیٚشکەش کرا، لە ریٚکەوتنی سایکس پیکۆ عەرەبی(رۆژهەلاٚتی ناوەڕاست) کرا ٦بەش وکوردیش کرا٥بەش، واتە سەرجەم ناوچەکەکرا(١١)بەش، بیٚجگەلەدابەشیەکانی کەنداو، دوای داگیرکردن فرنسا و بەریتانیا ویستیان عەرەبی رۆژهەلاٚتی ناوەڕاست لە ٧ بەشەوە بکەنە ٩ بەش: لە ١٩١٨/١١/١٩م (لورانس)پیشنیاری کرد(ئەوەی ئیٚستاناوی نراوەخوارووی عیراق)بکریٚتە٢هەریٚم(میزۆپۆتامیای سەروو(بەغدا) ومیزۆپۆتامیای خواروو(بەسرە) وسوریاش بۆ هەر سیٚ کوڕی شریف بن حسین(عبدالله وزید وفیصل)، وزارەتی هند لە ١٩١٨/١١/٧م لایەنگیری ئەو دابەشیەی کرد، لای شامیش بۆ (٧) پارچە دابەش بکەن:١ ـ جبال لبنان٢ ـ دولة العلويين ٣ ـ دولة انتاكية في شمال سورية٤ ـ دولة جبل دروز ٥ ـ دولة سورية.٦ ـ فلستين.٧ ـ امارة شرقي الأردن[٣٣٩]، بەلاٚم ویلسۆن وکۆکس بروسکەیەکی بە پەلەیان لە ١٩١٩/١١/٢٢ نارد تیایدا ئەو عیراقەی ئیٚستایان بە کوردستانەوە وەك (چاك ترین چارەسەر)پیٚشنیار کرد و چەسپا، لە کتیٚبی (سياسةالبريطانية العظمى تجاة مستقبل كردستان )گفت وگۆیەکی بەریتانیەکانی گواستۆتەوەسەبارەت بەچۆنیەتی دابەشی ناوچەکە، (ویلسۆن)کۆتایی بەو تاوتوێیە دیٚنیٚ ودەڵیٚ ئەو عیٚراقە بەو سنورەو لکاندنی کوردستانی خوارووتاکەپیٚوەە کەلەخزمەت بەرژەوەندیە دوورو نزیکەکانمان بیٚت[٣٤٠]، فۆرستەریش دەڵیٚ: جاء في التقرير لجنة كنج –كراين: ((ان حكمة قيام بلد موحد لاتحتاج الى نقاش بنسبة الى قضية العراقية )) هكذا جميع الأطراف ترى حكمة في نشوءهذه الدويلات غني عن النقاش[٣٤١] لەکۆتایدا هەموی هاتنە سەر ئەو نەخشەیەی ئیٚستا کەچاکترین خزمەت بە پلانەکە بکات، کەواتە ئەوسنورو دابەشیە بە ئیرادەی کوردو

---

[٣٣٩] بروانە: تاريخ امه العربيه ص٤١٠-٤١٦.

[٣٤٠] سعد بشير اسكندر- سياسةالبريطانية العظمى تجاة مستقبل كردستان ص١٥٥

نشأة الدولة العراقية –ص١٤٩

عەرەب ویان بە پێی پێوەێکی نێودەوڵەتی نەبوە، بەپێی بەرژەوەندی ئیستعمارو (ئاسایشی نەتەوەیی) ئیسرائیل دارژراون.

لێرەوە تێدەگەین کە (لۆرانس)وتی ئەو دەوڵەتانە وادروست دەکەین نرخی سەنتێکیان نەبێ لەکی هاتوە، لە پرۆتۆکۆلەکانی زایۆنیش هەروا دەڵێت، واش دەرچوو، هەرلەسەرەوەسفی سعد زەغلول کەجامیعەی عربی دروست بوو ووتیان جامیعە مانای کۆی (٢٢سفر)[٣٤٢]، لەوەش خراتر (م قەزافی) لەکۆنگرەی بەغدا وتی بڕیارەکانی لەنێوان (٠، - ١ سفرو ناقس یەکە)[٣٤٣]، بۆیە بە پێچەوانەوە رۆژئاواو ئیسرائیل دژ بە هەر دەستکاریەك دەبێت لەناوچەکە ڕووبدا، ئەوە وایکردوە بزوتنەوەی کورد ئاوا بکەوێتە مەینەت، هەر ئەوەش بوە وای کرد ڕۆژئاواو ئیسرائیل لای عیراق وعەرەب بگرن دژ بە ئیران، هەر ئەوەشەدژایەتی (حماس)و لایەنگری فتح بکەن، وڵاتانی عەرەبی پڕە لە بنکەی سەربازی ئەمریکی ومەکتەبی ئیسرائیلی، هەر ئەوانن ڕژێمەکان دەپارێزن ودژ بەمعارەزەی نیشتمانی وئاینی ودلسۆزانی عەرەبی ڕاستەقینە دەوەستن. لەگەل دەیان بەلگەی تر.

٣ ـ تائێستا ئەو هەرایەدەکەن لە بارەی(مؤامرة التقسیم) هیچ رووی نەداوە، بە پێچەوانەوە ئەوەتا ئەمریکا وا عیراقی ڕاگرتوە تا تەقسیم نەبێ، زۆربەی وڵاتانی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست وڵاتی(فاشیلن)شایستەی گۆڕینن یان هەلوەشاندنەوەن ڕۆژئاواو ئیسرائیل ڕایگرتوون.

**٤ ـ کێ ڕێی لە عەرەب گرتوە ڕۆڵی عەرەبی نەبینن جگە لەخۆیان، کێ ڕێی لێگرتوون یەکبگرن، ئەوەنیە بوویتەقسەی نەستەق:إتفق العرب علی ان لایتفقوا، ئیتر میلەتانی هەژاری وەك کوردوبەربەرو دارفۆروحوسی وقیبتی وهەتا میلەتی عەرەبی بێ دەسەلاتیش چ بکەن.**

**٥ ـ ئیترچۆن دەبێ بزوتنەوەی کوردی ڕەوا بەفیتی ئیستعمارو زایۆنی وەسف بکەن، دژ بەکێ، ئەی ئێوە[٣٤٤]خۆتان دروست کراوی ئەوان نین، (مزاحم باجە جی)وکۆمەلێك لە**

---

[٣٤٢] من قضایا الثورة والانسان العربي... ص٢٩.

[٣٤٣] ) له کتێبی(حتمیة التغیر ـفی الشرق الأوسط ص٢٢-٢٣) هاتوە: منذ إستقلال العرب الشیء الوحید الذی قدمە هو ١-الحروب ٢-التوتر بین العالم العربی والعالم المتحضر ٣-مشاکل الداخلیة ٤-عدم وجود الحریة ٥-حکم قبلی ٦-الطریق الوحید للتغیر هی إما الإنقلابات أو الإغتیالات ٧- سیاسة فیها یساوی عنف

[٣٤٤] مەبەست دەسەلاتدارانی عەرەب وشۆڤینیستەکانی بەرهەمیان هێناوە نەك میلەتی عەرەب

عەرەبی بەرز بەرامبەر (کوکس) وەستان وپێیان ووت (لاتعتبروا الثورة الحالية التى قامت بها بعض القبائل الرحالة ثورة وطنيە، ولا يمثلون العراقيين)[٣٤٥]، (مس بيل) دەڵێ عەرەبەکان دەهاتنە لامان دەیان ووت: أنت بمقامة النبى عيسى وكوكس بمقام الله[٣٤٦]!!، ئەگەر ئێوە باش بن لەگەل ئەومیلەتانە هەزارئیسرائیل وئەمریکاهەوڵ بدات ناتوانی، ئینجابۆ بەدەوڵەت بونی کوردبە ئیسرائیلی دوەم ناوزەد دەکەن، ڕاستە لە پرۆژەکانی جامیعەی ئیسلامی وسەلتەنەتی عوسمانی وشۆرشی ئیسلامی بیست کوردستان پێشنیارکرا بۆ بەدەوڵەت بون، بەلاّم کوا لەکام پرۆژەی ئیسرائیل یان ڕۆژ ئاوابەدەوڵەت بونی کوردستانی تیایە، کەچی وڵاتانی عربی تیایە، ئەوەتە کە کوردستان دابەش دەکرێ بەهەمان پرۆژە سوریاو عیراق وولاّتانی عەرەبی دروست دەکرێ، شام وعیراق لەگەل ئیسرائیل بەیەك(فەسل—فەسلی٧لەمادەی٩٤تا٩٧)دروست بووینە، ئیسرائیل وئاژانسەکانی یەهود ڕۆڵی گرنگیان بینیە لەدروست کردنی عیراق، ئەوە بوو ڕێکەوتنەکانی سەرانی عەرەب لەگەل وایزمان وهرتزل نیشانمان دان، کوا یەك ڕێکەوتنی سەرانی کورد لەگەل ئەوانە، ئینجا نەوەی یەکەمی ناشیۆنالیستە عەردبەکان یەهودیەکانیان پێ نزیك تر بوە لە میلەتانی موسلمانی (نا سامی)، ئەوتێروانینە وای کرد ئەوەی ناوی نراوە(ثورة العربية الكبرى ـ بەسترۆکایەتی شريف حسين بن على) سنجاقی قودس لە عوسمانی وەرگرتەوەولەڕێی بەریتانیا درا یەهودیەکان، لە دیباجەی ڕێکەوتنامەکەی عەرەب ویەهودیش لە١٩١٩ ئەو(قرابە الجنسيە)عەرەب ویەهود رەنگی داوەتەوە کە ئیسرائیل وشام وعیراقی پێ دروست کرا[٣٤٧]، کەواتە بۆچی سوریاو عیراق و ئوردن ئیسرائیلی دوەم وسێیەمو ..دەیەم نەبن نەك کوردستانی سەربەخۆ، ئەگەر کوردستان ئیسرائیلی دوەم بوایە ئەوا ئێستا ئێوە وەك ئیسرائیل دانتان پێ دەهێناوئالاّی

---

[٣٤٥] د فياض -ثورة العراقية الكبرى ص٣٦٢

[٣٤٦] العراق فى رسائل مس بيل ص٢٩٣ (وقدأيدت ذلك مصادر أخرى، فقد جاء فى كتاب (مقتل الجمان..) آن مس بيل لقبت فى العراق ب(أم المؤمنين ).

[٣٤٧] اتفاقية فيصل-وايزمان: إن صاحب السمو الملكي الأمير فيصل ممثل المملكة العربية الحجازية والقائم بالعمل نيابة عنها والدكتور حاييم وايزمن ممثل المنطقة الصهيونية والقائم بالعمل نيابة عنه يدركان القرابة الجنسية ،والصلات القديمة القائمة بين العرب والشعب اليهودي ويتحقق أن أضمن الوسائل لبلوغ غاية أهدافهما الوطنية هو في اتخاذ أقصى ما يمكن من التعاون سبيل تقدم الدولة العربية وفلسطين ولكونهما يرغبان في زيادة توطيد حسن التفاهم..

کوردستان لەسەرولاّتانی عەرەب دەشەکایەونەشتان دەتوانی ئاوا ئەنفال وکیمیا بارانی بکەن.

٦ ـ دەمێکە سەرکردەی ژیری کورد تێگەیشتوە کە ئیسرائیل ورۆژئاوا مەیل ولایەنگیری عەرەبیان بەسەردا زالە نەك کوردستان، ئەو بەڵگەنامەی خوارەوە بەسە بۆ تێگەیشتن [٣٤٨]

٦ ـ برایەتی ڕاستەقینە بەو جۆرە گووتارو تێڕوانینانەی برایانی عەرەب دروست نابێت، لەلای کوردیش ئەگەر وابزانن لەوەتەی مێژوە هەرعەرەب کوردی چەوساندۆتەوەو ئەوان بەرپرسن لە مەینەتی و وابزانن ئیسرائیل ورۆژئاوا رزگارکەری کوردەو ناکۆکی کوردو عەرەب ئوسیلێکە لە ئوسولەکانی کوردایەتی.. ئەواتێك گەیشتن و برایەتی دروست نابێت، ناوەرۆکی بزوتنەوەی کورد بەسروشتی خۆی ناتەبانیە لەگەل پرۆژەی یەکخستنەوەی عەرەب وکێشەکانیان، هەروەك لەخالەهاوبەشەکانی فلستین وکوردستان نیشانمان دا، ناتەبایی بزوتنەوەی کوردو عەرەب لەو کاتانەیە کە یەکێکیان یان هەردوو لا لەسەر عەیار نەبێت

٧ ـ ئەوەش بەشێکە لەپرۆژەی چاکسازی ڕۆژ هەلاّتی ناوەڕاست، دەبێ لەسەر بنچینەی بڕیاری چارەنوس بێت، یان وەك دروشمەکەی شێخ سعیدی پیران: گەڕانەوەی خیلافەت ئەگەر ئەوەش نەبێ هەریەکە دەوڵەتی خۆمان هەبێ، ئەوە پرۆژەی چاکسازی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستە، بۆ ئێمە چاوەڕوانی ڕۆژئاوا بکەین پرۆژەی چاکسازی ڕۆژهەلاّتی ناوەڕاستمان بۆ گەلاڵە بکەن.

کەواتە لەو دەمە چارەسەری دروست کردنی برایەتی کەوتۆتە دەست برایانی عەرەب، بەتایبەتی دەسەلاّتداران، سێ دۆخی لەپێشە:

[٣٤٨] FO ٦٢٤/٦٣ الكرد وحركة مايس ١٩٤١ تقرير رقم ب.س ١٧٧- ٧\تموز\١٩٤١ س ج. ادموندز ، المستشار في وزارة الداخلية في العراق

..هناك الواقعيون الذين وصلوا الى قناعة مفاداها بأن مصالح السياسة الاستعمارية البريطانية لا تتفق مع الاهداف القومية الكردية و تخدم المصالح العربية القومية وليس من المعقول أن نتوقع ان تقوم الحكومة البريطانية بأنتهاج سياسة تثيرمشاعر العرب من أجل إرضاء الكرد. س.ج. أدموندز٢٧-٧-١٩٤١

١   بەهۆی ئاگر و ئاسن ئاسایشی نەتەوەیی عیراق عروبی بەسەر ئاسایشی نەتەوەیی کوردستان بسەپێنی هەر وەك لە (٨٠) ساڵەی تەمەنی عیراق وای کردووە سەرکەوتوو نەبووە

٢   دەوڵەتێکی لامرکزی و فیدراڵی دروست بکرێت هەر لایەیەی ئاسایشی نەتەوەیی خۆی بپارێزی لەودش چاکتر بنەما دەولیەکان (مافی چارەنووسی) پەیرەو بکرێت و هەرلایە ئازاد بێت لەدیاری کردنی ئەو چارەنووسە

٣.  دان بنێی وەك خۆی عیراق چۆنەو چۆن دروست بوە کەبریتیە لە: دەوڵەتێکی دەستکردی ئیستعمار، دەوڵەتێکی (مرکبە ـ ئاوێتەیە)، دەوڵەتێکی نا عەرەبیە، دەوڵەتێکی (دووهەرێمی کوردی وعەرەبی )وخەڵکی تریش، دەوڵەتی پێکهاتەیە لە سونەو شیعەو کوردو خەڵکی تریش، بە هۆی ئەوەی دان بەو ڕاستیانە نەنراوەو بەتایبەتی لەلای سونەی عەرەوب و تەیاری عروبی بەگشتی، باشترینەکەیان کە وەسفی کوردو عەرەب بە باشەدەکەن، دەڵێن   إخواننا الأكراد جاؤو وإستوطنو في شمال العراق منذ آلاف سنين وأصبحوا إخواننا، پیشوو تر باسمان کردوە کە ئەو دەستەواژە هەموی هەڵەیە، بۆیەش عیراق بوویتە دەوڵەتێکی فاشیل ...، کەواتە پێویستە چارەی بکرێ واتە خودی عێراق کێشەیە نەك کورد، چارەکردنی بە پێی وەسفی ڕاستەقینەی خۆی، بەو شێوەیە:

١ ـ مادام دەوڵەتێکی عەرەبی نیە با ئەو برگە دەستوریانە هەلگرێ کە پێچەوانەی ئەو ڕاستیەن، کۆتاییش بە ڕۆڵی عەرەبیانەی (مال وێرانی) ببینی بەڵام  ڕۆڵی ئیسلامیانە باببینی لە کێشەکانی فلستین وچی هەق بوو

٢ ـ دەوڵەتێکی دوو هەرێمیە وەك چیکۆسلۆڤاکیا باناوی هەردوو هەرێم هەلگرێ دەسەلاتیش بە هاوبەشی(مبدأ الشراكە) بێت.

٣ ـ مادام سێ پێکهاتەی ڕاستەقینەن ئەوا سێ فیدرالی چارەسەردوحکومەتی ناوەندیش بە پێی شێوازی (دیموکراسی تەوافوقی) دروست بکرێ.

٤ ـ بۆ ئەوەی هیچ لایەك هەڕەشە نەبێت بۆسەر هیچ لایەك ئەوا لەسەرەتا بە میساقێکی نیشتمانی ولەژێر چاودێری نەتەوە یەکگرتوەکان ئەو دەوڵەتە بەڕێوە بچێت، وا چاکێشە ئەو دەوڵەتە سوپای نەبێت.

٥ ـ لەکۆتایدا ئەگەر ئەوانە چارەسەر نەبون وهەر نا ئارامی وناتەبایی لەو وڵاتە بەردەوام بوو ئەوا مادام ئیستعمار ئەو دەوڵەتەی بە دەستکردانە دروست کردوە ئەوا هیچ شوێنێکی پیرۆز نیەو زۆر ئاسایە شریکەکان لێك ببنەوەبە دادگەرانە وەك چیکۆ سلۆڤاکیا.

ئەگەر ئەو هەنگاوانە کران ئەو کاتی بەرە بەرە وەرچەرخانی دەوڵەتی عیراق لەو دۆخە ستوونیەی، لەناسنامەی ستونی (عروبی) بۆ دەوڵەتێکی نیشتیمانی مەدەنی دەچێت، یان بۆ دەوڵەتێکی ئاسۆیی و دادگەری ئاینی، بەرەبەرە جیاوازیەکانی هەردوو ئاسایش دەتوێتەوە، لەجێ ی دا بنەمای ئاسایشی نەتەوەیی هاوبەش دەخەملێ، تیایدا ئینتمایە ستونیەکان و کاردانەوە و سەرئەنجامەکانیان کاڵ دەبێتەوە تا تێکەل دەبن، ئەوەش لەلایەن بەغداوە دەست پێشخەری دەوێ و بتوانی متمانە دروست بکا کە تا ئەو ساتەش نەیکردوەو بە نیازیش نیە.

## دەرباز و مافی چارەنووسی:

مافی چارەنوسی میللەتان لەدەوروبەری جەنگی جیهانی بەتەواوی سەری هەڵدا، هەر لایەی میللەتانی ژێر دەستەی هان دەدا بۆ سەربەخۆیی تاگەیشتنە ئەو رادەیەی لێدوانی فەرمی بەریتانی و فرنسی لە ١٩١٨ دەرچێت، هەروەها چواردە بنەماکانی ودرۆ ویلسۆن لە ١٩١٨ دەرچوو، هەروەها لەبنەماکانی شۆرشی ئۆکتۆبەری ١٩١٧ رووسیاش ئەو مافە پەیرەو کرا

دوای لەمادەی(٢٢)ی (عهد عصبە الامم) ئارادەیەك وبەجۆرێکی ترمافی چارەنوسی لەشێوەی ئینتداب رەنگی دابۆوە،بەلاّم لەمیساقی نەتەوەیەکگرتووەکان بە ئاشکراتر لە پەرەگرافی (٢، ٣) ی مادەی (١) و لەمادەی (٥٥) هاتووە، بەشێکی زۆری تر مافی چارەنوسی بۆ پێش جەنگی جیهانی یەکەم دەگێرنەوە، هەردوو شۆرشی ئەمریکی

١٧٧٦و فرنسی لە ١٧٨٩ بەیەکەم بەرجەستەی ئەو جارنامەیە دەزانن، بەشێکی تر بۆ ڕێکەوتننامەی ویستڤالیای (١٦٤٨) دەگێرنەوە، لەگەڵ زۆر رای تریش لەڕاستیدا مافی چارەی خۆنووس لەگەڵ دروست بونی مێژووی سیاسی نەتەوەکان دەست پێ دەکا، لەرووی یاساییەوە دەتوانین بڵێین لەگەڵ سەرهەڵدانی پەیوەندی سیاسی و یاسایی نێوان هەرێم و گەل و دەسەڵاتی سیاسی دەست پێ دەکا، بەشێوەیەك هەرێم بۆ نیشتیمان و گەل بووە نەتەوەودەسەڵاتی سیاسیش بووە ئیرادەی نەتەوەی نیشتیمانیك بۆ خۆ بەرێوەبردن

بەو پێ یە مێژوودکەی کۆن ترە لە جەنگی جیهانی یەکەم (١٩١٤ – ١٩١٨)، ڕەنگە پرۆژەی جامیعەی ئیسلامی کەلەسەر دەستی شێخ سعیدی نەورەسی و جمال الدینی ئەفغانی و لەگەڵ سوڵتانی عبدالحمید یەکەم تەقەلای مافی چارەنووس بێت لەجیهانی ئیسلامی، دوای ئینقلاب بەسەر ئەو پرۆژەیە کرا لە ١٩٠٨ و لە ١٩٠٩ سوڵتان عبدالحمید دەرکرا و بەرەبەرە بیری تۆرانێکی تورکی هاتەنێو عوسمانی و زیاتر نەتەوەکانی تری وەك کورد و عەرەب و جەرکەس و ئەرنائووت و هەست و خواستی نەتەوایەتیان بۆ دروست بوو، بەو شێوەیە جیهانی ئیسلامیش وەك جیهان کەوتە سەرەی دروست کردنی دەوڵەتی نەتەوەیی کەدوا هەنگاوی مافی چارەنووس بوو بۆ میللەتان، بەو شێوەیە نەخشەی سیاسی نوێی جیهان دروست بوو، شەرعیەت درا بەهەر نەتەوەیەك کە خاوەنی هەرێم و نەتەوە و مێژوو و فەرهەنگی سەربەخۆ بێت وبەرگەی (مقەوماتی) دەوڵەتی هەبێت بەجۆرێك: لە (هەرێم)دا مقەوماتی جوگرافی و ئابوری هەبێ، لە(گەل)دا مقوماتی کۆمە لایەتی و گەشەی تێدابێت، لە(دەسەڵات)ی سیاسیش مقوماتی سیاسی و یاسایی و بەرێوەبردنی تێدابێت، ئەوە بۆیان هەیە دەوڵەت دروست بکەن و بریارەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ ئەو مافە دەیانگرێتەوە، سەرەرای ئەوەی لەکوردستان پایەکانی دەوڵەت هەبوو، کەچی بەدەوڵەت نەگەیشتن مەینەتی کوردی لێ دروست بوو، ئەوەی زیاتر ئالۆزی کرد ئەوەیە لەدوای دروست بونی ئەو دەوڵەتانە و دروست بونی (عصبە الامم ١٩١٩) ودواییش (نەتەوە یەکگرتووەکان ١٩٤٦) تا ئێستا ١٩٣ وڵات ئەندامن لێ ی، بستە خاکێك لەو جیهانە نەماوە بێ سەرودری، هەموی مولکی دەوڵەتێکە لەو دەوڵەتانە، هەرچی ڕێکەوتن و بنەمای یاسایی نێو دەوڵەتیە لەنێوانیان لەسەر بنچینەی بەرژەوەندی ئەو وولانە خۆیتیان، واتە ئاسایشی نەتەوەیی ئەو وولانە رەچاو دەکرێ کە بریتیە لە:

پاراستنی یەك پارچەیی خاكیان (هەرێم) و دەست تێوەرنەدان لەئیش و كاری ناوخۆ، كەواتە هەتا بنەماكانی نێو دەوڵەتی بە ئاشتی و ئارامی وپێك گەیشتن و هاریكاری (وفاق الدولی) لەسەر بنچینەی بەرژەوەندی هاوبەش بێت، ئەوا بواری جم و جۆل وتەكان بەرەو رزگاری میللەتی ژێر دەستە تەنگ دەبێتەوە، ئەو كاتە میللەتی بێ دەوڵەت ناخوێنرێتەوە، هەرچەندە ناوی (امم متحده) بەڵام لەڕاستێدا (دول المتحده)یە، سزا بۆ میلەتان هەیە بۆ دەوڵەتان نیە، سزای هەرەتوندی (UN) بۆ دەوڵەتان لەبەندی حەوتە كە لەمادەی ٣٩ را دەست پێ دەكا تامادەی ٥١، هەروەك عیراق پێ سزادرا لەدوای بریاری ٦٦١ ی ١٩٩٠، ئەو بەندە سزایەش بۆ ئەو دەوڵەتانەیە كە دەبنە مایەی هەرەشە لەسەر ئاشتی و ئارامی نێودەوڵەتی، بەو شێوەیە هەرەشە لەسەر میللەتانی ژێر دەستە وبێ دەستە نابێتە هۆی دەرچوونی بریارێك بەپێی بەندی ٧، هەروەك بینیمان ئەو هەمو سەركێش و تاوانانەی عیراق (هەتا ئەنفال و كیمیاویش) نەگەیشتنە ئەو سزایە، بەڵام داگیركردنی كویت گەیاندیە ئەو سزایە، تەنانەت بریاری ٦٨٨یش بۆ كورد دەرنەدەچوو ئەگەر نامەكەی وەزیری دەرەوەی ئێران و توركیا نەبوایە ، لێرەوە میللەتانی ژێر دەستە ـ بەتایبەتی كوردستان ـ دووچاری بنەمایەكی زۆردەگمەن دەبێت، ئەویش دروشمی (باكونین)ە كە دەڵێ (تحطیم كل ماهو قائم خیر) ([٣٤٩])، هەرچەندە باكوین مەبەستی لەو بنەمایە بۆ شۆرشی كرێكارانە لە دژی سەرمایەداری، كە بەدروشمێكی و بێ سەروبەر (فەوزەوی) بەناو بانگە، بەڵام بۆ كوردستان گونجاوە، دەبینین مافی چارەنووسی كوردستان لەو دەروازانەوە دێت كە دژ بە واقیعە، دژ بەنەخشە رۆژهەڵاتی ناوەڕاستە، دژ بە (وفاق)ە، دژ بەرێساكانی یاسای نێودەوڵەتیە، هتد، سوودمەندە لە هەڵەی ستراتیژی وولاتی داگیركەر یاخود هەر ستراتیژیەكی نێودەوڵەتی، ئەزمووتی ١٠٢ ساڵەی رابوردووی تەمەنی بزوتنەوەی كوردایەتی ئەوەی سەرووی سەلماندووە، ئەو (ئەنجام)ە رێ خۆش دەكا بۆ دیاری كردنی دەروازەكانی رزگاری كوردستان،بزانین لەكام پرۆژەو مەدرەسەی جیهانی رزگاری كوردستان دێتە دی؟

---

[٣٤٩] بروانە: باكونین _ مبادئ الثورة

## پڕۆژە و ئامرازەکانی ڕزگاری کوردستان

ئەوەی تێبینی دەکرێت ئەومیللەتانەی دووچاری مەینەتی هاتوون زۆربەیان میللەتی ڕەسەنن:

\+ هەزاران ساڵە گەلی ئیرلەندا لە خاك و وو لاتی خۆیان بووینە، لە ساڵی ١٦٤١ ز (کرۆمۆل) ی بەریتانی گورزێکی کوشندەی لێ وەشاندن ئینجا دەستیش بە پاکتاوی ڕەگەزی کرد و ئینگلیزی بردە ئیرلەندا...

\+ گەلی فلستین ڕەسەن ترن لە یەهوودیەکانی ئێستا حکومەتن ـ جگە لە یەهودیەکانی سابرا کە دانیشتوی رەسەنی فلستینن.

\+ گەلی کورسیکا کە لەبن دەستی فرنسایە گەلێ کونن لە ساڵی ١٧٩٦ ناپلیون[٣٥٠] داگیرکرد.

\+ گەلی باسك کە ئێستا ژێر دەستی ئیسپانیاییە بەشێکیش لە فرنسی کۆن ترین میللەتی ئەورووپین.

\+ گەلی بەربەریش کەلەژێر دەستی جەزائیر و مەغریب و مۆریتانیا.... ئەوا کۆن ترین میللەتن نەك هەر لەناوچەکە لەسەرانسەری ئەفریقا.... بەهەمان شێوە گەلانی کشمیر، تبت، چاچان، تامیلیەکان، مۆرۆلە خوارووی فلیپین، کورد، کەچی ژێر دەست کراوون.

ئێستاش وەلامی پرسیارەکەی سەروو دەدەینەوە وپڕۆژەکان باس دەکەین

یەکەم ـ پڕۆژەوئامرازی چەپیەکان:

لەسەرەتای شۆرشی ئۆکتۆبەری ١٩١٧ لینین کۆمەلێك بنەمای جاڕدا بۆ مافی چارەی خۆنووس و ولاتانی وەك فنلندا و پۆلۆندا.. سەربەخۆییان پێ وەرگرت، بەلام لەگەل خەفە بونەوەی ئەو هەلچوونە هاتنەوە سەربنەمای مارکسیزم لەو باردیەوەو دەستیان بەسەر چارەنووسی میللەتانی تریش گرتو یەکێتی سۆڤیەتیان لەو ١٥کۆمارە بە تۆبزی پێك هێنا: (روسیا، ئوکرانیا، کازاخستان، ئوزبەکستان، روسیای سپی، جورجیا، لیتوانیە، ئازەربیجان، مالدیڤیا، تاجیکستان، لاتڤیا، ئەرمینیا، تورکمانستان، ئستوانیە، قیرغیستان))، بۆیە پڕۆژەی چەپی کوردیش هەروا ڕوون نەبووە ئاخۆ مافی

---

[٣٥٠] ناپلیۆن خۆشی بەنەسل کۆرسیکیە.

[٥] ٤هەریمی وەبەر ئیسپانیا کەوتووە و ٣ شی وەبەر فرنسا، بۆیە دروشمی ریکخراوی( ئیتا)ی باسك بریتیە لە: ٣+ ٤=١

چارەنووسی کورد مانای چیە، لەو بارودۆخانەی کەلەنێو شۆرشی کورد بونایە ئەوا ئەو ئەدەبیاتەی مارکس و ئەنجلسی سەبارەت بە ئیرلەندا و جارنامەکەی لینین لە سەردتای شۆرشی ئۆکتۆبەر بەکاردەهات، ئەگەر لەگەل حکۆمەتەکانی ناوەندی بونایە ئەوا جۆرە گوتارە سیاسیەکانی کرێکاری دە هات کە ئەو پرۆژەی رەسەنی چەپی بوود بۆ مافی چارەی خۆنووسی.

لە بیری چەپی راستەقینەدا توخمی نەتەوەیی و نەژادی تیانیە، بەلکو ئنتمای چینایەتی بە پلە یەك و بنچینە وەردەگیرێ، باقی ئینتماکانی تر سانەوین[351] بۆیە لەو پرۆژەیە پێیان وایە بەرزگاری چینی کرێکار هەمو کێشە نەتەوەیی ونیشتمانی و سیاسی و کۆمەلایەتی و ئابووری و... چارەسەر دەبێ، ئیتر کێشەیەکی وەك کورد، بەشە(جزء) کێشەی کریکار گشتە(کل)، رێبازی ئەقلی لوجیکیش ئەوەیە کێشەی (کل) چارەسەر بکرێ نەك (جزء)، بەوشێوەیە گەلێ جار خەباتی کوردایەتی و پرۆژەی سەربەخۆی کوردستان بەداوایەکی رەجعی و برجوازی وهەندێ جاریش بە فاشیانە لەقەلەم دراوە، بۆیە دروشمی چەپیەکان لە ولاتانی داگیرکەری کوردستان ناوەندیانە بوو وەك دروشمی(حشع) (نیشتمانێکی ئازاد و گەلێکی بەختیار)، مەبەستی نیشتمان عیراقە، گەلەکەش گەلی عیراق، زیاتر لەوەش گەلێ جار لەسەر دیوار دەنووسرا (کوردایەتی شەرمەزاریە) ! هەربەو تەرازوەش لینین پشتی(ئەتاتورکی) گرت لە دژی شۆرشەکانی کورد ١٩٢٠ ـ ١٩٢٨[352] دوایش تێك دانی کۆماری مهاباد ١٩٤٦، پشت گرتنی سۆڤیەت بۆ بەعسی عیراق لە ١٩٧٢ بەدواوە چەك هەلگرتنی چەپی و شیوعیەکان بۆ عیراق لە دژی شۆرشی کوردی زۆر نمونەی تر[°]، لە راستیدا ناکرێ ئەوە بکرێتە پرۆژەی هەمو چەپی، چونکە بەشێکی تر پێیان وابوو کوردستانیش شایستەی سەربەخۆیە، بەپشت بەستن بە پرۆژەی جیهانی و ئەزموونی رزگاری گەلان لەژێر دەستی ئیمپریالیزمی جهانی دەست کاری یەکێ لە یاسا و پرۆژە بنچینەییەکانی مارکس کراو گۆرا بۆ: دەشێت لەهەندێ بارو دۆخی تایبەتی ناکۆکیە سانەوییەکان وەختیانە جیگەی ناکۆکی پلەیەك بگرنەوە، لەوانە:

---

[351] بۆزیاتر بروانە: بیان الشیوعی(مانیفیست)- مارکس وأنجلس

[352] مستەفا کمال دوو رێکەوتنی لەگەل رووسیا کرد بە سەرکردایەتی لینین ، یەکەمیان لە ٣٠/کانون دووەم /١٩٢٠، دووەم لە١٦/٣/١٩٢١ تیایدا بە روونی پشت گیری لە ئەتاتورك کردو دژی سیڤەر وەستاو بیری کوردستانی سەربەخۆی بە کەلالەی ئیمپریالیزم وەسف کرد

[°] گەلی جار سەدام دووبارەی دەکردەوە گوایە کاتی کە بریاری ئۆتۆنۆمی درا نوێنەری شیوعی ووتویەتی ((سیدی لماذا حکم الذاتی ))، ئەو کاتی پێکەوە لە بەرە بوون وتا ئەو ساتەش حزبی شیوعی نەفی ئەو کۆتەیەی سەدامی نەکردۆتەوە

خەباتی رزگاری نیشتمانی (لە قۆناغی خۆی) جێگەی پلەیەکی خەباتی کریکاران لە دژی سەرمایە داری بگرێتەوە، بەو شێوەیە میللەتانێکی زۆر بەو هۆکارە لەئەفریقا و ئەمریکای لاتینی و ئاسیا بون بە دەولوت و ئەندام لە(un)، بەو ئایدۆلۆژیایە بەهێزەی چەپ میللەت دە ووروژاو توانای بەرگری و رزگاری دروست دەبوو، بەڵام ئەو پرۆژەیە لە خزمەتی جەنگی ساردو جەنگی ستراتیژی سۆڤیەت دژ بە ئەمریکا دابوو، واتە تەنها ئەو جۆرە خەبات و پرۆژەیان بەرەوا دەزانی کە لە دژی ڕاستەخۆی ڕۆژئاوا بوو نەك گەلانی سەردەست، هەر بۆیە بینیمان دروشمی چەپیەکانی کوردستانی زیاتر ڕوو لە ئیمپریالیزمی جیهان بوو، بۆیە لایەنە چەپیەکانی کوردستان لە (ی. ن. ك) و(حسك)، (حزبی زەحمەت کێشان)، (حشك)، (حدکا)، (پەکەکە)، هەتا (پ دك)یش دروشمی بنچینەییان خەبات بوو لە دژی ئیمپریالیزمی ئەمریکی و سەرمایەداری و دیموکراسیەکە و بازاری نازاد.... گوایە بە داروخانی سەرمایەداری مافەکانی کورد دەگێرنەوە بۆیە زۆر جار لە کوردستانیانە وەردەگەران بۆ عیراقیانە یان ئیرانیانە.....، ئیتر چارەسەری کێشەی کوردیان لە چوارچێوەی ئەو دیڤاکتۆیەی کەلە دوای سایکس پیکۆ بووە هۆی دروست بونی عێراق و سوریا و تورکیا و ئیران و.... واتە پرۆژەکانیان رزگاری تەواوی کوردستان و یەکخستنەوەی تیانەبوو، ئەگەر بەووردی سەرنج بدەینە پرۆژەکانی رزگاری کە بریتی بون لە:

١ ـ پێك هێنانی حزبی پێشرەو لە کریکاران(واتە لە کریکارانی عیراقی نەك هەمو کورد)

٢ ـ خۆبەستنەوە بە جەمسەری سۆشیالیستی لە دژی ئیمپریالیزمی جهانی

٣ ـ جەنگی رەوا و ناکۆکی پلەیەك لەگەل برجوازی ناوەکی و ئیپمریالیزمی جهانە، ناکۆکی نەتەوەی ژێر دەستی کورد نەتەوەی سەرەدەست و رژێمی عیراق سانەویە.

٤ ـ بانگێشەی برایەتی کورد وعەرەب لە چوارچێوەی عیراق

بەو شێوەیە ئەو پرۆژەیە نەبووە نموونە بۆ کێشەکانی نەتەوەیی لە ولاتانی سۆشیالیستی و چەپی

دوودم ـ پرۆژەو ئامرازی لیبرالی بۆ رزگاری کوردستان:

ئەو پرۆژەیە لەسەرەتای سەدەی(٢٠) لەگەل سەرهەلدانی عەلمانی لە کوردستان باوی هەبووە، پشتی بەست بە سەروەریەکانی ئەزموونی تەکنیکی و زانستی ڕۆژئاوا بەداهێنان

و تەنینەوەی فکری ناسیونالیزمی ودوای دەوڵەتی نەتەوەیی و هەڵمەتی ئیمپریالیزمی، کە لە کۆتاییدا مەینەتی کوردی لیّ دروست بوو، بۆیە لەدوای دروست بونی دەوڵەتەکانی عیراق وتورکیاوسوریاو..کەمتربوە جێی ئومێدی کورد، لەسالی١٩٤٢ راپۆرتێکی بەریتانی لەبەغدا باس لەوە دەکا کە سەرکردایەتی کوردی واقیع بین ئومێدی بەئینگلیز نەماوە، بەشێك نەبێت[٣٥٣]، بۆیە تا پێش رووخانی شیوعیەت و سۆڤیەت و سەروبەری راپەرینی ١٩٩١ کەمتر حزبە کوردستانیەکان خۆیان بەخاوەنی لیبرالی و پرۆژەکەی دەزانی، بە پێچەوانەوە زۆر بە توندی دژی ئەو پرۆژەیە بووینە بە هەمو ئاڕستەیەك، وە بگرە ناو هێنانی توومەت و سزا بوو، نەك هەر لەبەر رزگاری نیشتمانی بەڵكو بەهۆی تەوەری ررزگاری _کۆمەلآیەتیش، بۆیە دروشمیان رووخاندنی ئیمپریالیزم ولیبرالی بوو، بەلآم ئێستا زۆربەی هەرە زۆری خەڵکی کورد چاوی بریوەتە ئەو پرۆژەیە، کە بریتی نیە لە کۆمەڵە بنەما و ستراتیژ و نەخشە و پلان، بەڵكو بریتیە لە ( یانصیب) (بەخت) چونكە بنەماكانی لەسەر بەرژەوەندی دارژاوە، ئەو بەرژوەندیە جاروایە دژت دەوەستیّ وەك زۆربەی جار لە دژی کورد وەستاوە دواییەكەیان ١٩٧٥و١٩٩١، جاریش وایە دەبتە پالپشت وەك ئێستا، هیچیان هەمیشەیی نیە، بۆیە حزبە لیبرالیەكانی كوردستانیش ستراتیژیەتی(ببینەو دایرێژە) پەیرەودەكەن، هەربۆیەش بە دەگمەن ولآت ونەتەوەیەك نادۆزیەوە لە مێژووی كۆن وسەردەمی دووجەمسەری بەو پرۆژەیە رزگاری بوبێت جگە لە (ئیسرائیل) و تایوان(خەریكە كۆسۆڤاش)، ئەو دووەش لێكدانەودی تایبەتی هەڵدەگریّ، ئینجا حزب و لایەنەكانی لیبرالی (بە كوردسیتانیەكانیشەوە) بەهۆی ئەو پرۆژەو مدرسە لاوازە ناتوانی جەماوەر بووروژێنیّ بۆ هێنانەدی ئامانجەكانی رزگاری كوردستان، بەپێچەوانەوە بنەماكانی بیّ ئایدۆلۆژی ئەو پرۆژەیە كۆمەڵگەیەكی مادی و بەرژوەند پەرستی وات بۆ دروست دەكا توانای بەرگری و رزگاری نابیّ، بۆیە هەمو هەوڵ و تیّ

---

[٣٥٣] FO ٦٢٤/٦٥ P.S. No ٤٥١/ BA/ ٢

العراق وزارة الداخلية – بغداد\نيسان\ ١٩٤٢

الى\ السير كورن والس سعادة سفير حكومة بريطانيا العظمى\ بغداد

مكن تصنيف الحركة القومية الكردية بصورة عامة الى صنفين: أ) هناك البعض ورغم التجارب المريرة السابقة يعتقدون بأن حكومة بريطانيا يمكن ان يفعل شيء ما للكرد. ب) هناك الواقعيون الذين وصلوا الى قناعة مفاداها بأن مصالح السياسة الاستعمارية البريطانية لا تتفق مع الاهداف القومية الكردية و تخدم المصالح العربية القومية وليس من المعقول أن نتوقع ان تقوم الحكومة البريطانية بأنتهاج سياسة تثير مشاعر العرب من أجل إرضاء الكرد. رغم أن الصنف الأخير ليس بالضرورة عدو لبريطانيا ، الا انه مستعد ان ينضم تحت راية أي سياسة تقوم بها أي طرف ، سواء معاد لنا ام لا ، طالما يضمن لهم تحقيق المصالح القومية الكردية.

کۆشانت دەبێ بکەوێتە سەر رەحم و بەزەیی کەورە ولآتانی جهان، لەسەردەمی نوێی تاك جەمسەری خەریکە هەندێ نمونە دروست دەبێ، تەیموری خۆرهە لآت، تارددەیەکیش کۆسۆفۆ، وا هەریەکە لە دارفور و کوردستانیش لە قۆناغی هەلپەساردنن، لە هەمان کوردستانی سەروو زمانی کوردیش قەدەغەیە کەچی رەحمی ئەو پڕۆژەیە نایگرێتەوە، ئەگینا بەپێی(سیستەمی نوێی جهانی) و(مل ملانێی شارستانی ) کەمتر بزوتنەوەی رزگاری خوازی لەفەرهەنگی ئەو پڕۆژەیە جێی دەبێتەود، بۆیە بەزۆری دان بە دیڤاکتۆی بارە سیاسیەکان دەهێنێ، تاکە پڕۆژەیەکی واقعی لەو مدرسەیە بەکاربێت لەلایەن کورد(یان هەر میللەتێکی تر) ئەوەیە بانگێشەی دیموکراسی بکەی بۆ وو لآتە داگیر کەرەکەت تا دوۆستت بۆ پەیدابێ ئەوەش لە دوا پرۆسە دا نەبە هێزی دیموکراسی و سیاسی نەبە هێزی یاسایی ناتوانێ کوردستانێکی سەربەخۆت پێش کەش بکا، لە باشترین دۆخیدا لە دۆزەخ دەرت دەکا بەلآم ناتخاتە بەهەشت، بەلکو هەر بیناکەی (سایکس بیکۆ) موکوم دەکەی کە کوردستانی لەت لەت کردووە.

سێیەم - پڕۆژەو ئامرازی سۆشیال دیموکراسەکان:

ئەوبەشەش کەمتر لە کوردستان پڕۆژە بووە، لە دیوی کوردستانی ئێران لە سالانی ۱۹۸۰ بە دواوە جار جار باسی لێوە دەکرا لەلایەن(حدکا)، ئینجا لە دوای راپەرینیش ماوەیەکی کورت نەبێ ئەگینا رۆلی ئەمریکا زیاتر لە سۆشیال دیموکراسیەکانی ئەوروپا هاتووەوە. هەندێ جۆرە سۆشیالیستی نیشتمانی هەیە کۆمەلێك بنەمای نەتەوەیی و وسەروەری نیشتمانی و رەچەلەکی تیایە، ئەویش لەبەر شکست هێنانی ئەزموونەکان شوڤینی لە فرنسا، فاشی لە ئیتالیا، نازی لە ئەلمانیا، فالانژیش لە ئیسپانیا، تۆرانی لە تورکیا، بەعسیەت لە عیراق، سست بونەوە، بەکورتی لە کوردستان پڕۆژەیەکی سۆسیالیستی واتە تیرۆتەسەل گەلالە نەبووە تا ئێستا.

چواردم - پڕۆژەو ئامرازی نەتەوەییەکان:

بیری نەتەوەیی بەرپرسە لەو مەینەتیەی کورد، لە کوردستان پڕۆژەی ناشیونالیزمی لەماوەی کورت سەری هەلداوە و نقوم بوویتەوە، ئەو پڕۆژەیە بەزەق تر و راشکاودنە تر بانگێشەی کوردستانێکی سەربەخۆ دەکا بەلآم هێزو رێکخستن و بەرنامە و نەخشە و پلانی بێ ستراتیژیەتە و لە کاروانی سەردەمیش تەواو بەجێ ماوە.

پێنجەم - پڕۆژەو ئامرازی ئاینی بۆ رزگاری کوردستان:

ئەو پرۆژەیە زۆر کۆن نیە، ڕاستە لەسەرە تای مەینەتی کوردەوە هەتا سالی ۱۹۷۵یش هەر زانای ئاینی سەرپەرشتی جولانەوەکانی کوردی کردووە، بەلاّم کەمتر خاوەن پرۆژەی دارشتراوبووینە، جگە لە سەرەتای تەقەلاکانی شێخ سەعیدی پیران و هەندێ سەرکردەی تری ئەو ساتی کێشەی کوردیان بەستەوە بە پرۆژەی ئیسلامی بە دروشمی(یان گەرانەوەی خیلافەتی ئیسلام یان کوردستانێکی ئیسلامی سەربەخۆ ) بەلاّم نەبوود زانستێك وەك (فقهی رزگاری کوردستان) و بناغە و گەشەی پێ بدرێ، بۆیە پرۆژەکان زیاتر عەلمانی بوود، واتە کوردایەتیەك بەناوەرۆکی لیبرالی، یان مارکسی، یان سۆشیالیستی...... هەتا تەقینەوەی رابونی ئیسلامی لە جهان لە دوای هەشتاکانی سەدەی رابووردوو ئیدی ئیسلامی سیاسیش بووە رەهەندێکی جهانی، لەوکاتیەوە ئەو پرۆژەیە سەری هەلدا: مانای ئەو پرۆژەیە ئەوەیە کە:

١ ـ چارەنووسی جولانەوەی کورد بەچارەنووسی رابونی ئیسلامی ببەستیەوە، ئەویش لە هەلوەشانەوەی ئاسەوار میراتی ئیمپریالیزم لە ناوچەکە کە کوردستان وجیهانی ئیسلامی پێ دابەش کردووە

٢ ـ ناوەرۆکی ئەو کوردایەتیە بە بنەماکانی شەریعەت پربکەیەوە، لە جیاتی بنەما عەلمانیەکان.

٣ ـ پەیوەندیەکی ئۆرگانیکی لە نێوان(رزگاری ـ نیشتمانی) و(رزگاری ـ کۆمەلاّیەتی) بە ئیسلامیانە دابرێژی، یاخود بەسادەتر پەیوەندی ئایدۆلۆجیا بە کوردایەتی(تێکەل کردنی سەنگەری ئاینی وکوردایەنی )

٤ ـ بەپێی شەریعەتی ئیسلامی خەباتی(جهاد) لە پێناو کوردستان رەوایی وەرگرێ

٥ ـ بتوانری لە رێی گوتاری سیاسی وشەرعی دۆست لەجهانی ئیسلامی بۆکێشە رەواکەی کوردستانی دروست بکا، سەرەڕای پەیدا کردنی دۆست لەسەر ئاستی جیهانی

٦ ـ لەکۆتایدا بتوانری فتوای شەرعی لەلایەن زانایانی ئاینی دەربکری لەسەرتا سەری جیهانی ئیسلامی بەتایبەتی لە خودی ولاّتە داگیرکەرەکان، تا ئێستا لە کوردستانیش فتوایەکی روون بۆ ئەو کێشە نیە

بۆ ئەوەی ووردتر دەست لەسەر رزگار کەر دابنێین پێویستمان بەوە هەیە لە توێژینەوە فکریەکە بپەرینەوە بۆ سیاسی لەپرۆژە فکریەکان بپەرینەوە بۆ بەرنامەی سیاسی و ئەو حزبانەی زادەی ئەو پرۆژە فکریانەن، ئەو پرۆژانەی لەسەروو باسمان کردن لە فەترەی

مەینەتی کورد دا دوو مدرسە بەرێژەی جیاجیا دەگرێتەوە کە دەشێ رزگاری کوردی لێ بەدی ببوایە یان بێت، یەکیان لەماوەی رابوردوو بەکار بوو ئێستا لاواز بوە (شیوعی)، ئەوەی تر ئەو کاتی لاواز بوو ئێستا لە گەشەدایە بریتین لە بزوتنەوە ئیسلامیەکان ،هەرچی مەدرەسەی لیبرالیزم ودنیای رۆژاوایە ئەوانە پێناس وبۆچوونیان لە بارەی شۆرش وبزوتنەوە رزگاریخوازەکان تەواو جیایە،زیاتر لە چوارچێوەی بەرژەوەندی(یان لە باشترین دۆخیدا)بەروانگەی یاسای دەولی سەیری ئەوبابەتانە دەکەن ،بەلام لەوسەردەمە ناکرێ ئەوانیش فەرامۆش بکەی ،چونکە بینیمان ئەوان بوون بوونە هۆی سەربەخۆیی کۆسۆڤا وئەو دۆخە یاساییەی بۆسنەو هرسك،هەروەها تارادەیەکی زۆر بۆ تەیمورو خوارووی سودان،ناشبێ واتێبگەین کە ئەوان تەنها یارمەتی مەسیحی دەدەن دژ بە ئیسلام ،ئەوەی بۆسنەو کۆسۆڤا پێچەوانەی ئەو تیۆرەیە،بۆیە لە توێژینەوەیەکی زیاتر پەیوەست باسیان دەکەین،ئیستا دەگەرێینەوە سەر هەردوو تەوەری ئیسلامی وشیوعی:

## یەکەم ـ بزوتنەوەی کوردایەتی و حزبە شیوعیەکان:

کریکاران نیشتیمانیان نیەو بەرژەوەندی ئەوان لەسەرووی هەمو بەرژەوەندیەکی ترە[٣٥٤]، بەوەش مانای شەرعیەت ستاندنەوەیە لە خەباتی رزگاری نەتەوەیی، لەهەمان کاتدا مارکس و ئەنجلس لێدوانیان هەبوو لەبارەی کێشەی ئێرلەندا، بەلام بە بەشێك لەکێشەی کرێکار و رمایەداری دەبەستەوە، لەسەر ئەو بنچینەیەش دروشمی (ئەی کرێکارانی جیهان یەکگرن)[٣٥٥] لەوبارەیەوە کەمتر کورد توانی سوود لەشیوعیەت وەرگرێت، جا هۆیەکەی بۆ لایەنی کورد دەگەرێتەوە یان بۆ شیوعیەکانی کورد یان بۆ لایەنی شیوعیەکانی جیهان، یان بۆ هەمویان، ئەوانەش بابەتن و درێژەی هەیە، بەهیواین توێژینەوەی لەسەربکرێ، یان ئەو پرسیارانەی سەروو بەشێوازێکی تر گوزارش دەکرێ بەبێ مەنهەج، ئێستا کاتی هاتووە مەنهەجیانە گە لالە بکرێت و لەگەڵ پرۆژەکانی رزگاریش (کە لەوەو پێشوو باسمان کرد) پێکی بەستینەوە، ئێستا پرسیارێکی زۆر دەکرێ لەلایەن

---

[٣٥٤] مارکس وانجلس بیان الحزب الشیوعی ص٦٣ لە سالی ١٨٩٣ دەرچوو

[٣٥٥] لە بنەرەتدا ئەو دروشمە لە دروشمی(ئەی موسولمانانی جهان یەکگرن)هاتوە کە لەجامیعەی ئیسلامی گرایەوەو لە بلاوکراوەی (عروە الوثقی)ی جمال الدینی ئەفغانی بلاو دەکایەوە

تەیارە جیاجیاکانی عەلمانیەتی کوردی و دەڵێن سەرکردەکانمان، میللەتی کورد، نەیتوانیوە وەك خەڵکی تر سوود لە ئیسلام وەرگری بۆ رزگاری؟ دوای کەمێك یەکسەر تاوانی بەدەوڵەت نەبونی کورد دەخەنە ئەستۆی زانایانی ئاینی و ساویلکەیی کورد و جاروباشە دەیخەنە ئەستۆی خودی ئاینی ئیسلام، ئەگەر بە مەنهەجیانە پرسیارەکە داریژینەوە جارێ لە پێشدا پرسیارەکە ئەوەیە ئەگەر کورد و ئیسلام سوودیان لەیەك وەرنەگرت ئەدی بۆچی سوود لەمدرسەی عەلمانی وەرنەگیراوە،سوودلەلیبرالی و دیموکراسی سیستەمی سەرمایەداری و سۆشیالیستی و شیوعیەت وەرنەگیراوە، بۆچی سوود لە رابونی نەتەوەیی وەرنەگیراوە ...، کەواتە ئەو پرسیارەی سەروو لۆژیکی نیە، باشتر وایە بۆ وە لامی پرسیارەکان ماوە مێژووییەکان وەرگرین، تەمەنی حوکمی ئیسلامی تا سەرەتای سەدەی ١٩ نزیکی ٢٠، تەمەنی مدرسەی علمانیەکانیش نزیکە ٢ سەدەیە لەناوچەکە و کوردستان (ئەگەر چاکسازیەکانی سەرەتای سەدەی١٩مدحت پاشا بکەینە سەرەتا)، تەمەنی لیبرالی دیموکراسی وسۆشیالیست نزیکەی سەدە و نیوێکە، تەمەنی مدرسەی نەتەوایە تیش سەدەیەکە، تەمەنی شیوعیەتیش ٩٢ سالە، کە ئێستا بەپێی ئەو مەنهەجە دزەکە دەگیرێ، هەر لایەك دەزانن کە باری سیاسی کورد تا سەرەتا ١٩ باش بوو سەرجەم خاوەنی ٦٤ دەوڵەت و میرنشین و قەوارەی سیاسی بوو، لەکاتێکا میللەتانی تر لەدوای ئەو بەرواره بونە دەوڵەت خاوەنی ئەو سەروەریە سیاسیە نەبووینە، کوردیش لەدوای سالانی ١٩٠٨ەوە مەینەتی و ژێر دەستی بۆ دروست بوو، پێشتر ژێر دەست و بەجێ ماو نەبووە، یان ووردتر بلێین ئەو کێشەو مەینەتیەی بۆی دروست بوو دەگەرێتەوە بۆ ماوەی نێوان ١٩٠٨ _ ١٩٢٤ ([٣٥٦])، کەواتە بەسانایی دەتوانین تاوانبار و بێ تاوان لەو پرسیارە دادگاییانە لێك بکەینەوە، کە بریتین لە ئیسلام و شیوعیەت، تاوانەکە دەکەوێتە ئەستۆی مەدرەسەکان لیبرالی و سۆشیالیستی و ناشیۆنالیزم یان بەکورتی عەلمانی جۆری رۆژ ئاوایی بەرپرسیارە لەو مەینەتیە و بەپلە یەك تەیاری ناشیۆنالیزمی

[٣٥٦] لەو ماوەیەدا: ئیقلابی ئیتحادیە تورانیەکان لە ١٩٠٨ ، لە ١٩٠٩ سولتان عبدالحمید لادرا ، لە ١٩١٤ جەنگی جیهانی یەکەم ، لە ١٩١٦ رێکەوتن نامەی سایکس بیکۆ ، لە ١٩١٧ بەڵێنی بلفۆر لە ١٩١٨ کۆتایی جەنگ ، لە ١٩١٧ شۆرشی شیوعیەت ، لە ١٩١٩ فرسای ، لە ١٩٢٠ سان ریمۆ ، لە ١٩٢١ دروست بوونی دەوڵەتی عێراق و تورکیا و سوریا ، لە ١٩٢٣ لوزان ، لە ١٩٢٤ هەڵوەشاندنەوەی یەکجاری خەلافەتی عوسمانی

ناوچەکە ( تورك و عەرەب )، ئینجا بەشێکی بەر خودی کورد و بەشێکیش بەر شیوعیەت دەکەوێ بەو شێوەیەی خوارەوە:

هەرخودی بنەماکانی شیوعیەت کە لە سەروو باسمان کرد زۆر هاندەری ئەو رەوتە نیە، بۆیە شیوعیەکان کوردستانیان بە نیشتمانی خۆیان نەزانیوە، بۆیە پاشگری ناوی حزبەکەیان عیراقی بوو نەك کوردستانی، تەنانەت لە نێو کۆمەڵەی رەنجدەرانیش ئەو ئارستەیە بەسەرۆکایەتی مەلابەختیارو عماد احمدو سەرکردەی تر سەری هەلداو عیراقیانەیان بەسەر کوردستان چەسپاند، لەدیوی کوردستانی ڕۆژهەلاتیش هەمان سیناریۆ دووبارە بۆوە، لەو ڕەوشە ئەو کوردانەی عەلمانیەتەکەی زۆر غەرب زادە بوایە ئەویش ئینتمای نیشتمانی لاواز دەبوو، وەك لەوگفت وگۆیەی لەگەل (دعبدالله جودت)لەوەلامی پرسیاریکا دەلێ:نیشتمانی من ئەو شوێنەی سودی بۆ من هەیە، هەر شوێنێك گریانی لێبێت ولاتمە[٣٥٧]، لە هەمان کاتدا ئەو کەسانەی بەرژەوەندی پەرست وچینە ڕێگرەکان وڕەوەندو بەدەویەکان(وەك ئیبن خەلدوون)دەلێت ئەوانە بێ نیشتمانن و لە کێ دزی وڕێگری لێبێت ئەو نیشتمانیەتی، سەرەڕای ئەوهەلوێستەیان بەرامبەر نیشتمان ئەو گرفتانەشیان لێ بەدی دەکرێت سەبارەت بەکورد:

١ ـ هەر خودی شۆرشی ئۆکتۆبەر ودوای ئەوانیش هەلوێستیان بەهۆی جۆراو جۆر خراپ بوو، زیاتر لەودش لینین وڕوسیا یارمەتیدەری پێك هێنانی دەوڵەتی کوردی وسەربەخۆیی نەبون پێیان وابووکوردهەلگری ئالای جامیعەی ئیسلامیە[٣٥٨]

٢- شیوعیەکان وخودی قەلای شیوعیەت (سۆڤیەت)ڕێکەوتنی لەگەل ئەتاتورك کردبۆ یارمەتێدان وبووە هۆی سەرکەوتنی کمالی و شکستی دۆست و لایەنگرانی کورد و شۆرشەکانی

٣- دوای دروست بونی دەوڵەتی عیراقی و تورکی شیوعیەت هاتە نێو ئەو دەوڵەتانە، زیاتر لە دەروازەی چینایەتی هات، هەرچەندە لە دوو رێگەش هات یەکەمیان، (لە ویلایەتی بەسرەو ناسریەلەڕێگەی بیتەرڤاسیلینی و هەریەکە لە یوسف سلمان(فهد)و عبدولحمید خەتیب لە سالانی ١٩٢٧ ـ

---

[٣٥٧] القومية الكردية ودعبداللة جودت -ماليمانس ص٨٧

[٣٥٨] دراسات فى الحركة الكوردية المعاصرة ص٢٥٦

۱۹۲۸جم وجۆلیان هەبووە، لەویلایەتی بەغداش لە ۱۹۲۹وە عاسم فلەیح کارا بووە[۳۵۹]، لەکوردستانیش بە جیا حزبی شیوعی هاتوە وئامانج وپێکهاتەکەی جیا بوە لەگەل بەغداو خواروو، دەبوایە دوودڵ نەبونایە لەدروست کردنی (ح ش کوردستان)بە جیا لەوەی عیراق، بۆیە چەند جار ناوەکەی ئالۆگۆری پێ کرا لە حزبی شیوعی کوردستانەوە بۆ حزبی شیوعی عیراق لەکۆتاییدالەدوای سا ڵانی ۱۹٦۷تەنها (لیژنەی ئیقلیمی کوردستان) دیاری کرا لەناو حزبی شیوعی عیراق و بەو شێوەیە عیراقیەکە زاڵ بوو بەسەر کوردستانیە، ئەوە سەرچاوەی دەردەکانی ترە

٤- ئەو هەنگاوە ترسناکەی خاڵی (۲) وای کرد شیوعیەکان بۆ پاساوی عیراقیانە کۆمەڵێك تۆمەتیش بدەنە پال بزوتنەوەی کوردایەتی وەك: فاشیەتی، رەگەز پەرستی، سەر بە ئیمپریالیزم و زایۆنی، بزوتنەوەیەکی دەرەبەگی عەشایەریە، دژ بەپرۆلیتاریایە، تا ئەو رادەیەی بارزانی تازە گەڕابۆوەلەسۆڤیەت مالی لەبەغدابوو، لەلایەن خوێندکارە شیوعیەکان لەسەر دەرگەی مالی بارزانی نوسیبویان خاوەنی ئەو مالە بە سەیارە ڕادەکێشرێ[۳٦۰]، لەوەش ترسناك ترلە۱۹۷۳\۷\۱۷ بەرەیەکی هاوبەشیان لەگەل حزبی بەعس کردەوەو تا سالی ۱۹۷۸ شان بەشانی حزبی بەعس چەکیان هەڵگرت لەدژی شۆرش بە سەرۆکایەتی بارزانی، کە ئەو کاتی کورد زۆر پێویستی بە هەلوێستی چاکی (ح ش ع)هەبوو، دوایش شۆرشی نوێشیان بەرەجعی و گومان لێکراو وەسف کرد[۳٦۱]،

---

العراق – حنا بطاطو ص٦٦- بۆیە جەند مێژوودکی جیای دروست بوونی (ح ش ع)باس دەکری، (الموسوعه السوفیتیه) لەج۱۸ ل٥٦، ۲۲۲، ۳۹۱دڵێ سالی ۱۹۳۲ دروست بووە نەك وەك باوە ۱۹۳٤

۳٦۰ ئەو زانیاریە لەو بەلگە نامەبریتانیە وەرگیراوە:

أحداث كركوك ۱۹٥۹التصور الاميركي والبريطاني سري

*السفارة البريطانية ـ بغداد*

۳۱/تموز ۱۹٥۹ ۱۰۱۲/۳۲۱/٥۹

إلى وزارة الخارجية / الدائرة الشرقية

"سأعرض لكم خرائط معدة من قبل اتحاد الطلبة موزعة بغداد إلى عدة مناطق حيث البيوت التي يتم سحل أبنائها مثلاً مكتوبة عليها: إن الرجال الموجودين في بيوت فلان وفلان يتم سحلهم. و بيوت مؤشرة عليها بعبارة "مشبوهة" ووجدنا في الخريطة مجموعة من البيوت في حي واحد مكتوب عليها "السحل" ومن ضمنها بيت كامل الجادرجي وبيت ملا مصطفى البارزاني في الكرخ. هل هذه الأعمال من النوع التي يجب ان تقوم بها اتحاد الطلبة؟

[۳٦۱] کێشەی هەرە گەورەی (ح ش ع) ئەوە بوو زوو زوو بزوتنەوەی کوردی بە رەجعی وەسف دەکرد کەچی حزبی بەعسی پێ پێشکەوتنخواز بوو، هەربەنمونە: بروانە ئەو نامەیەی عزیزمحمد سکرتێری حشع بۆ بارزانی ناردوە لە۲/کانونی یەکەمی/۱۹۷۳ چۆن ئەو وەسفەی بەعس دەکات.

ئەو ئەزمونە بە روون تر لە( ح ش تۆنس) یەکەم جار سەری هەلدا، لەبەر خاتری (ح ش فرنسا) شیوعی تۆنس دژی فرنسای ئیستعمار نەدەوەستا کە تۆنسی داگیر کردبوو

٥- پاساوی عیراقانەیان بەوە دەهێناوە گوایە میللەتی کورد مەرجەکانی (میللەت و ئومەت)ی تیانەسەزاوە بەپێی ئەو مەرجانەی (ستالین) دیاری کردبوو کە بریتی بوو لە: مێژوو و زمان و خاك و بەرژەوەندی هاوبەش، بۆیە هەندێ جار ئۆتۆنۆمیشیان پێ زیاد بوو، وەك گەلێ جار (صدام حسین)لەکاتی دەرچوونی یاسای ئۆتۆنۆمی بۆکوردستان لە١٩٧٤ دووبارەی دەکردەوە لەبەر چاوی (حشع) دەیوت سەرکردەیەکی شیوعی پێی ووتم: سیدي لماذا حکم الذاتي؟ واتە بۆچی حوکمی زاتی بە کورد دەدەی و پێویست نیە، کەچی کوردستان هەردەم پەناگەی شیوعیەکان بوو، تەنانەت لە بەلگەنامەیەکی ئەمریکی کە لەلایەن (پ کرۆك) نیردراوە لە ١٩٦٣/٢/٢٣هاتوە کە گفت وگۆ هەیە لە نێوان شۆرشی کوردو بەغدا، بەلام کێشەکە ئەوەیە سەرکردایەتی شۆرشی کورد بە (تاهیر یەحیان)ووتوە ئەوان بێ ئەوەی زیندانەکانی(حشع)یش وەك کوردەکان ئازاد نەکرێ دانوستانەکە دەوەستێنن[٣٦٢]

٦- بەشی هەرە زۆری حزبە شیوعی و وولاتی سۆشیالیستی هەلوێستیان بەرامبەر بە مەینەتی کورد لەدوای ١٩٧٢ هەتا کۆتایی هەر سەلبی بوو، زیاتر پالپشتی عیراق بون لەتاوانەکانی ئەنفال وکیمیایی و وێرانیش ...، لە ١٩٧٢/٤/٩ ڕێکەوتنامەیەکی ٢٠سالی عیراقی وسۆڤیەتی بەسترا، بە پێی مادەی (٢ و٨)ی ئەو ڕێکەوتنامەیە سۆڤیەت لە دژی شۆرشی کورد هاریکاری بەعسی کرد.

٧- لە ئەزموونی کۆماری کوردستانی (مهاباد) ستالین وسۆڤێت پشتیان لەکورد کرد و سەودایان لەسەر کرد کۆمارەکە تێك چوو

ئەوانە سلبیاتیەکانی حزبی شیوعی بوو، ئیجابیاتیەکانیشیان ئەوانەی خوارەوە بوو:

---

[٣٦٢] کوردو کوردستان لە بەلگە نهینیەکانی بریتانی ل٣٩٦

١ لەسەرەتای شۆرشی ئۆکتۆبەر١٩١٧جاڕی مافی چارەنووسی میللەتان درا، زۆر میللەت رزگاری بوولە پێش هەموان فنلەندا ئینجا ئاسیا و ئەفریقیا کەپێشتر ناومان هێنان

٢ خودی بنەمای شیوعیەت هاندانی میللەتانی تێدابوو بۆ شۆرش و راپەڕین و قایل نەبون بە چەوساندنەوەو ژێردەستی دژ بە داگیرکاری و خوێن خۆری و دژ بە جاشایەتی و عەشایەرگەری و... بون

٣. لەهەموی گرنگترقایل نەبون بەو نەخشەیەی ئیمپریالیزمی کە لەجیهان و لەرۆژهە لاتی ناوەراست بەپێی نەخشەکانی سایکس بیکۆ و بەلفۆر و لۆزان دایان رشتبوو، حزبە شیوعیەکان دژ بەو سنورە دەستکردانە بون، کرێکارانی سەرانسەری جیهانیان لا یەکسان بوو، بەو شێوەیە هاوپەیمانەتیەکی سەرتاسەری دژ بە شیوعیەکان هەبوو لەلایەك لەلایەکیش هاوپەیمانەتیەکی شیوعی هەبوو، بواری گرنگ بۆ کورد رەخسا، تا ستراتیژیەتی بەو گۆرانانە ببەستێتەوە، کە لە ئەنجامی هەلۆەشاندنەوەی ئەو سنورانە دەهاتەدی، لەسەردەمی شیوعیەت بەتایبەتی لەماوەی نێوان ١٩٧٦ _ ١٩٨١ راستەوخۆ هێزە هاوبەشەکانی سۆڤێتی –کوبی ـ المانی بەجیهاندا دەگەران و دەچوونە نێو دەولەتان، بەشێوەیەك کە سنور و سەروەری وولان ئەوەندە هێز و پیرۆزی نەمابوو، ئەوەش دەرفەتی زێرین بوو بۆ کورد کاری لەسەر بکار بۆ هەلۆەشاندنەوەی ئەو سنورانەی کە بەسەریدا داخراون وەك زیندانی

یەکێتی سۆفێت ووولاتانی سۆشیالیستی ناوەناوە یارمەتیدەری شۆرشی کورد بوونە بەتایبەتی لەنێوان ١٩٦٣ تا ١٩٧٠، یەکەم سکالای جینۆساید سۆڤیەت پێش کەشی نەتەوە یەکگرتوەکان کرد ـ (وثیقة رقم E/٣٨٠٩ ٩تموز ١٩٦٣ الجلسة ٣٦، المادة رقم١ في جدول الاعمال، سياسة حرب الابادة ضد الكرد من قبل الحكومة العراقية" طلب اضافة فقرة جديدة الى جدول الاعمال ـ رسالة رئيس بعثة الاتحاد السوفيتي الى الامم المتحدة )

٤. لەو سەرەوەش حزبی شیوعی عیراقی لەژێر دروشمی (الديمقراطية والتجديد) کۆنگرەی (٥)ی لەرێکەوتی ١٩٩٣/٦/٣٠بەست، ناوی خۆی گۆری بووە حزبی شیوعی کوردستان

سەرەنجام لەنێوان سەرکردایەتی بزوتنەوەی کوردستان و شیوعیە کوردەکان و حزبە شیوعیەکانی جیهان وناوچەکە سوود لە بزوتنەوەی شیوعیەت وەرنەگیرا، لەو بە هێزیەی شیوعیەکان کوردستان نەبوە بەشێك لە پرۆژەیان، کوردستان سودێکی وای لێ نەبینین، زەرەریش زۆر بوو، تاکورد ئیشی پێیان بوو ئامادە نەبون ئێستا باش بووینە بەڵام ئەو ئیشەی ئەوکاتیان پێ ناکرێ، بەو لاوازیەی زۆر زەحمەتە سودی وایان هەبێ تا رادەی رزگاری.

**دووەم ـ بزوتنەوەی کوردایەتی و لایەنە ئیسلامیەکان:**

بنەماکانای ئاینی ئیسلام جیهانی و ئاسۆییە، دوورە لە رەچەڵەك و رەگەز و فاکتەرە ستونیەکان، لەنێویدا جیاوازی لە نێوان: رەش و سپی، ئەوروپی و ئاسیایی، عەرەب و عەجەم، هەژار و دەوڵەمەند، نێر و مێ... نیە[٣٦٣]، ئەو بنەمایانە لەسەردەمێك پەیرەو دەکرا لەنێو عەرەب و جیهان بنەمای (انصر اخاك ظالما او مظلوما) هەبوو، بۆیە عەرەب و زۆردارانی ئەوسا زۆر بەتوندی بەگژ ئەو بنەمایانەی ئاینی ئیسلام دادەچوونەوە، لەدواییدا ئەو بنەما مرۆییانە سەرکەوتوو بوو، لەسەردەمی ئەمەوی (بەشە خراپەکەی ئەمەوی) جارێکی تر ئەو بنەما رەگەزپەرستیانە هاتنەوە کایەوە و مەدرەسەی (جعلناکم....)یان تەرت و وێران کرد، بنەما مرۆییەکانی ئاینی و سەرکردە و هەتا بنەماڵەی پێغەمبەریشیان ئەنفال کرد(جگە لەوانەی هەڵاتنو ئاوا بەجیهان پەرش وبلاوبوون)، زاراوە و چەمکی (موالی و شعوبی) و (علوج)ی لێ هاتەدی، ئەو دوو زاراوە رەگەزپەرستە وەك زاراوەکانی تری (بەربەری لەنێو رۆم )و(ئەسنی لەنێو مەسیحی) و(جویم و ئومەمی لەنێو یەهودی) و (شودراومەنبوز لەنێو هندۆسی) و(مۆر لەناو لاتینیەکان)...و(بێگانە لەنێو خێلەکیەکان) مانای دەدا، بەشێوەیەك ئەوەی لەرۆم نەبوایە پێیان دەوت بەربەر، ئەوەی یەهودی نەبوایە پێیان دەوت (جویم)، ئیتر جویم لەلای یەهودی هاوڵاتی پلە دوو بوو ژن و ژنخوازی لەگەڵ نەدەکرا... بەکورتی بە (مرۆڤی تەواو)

---

[٣٦٣] جعلناکم شعوبا و قبائلاً لتعارفوا ان اکرمکم عند الله اتقاکم.

هەژمارنەدەکرا، لەنێو ئەمەویش (غەیرە عەرەب)[٣٦٤] ئەو مامەڵەی لەگەڵ دەکرا، هەتا لەسەر ئاستی زانایانیش پرسی فەزلی عەرەب گەیشتەفتواومەزهەبیش، لە سونە فەزلی عەرەب[٣٦٥] بەسەر گەلانی ترو لە شیعەش فەزلی سەید بەسەرخەلکی تر،فەزلی عەرەب لەوروانگە فاشیەکەی فەزلی یەهود وفەزلی لاتین ورۆم وفەزلی فارس و..زۆرلەو جۆرەتیۆرە ڕەگەزپەرستیە دوور لە ئاین هاتۆتەکایەوەکەسەرەنجامەکەی تەوژمی نازیەتی ئەلمان وفاشیەتی ئیتالیاوشۆڤینیەتی فرنسی وڤالانژیسی ئیسپانی تۆرانی تورکی وزایۆنی یەهودی وبەعسیەتی عربی لێ پەیدابوو،فەزلی عەرەب دژە لەگەل قورئان وفەرمودە،لەکاتێکا لە ١١شوینی قورئان باسی (اعراب)ی کردوە.. تا دەگاتە (الأَعْرَاب أَشَدُّ كُفْراً وَنِفَاقاً وَأَجْدَرُ أَلاَّ يعْلَمُواْ حدودَ مَا أَنزَلَ اللّهُ عَلَى رسولِهِ وَاللّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ)[٣٦٦]،لە عەرەبیش باسی(..لعلكم تعقلون) ی کردوە،کەچی ئەو جۆرە مەزهەب وئیمام وزاناوموفتیانە بە پێچەوانەی ئەدەبیاتی قورئان لەیەك شوێن بە(ئەعراب) ناوزەدیان نەکردوون[٣٦٧]، بەلام نوسینەکانیان پڕە لە(اکراد واتراك واعاجم) ،تا ئەوڕادەیە قەدەغەی پێدانی ژنی عەرەب بە عەجەم(بە بیانۆی کەفائە) لە بەشێکی زۆری کتێبەکانی فقهی ئیسلامی بەدی دەکرێ، لە هەندێکیان دەبینرێ ئەو ژنانە تەلاقیان پێ داون کەدراونە عەجەمی وەك ئەودی خوارەوە چۆن ژنێکی عەرەبیان بە(بن سیرین)ی کورد تەلاق داوە[٣٦٨]، لە کتێبی(تأريخ التعريب الدينى ـ د عرفات ابى شوينكار )ناوی ئیمامان( شافیعی واحمد بن حنبل ومالیك بن انس و وابن تیمیە وسەعالبی وکرمانی و..زۆری تری تیایە[٣٦٩]، هەرچەندە ئەو زانایانەی ناویان براوە خزمەتی مەزنیان بە ئاین کردوە،

---

[٣٦٤] بە پێی ئیبن خەلدوون ئەمەویەکان زیاتر دەمارگیری و ڕەگەز پەرستی بەهای قورەیشیان هەبوو نەك عەرەبی وەك دەڵێت: بەمپێ ی ئەدەبیاتیان ئەوا قورەیش پێش ئیسلام جاهل نەبوونە تا ئاین چاکی کردبن، بەلکو پیاو وخاوەن شکۆمەند بوونە.

[٣٦٥] بڕوانە: شيخ الاسلام ابن تيميه-اقتضاء الصراط المستقيم ج١ص٤١٩

[٣٦٦] التوبة- ئایەتی ٩٧

[٣٦٧] بۆ ئەو مەبەستە بڕوانە:مقدمه ابن خلدون .

[٣٦٨] المعرفه والتاريخ - أبو يُوسُف يعقوب بن سُفيان الفسوى، المحقق: د أكرم ضياء العُمَري ج٢ ص٦٣.. حَدَّثَنَا سَعيد بن أسد ، حَدَّثَنَا ضمرة عن ابن شوذب قال: تزوج بن سيرين عربية وكره الموالي لما يدخلهم من السبي. قال: فذهب بن عون يتشبه به فلم يحمل له العرب ذلك ، فرفعوه إلى بلال بن أبي بردة بن أبي موسى الأشعري فضربه وفرق بينهما ، قال له: طلقها. قَال: هي طالق. قَال: ثلاثًا قَال: واحدة تبتها. قَال: أقول له ثلاثًا وهو يبتها. وقال له: طلقها. قَال: هي طالق ثلاثًا. قَال: واحدة. قَال: أقول له ثلاثًا وهو يفتيني بطلاقها.

[٣٦٩] بێجگە لەو کتێبەی ناوبراو لە زۆر کتێب وسەرچاوەی گرنگی ترم بینیوە بە ڕوونی دەری دەخا کە ئەهلی سونە وجەماعە پێیان وایە عەرەب فەزلی بەسەر عەجەم هەیە ، لە کتێبی(مسبوك الذهب فى فضل العرب- بە فەرموودە یاساغی هاوسەری نێوان عەرەب وعەجەم دەکا) هەروەها(المعرفه والتاريخ - أبو يُوسُف يعقوب بن سُفيان الفسوى)ئەو سەربردەی تەلاقەکە باس دەکا، شيخ الإسلام ابن تيمية - لة (اقتضاء

ئەزیەتیان بینیوە لەلایەن دەسەڵاتدارانی (بەناو خەلیفە) ،بەڵام توشی هەڵەش بووینە،وادیارە هەر زانایەکی ئاینی ئایەتە ڕاستەقینەکانی قورئانی پیرۆز و فەرموودەی جێ بەجێ بکردبایە و عەرەبی بەسەر عەجەم فەزل نەکردبایە ئەوە پێیان دەوت شعوبی، بەشێك لە فقهی مەزهەبەکان و ئاوا لێکجیاییان لەژێر گوشاری ئەوانە دارِشتراوە، بۆیە پڕە لەخڵت و خاری ئەوانە، تا ئەو ساتەش ئاسەواری ماوەو لەوکاتەی کورد خراوەتە ژێر دەستی عەرەب کاریگەری نیشتمانیشی زیاد کردوە.

هەرچەندە تەیاری عروبی هاوچەرخ لەبنەرەتا لەلایەن ڕۆژئاوا دروست کرا لەدژی عوسمانی بەڵام دوای بووبە ئایدۆلۆژیایەك رەگەکەی دەگەڕێتەوە سەردەمی ئەمەوی[370] و لەوێشەوە بۆ نەفامی پێش ئیسلام، ئەو شەپۆڵەش زۆر بەهێز و ردگ پتەوە، بۆیە عروبیەت کاریگەری لەسەر بزوتنەوەی ئیسلامیەکانی عرەبی هەیە بەهەرسێ تەیاری میانڕەو و توندەکانیش، زۆربەی سەلبیاتەکانی بزوتنەوە ئیسلامیەکان سەبارەت بە کێشەی کورد لەوە سەرچاوەوە دێت.

ئەوەی سەروو سەلبیاتەکانی موسلمانە نەك ئیسلام بۆ گشتیشە نەك تەنها بۆ کورد، لێرەوە دێینە سەر ئەوەی کە بنەماکانی ئاینی ئیسلام چەندە گونجاوە لەگەڵ پڕۆژەی رزگاری نیشتیمانی و دەوڵەت دروست کردن، چەندە هانی میللەت دەدا بۆ ڕاپەڕین لەدژی زۆرداری و داگیرکەران، ئەوەی روونە لە ئاینی ئیسلام ئەو بنەمایانە هەیە، مدرسەی

---

الصراط المستقيم ) ج١ص١٩، دڵێ : ( فإن الذي عليه أهل السنة والجماعة: اعتقاد أن جنس العرب أفضل من جنس العجم، عبرانيهم وسريانيهم، روميهم وفرسيهم وغيرهم) ، دەڵێن عەرەب عاقل ترن وکوردو عەجەم دەبێ لە خزمەتیان دابێ. یەکەم جار گومانی زۆرم لەوە هەبوو کەئەو عیبارانەی (فەزلی عەرەب بەسەر عەجەم) لەدوای نووسینەوەی مێژوو(لە سەدەی ١٩ و٢٠) لە سەر دەستی عەلمانی عروبی ئەو دەستکاریە کرابێ ، هەروەك چۆن کۆمەڵێك لەو فەرموودانە لە سەردەمی ئەمەوی دەستکاری کران، چونکە لەکتێبی (فقه اللغه وسر اللغه)لە ص٢٥ نوسخە ئەسلیەکە ئەو (فەزل)ەی تێدا نیە کەچی لە نوسخەکانی دوای تێیدایە، بەڵام دوای بینیم ئەو کێشەیە لە مێژوو هەبوە،تا ئەو ڕادەیە لەکتێبی ( العروبه بين الشعوبيه‌و والاستعمار)هاتوە خودی ئیسلام پێویستی بە ئەخلاقی عەرەب بوە !!، بۆیە کورد زۆر ڕەحمی بە عەرەب کردوە، زۆریش لە بنەماڵە کوردەکان بەو هۆیەوە خۆیان بردۆتەوە سەر رەچەڵەکی عەرەب ، لەوانە: بنەماڵەی شێخ عبیداللە دەڵێن ئیمە لە نەوەی خالیدین ، لە شیعرێکی شێخ ڕەزا روو لە عەرەب دەکاو دەڵێ ئێوە ئەفزەڵ ترن لە ئێمە، بەو شێوە زۆربەی میلەتانی لاواز لە شام وسەرووی ئەفریقا لە نێو عەرەب توانەوە وەك لەو بەلگەنامە بریتانیە دەردەکەوێ: ٢/١٦١ /٧٣٠ CO....ينطق الكرد باللغة الكردية التي تعود الى اللغات الارية ولا تربطها شيء بالعربية ذات الاصل السامي. بينما استطاع العرب ان يفرضوا لغتهم على الشعوب الغير العربية في سوريا ومصر ومناطق اخرى فلم يستطيعوا ذللك في كردستان حيث لا زال الكرد يتكلم بلغته الاصلية... ، بە کورتی دەبێ زانایانی پسپۆر لەو بارەیەوە بە جوانی روونی بکەنەوە (نەك داپۆشن) ئاخۆ ئەو پرسە چۆنە تا چیتر کوردو ئاینی ئیسلامیش لێی زەرەر مەند نەبێ.

[370] لە (بدایە و نهایە) باس لە بڕیارێکی جینۆساید دەکا لەسەردەمی ئەمەوی دەرچوە دژ بەکورد: وفيها استعمل الحجاج على فارس محمد بن القاسـم الثقفـي، وأمـره بقتـل الاكـراد.
بداية والنهاية ج١٦

لائیکی لەجیهانی ئیسلامی و لەکوردستان لەهەوڵ و تەقەلایەکی بێ ووچان دایە تا واپیشان بدا کە ئاینی ئیسلام هۆکاری دواکەوتن و بەدەوڵەت نەبونی کوردە، دەیەوێ بسەلمێنێ کە ئیسلام دژ بەخەباتی رزگاری و پرۆژەی نەتەوەیی و شۆرش و....، بۆ ئەو مەبەستەش هەوڵی داوە ئەگەر بەزۆریش بێت ئیسلام و سیاسەت لێك جیا بکاتەوە، ئیسلام وەك ئاینی تاکە کەس ([371]) و مردوو پۆلین بکا، دەیانەوێ بنەماکانی رێکەوتنامەی (پاپا و مۆسۆلینی _ سەرۆکی کۆماری ئیتالیای سەردەمی فاشی) سالی ١٩٢٩ پەیرەوبکەن، کە بەوشێوەیەی خوارەوەیە:

١ ـ مرۆڤ پێش لەدایك بون بۆ پاپا(ئاین) بێت تا لەدایك دەبێت.

٢ ـ لەدوای لە دایك بون بۆ مۆسۆلینی(دەوڵەت) بێت تا دەمرێت.

٣ ـ لەدوای مردن دەبێتەوە مولکی پاپا...

ئەگەر بەووردی سەرنج بدەینە جکومەت و دەسەڵاتە عەلمانیەکانی جهانی ئیسلامی وکوردیش دەیانەوێت هەمان رێکەوتنامەکە لەگەڵ مامۆستایانی ئاینی پەیرەو بکەن، بەشێوەیەك مرۆڤ کە لە رەحمی دایکیەتی ئەوا دوعای (قریب الفرج) بۆ مەلای ئاینیە و تەواو، دوای لەدایك بونی ئەو مرڤە تامردن دەکەوێتە باوەشی یاسا و حزبی سیاسی ودەسەلات... لە مردن نۆرەی مامۆستای ئاینی دێت یاسین وتەلقینی بدات، لەماتەمینیەکەی فاتیحە بخوێنی، لەسەر گۆری قورئان بخوێنی.... بەو شێوەیە رۆڵی ئاین لەسەر دونیا بێ کاردەبێ جگە لە ئومێدی دوارۆژ بەڵێن، ئەوکاتی بەتوومەت بەوئاینانە دەڵێن (افیون الشعوب) ([372])، ئەگەر هاتە مەیدانیش ئەوە بەتیرۆر و ئسولی و... تۆمەت باری دەکا، لەکۆتاییشدا دەڵێ ئەوەتا ئیسلام بۆ هەمو میللەتان باش بووە تەنها بۆ کورد خێری نەبووە !

وە لامی ئەوە دراوە بەلام تا ئێستا بەووردی وزانستیانە چارەسەری دیاردەی دەوڵەتی مۆدرێن نەکراوە کە لەجیهان باوی وەرگرتووە، چونکە لەدوای شکستی ئەزموونی سیاسی ئیسلام دروست بووە (واتە لەدوای روخانی خیلافەتی ئیسلامی عوسمانی)، ئەو دەوڵەتانە

---

[371] لەورووەوە رێبازێك لەناو زانایانی ئاینی سەری هەڵداوە دەڵێت ئاینی ئیسلام دەوڵەت و حوکم و سیاسەت نیە، یەکەم کتێب لەو بارەیەوە (الاسلام و اصول الحکم)ی شیخ علی عبدالرزاق ئێستا هەندێ تەیاری سەلەفی لاجماعی و زانایانی سەربەوەزارەتی ئەوقاف حکومەتە عەلمانیەکانیش هەمان بانگێشە دەکەن.

[372] مارکس ئەو ناوەی لەئاین ناوە.

لەسەر پایە و چەمك و مەبەستی عەلمانی درووست بووینە، دوور لەچەمەك و یاسایە کولەگە ئاینیەکان، لەسەر بنچینەی مافی چارەنووسی نەتەوەکان دروست بووە، ئاینی ئیسلام تەبا نیە لەگەڵ ئایدۆلۆژیای نەتەوایەتی و سەرەنجامەکانی[٢٧٣]، هەروەها پایەکانی دەوڵەتیش کە پێك هاتووە لە:

١ هەرێم (نیشتیمان) ٢ گەل (نەتەوە) ٣. دەسەلاّتی سیاسی (عەلمانی)... زۆر روونە ئاینی ئیسلام دان بەنیشتیمانی نەتەوە و دەسەلاّتی سیاسی عەلمانی نانێ، بۆیە لەگەڵ تەواوی واقعی جیهانی نوێ کێشەی هەیە، کێشەی ئیسلامی و زانایانی ئاین و بزوتنەوەی ئیسلامیەکان لێرەوە دێت، لەو سەردەمە خۆیان ئیش و کاریان لەجیهانێکە ناتەبایە لەگەڵ ئاین، گەلێ جار ئەوانە لەهەمو ئەو واقیعەی جیهانی بێ دەنگ دەبن وروو لە میللەتێکی کوردی لێ قەوماو دەکەن و ئاین پەروەریەك بەسەر ئەوان پیادە دەکەن وکوردایەتی و پرۆژەی رزگاریان لێ قەدەغە دەکەن، ئەوەش سەرچاوەی کۆمەڵێك سەلبیاتی ترە..

بەوجۆرە لە پێشدا دێینە سەر سەلبیاتەکانی ئیسلامی و زانایانی ئایینی و بزوتنەوە ئیسلامیەکان ئینجا دێینە سەر پرسیارەکانی تری ئیجابی وچۆن ئایینی ئیسلام دەبێتە ماکینەی پرۆژەی رزگاری نیشتمانی؟ یاخود بەجۆرێکی تر، ئایا شەریعەتی ئیسلامی رێ بە کورد دەدات لەپێناوی دەوڵەتێکی سەربەخۆ کاربکەن؟

سەلبیاتەکانیان سەبارەت بە دۆزی کورد:

١ ئەوەی زۆر زەقە ئەوەیە وەك پێویست ئەو لایەنانە بەهانای میللەتی کورد نەهاتوون، هەر چەندە خۆیان بەشدار نەبووینە لەوتاوانانە، زیاتر حزبێکی عەلمانی وەك بەعس و دامو دەزگای سیاسی تری عەرەبی شۆڤێنی پالپشتیان کردوون، بەلاّم لەچاو دادگەری ئیسلام هەلوێستی بزوتنەوە ئیسلامی وزانایانی ئاینی (بەتایبەتی عەرەب) لاواز بوو.

[٢٧٣] لێرەدا بابەتێکی گرنگ قووت دەبێتەوە، کە دەگوترێ ئاین لەگەڵ ئایدۆلۆژیای نەتەوەیی تێك ناکەنەوە یەکسەر تاکی کوردەواری وای دێتە پێش چاو ئاین رێگر بێت لە مافی چارەنووی کورد، لەراستیدا وانیە بەڵکو رێگر بووە لە داگیر و دابەشکردنی کوردستان لەسەر بنچینەی نەتەرایەتی، رێگر بووە لەچەوساندنەوەی نەتەوەیی میلەتێك بەسەر میلەتێکی تر، کە کورد دووچاری بووە، بەلاّم جیهان دابەش بووە بۆ تیژی نەتەوەیی ئەو نەهاتووە رێگری لەکورد بکات بە تەنها بڵی تۆش نەیکەی، لە ڕاستیدا هەندێ لە ئاینیە دۆستەکان بەتێنەگەیشتن وهەندێك پیاوی ئاینی ناحەزو تێکەیشتیش ئەوەی قۆزتیتەوە دژ بەکورد.

٢  بەشی هەرەزۆری زانایان و بانگخواز و کەسایەتیە ئیسلامیەکانی عەرەب بەهۆی ئینتمای عروبیان لایەنگری کێشەی فلستینن، لایەنگری کێشە عەرەبیەکانن، شەرعیەتی هەبێ یان نەبێ، لایەنگری دروست بون وپاراستنی دەوڵەتی عەرەبین، بەناوی پاراستنی یەکێتی خاکی عیراق... کەچی ئەو سنورانەش ئیمپریالیزم دروستی کردووە، ئەوانە بەدوو تەرازوو (بانێك دووهەوا) لەبارەی دۆزی کورد دەدوێن، کاتێ دێنە سەر پارچەپارچەبونی وولاتی عەرەبی دەڵێن ئەو سنورانە ئیمپریالیزم و زایۆنیزم دروستی کردووە دەبێ لابەرێ، کاتێ دێنە سەر کێشەی کورد دەڵێن نابێ یەکێتی خاکی عیراق تێك بدرێ، واتە سنورەکە بپارێزرێ...! لەلایەکی تر ئەو بەشە ئیسلامیە باوەڕیان بەو مافە چارەنوسە نیە کەلە ئاین وياسا نێو دەولەتی وبڕیارەکان وڕێکەوتنەکان هاتوە(بە تایبەتی مادەی ١ی میساقی نەتەوەیەککگرتوەکان)بە بیانۆی ئەوەی با چیتر وولاتی ئیسلامی پارچە پارچە نەبێ،لەکاتیکا کوردستانیش وولاتێکی ئیسلامیەو پارچە پارچەو ژێر دەستەش بوە

٣. دەبوایە هەڵوێستی بزوتنەوەی ئیسلامیەکان ئەوەندە بەهێز بوایە کورد پێویستی بەوە نەبوایە ڕوو لە ئەوروپا و جیهانی تر بکات...چ لەوە تاڵ تر هەیە کە لە بەڵگەنامەی ئەمریکی (دۆسیەی پەیوەندی دەرەوە ج E٤ ١٩٦٩ ـ ١٩٧٢/٧/٥دەڵێ یەکەم جار کریسمیس دانی بە ئۆتۆنۆمی بۆ کورد هێنا کەچی نمونەیەکی وا لە نێو دەزگایەکی ئیسلامی سەردەم نادۆزیەوە)، تاو ئەوساتەش لەنێو ئەدەبیاتی بزوتنەوەی ئیسلامیە عەرەبەکان کەمتر باس لە شێخ سعید وشێخ محمود و قازی و ملامستەفا دەکرێ، کەمتر باس لەوچاکەیەی بارزانی دەکرێ کە لە گەرمەی جەنگی حوزیرانی١٩٦٧ شەری نێوان عەرەب و ئیسرائیل... شەڕی یەك لایەنە راگرت بۆ ئەوەی سوپای عیراق بچێت رۆڵی خۆی لەو جەنگە ببینی*، یان وەکو زاناو سەرکردەیەکی ئاینی یەکەم سەرکردەی شۆرش بوو بانگیشە پیادەکردنی شەریعەتی ئیسلامی بکات.

---

* گەلێ جار باس لەوە دەکرێ کە مەلا مستەفا بە جۆرێك پەیوەندی هەبووبێ لەگەل ئیسرائیل...هەلبەتە ئیسرائیلو وولاتانی عەرەب پەیوەندیان هەیەو وولاتانی عربی وجامعەکەشیان رۆلی هەبوە لەدروست بوونی ئیسرائیل ، رەنگە مەلا مستەفا لەرێی کەنالی جیا جیا لەگەل خەلکی یەهودی دەسەلاتداری رۆژئاوا یان هەتا ئیسرائیلیش دانیشتبێ ، بەلام ئەوەی گرنگە هەر پەیوەندیەك هەبوبێت بۆ کاتی تەنگانە بوە، نێ چ کاتەك بۆ ئیسرائیل لە جەنگی سالی ١٩٦٧ تەنگاوترنەبوە ، لەبەلگەنامەی ئەمریکی-تیلیگرام:١٨٣ لەبەغدا بۆ وەزارەتی دەرەوە ١٩٦٦/٨/١٩ دەلێت وەفدێکی ئیسرائیلی سەردانی بارزانی کردوە بۆ ئەوەی لەکاتی شەر هەلگیرسان پێش مەرگەکان بتوانن چالاکی دژ بە عیراق بکەن تا نەتوانن بەشداری شەری ئیسرائیل بکەن ، کەچی ئەوەی بینیمان ئەوەبوو مەلا مستەفا لەگەرمەی شەری ئیسرائیل وعەرەب

٤. له پرۆژەكانی چاكسازی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست وراپۆرتە سیاسی وپەیرەو پرۆگرامیان بە ڕوونی باس لە مافی كورد ناكرێت لەگەڵ ئەو زوڵمە گەورەیەی لێیكراوە، هەروا بە چاوی موالی وكەمایەتیەكی پەككەوتە تەماشای كورد دەكەن ولەكاتی لێقەومان دەڵێن (خطیة كورد..)

٥. زۆر بە زەحمەت ناوی كوردستان دەبەن، هەندێكیشیان لەوانە(هیئة العلماء السنة ـ بەسەركردایەتی حارس زاری) دەڵێن ما یسمی اقلیم كوردستان

٦- تا ئەمریكا كوردی بە یەتیمی نێو دەوڵەتی وەسف كرد لە ١٩٧٩ەوە، لەراپۆرتێك بۆ كۆنگرێسی ئەمریكی لە ١٩٧٩/١١/٢٩ لە ژێر سەردێری (كوردی هەتیوی نێو دەوڵەتی)، ئینجا ئیسلامیەكانیش لە ١٩٩١هاتنە سەر ئەو وەسفەوئەو كتێبەی دفهمی شناوی كە لە ١٩٩١ دەرچوە بەناوی (الاكراد یتامی المسلمین)

٧- لەناو كوردستانیش بزوتنەوە ئیسلامیەكان بەدرەنگەوە ڕوویان لە ئەركی نیشتمانی وكوردستانیان كرد، دوایش هەلوێستیان لێڵە بەرامبەر چارەنوسی كوردستان وتا ڕادەیەكی زۆر هێشتاهەلوێستەكانیان لە ژێر كاریگەری ئیسلامیە عروبیەكان دادەڕێژرێ، بۆیە گەلێ جار هەلوێستیان وەرگرتوە بۆ خۆیان ومیلەتەكەو خودی تاینیش قازانجی لێ نەكردوە، هەر بە نمونە: بزوتنەوەی ئیسلامیەكانی كوردستان لە دەورو بەری داگیری عیراق زانیاری بە چەواشەیان لە ئیسلامیە عروبیەكان وەرگرتبوو گوایە ئەمریكا دێت یەكەم گورز لە ئیسلامیەكان دەدات، بوە هۆی ئەوەی دژ بە هاتنی ئەمریكا بۆ عیراق سەنگەر بگرن و هەندێكیشیان پەیوەندیش پەیدا بكەن لەگەڵ ئەو دڕندە بەعسە، كەچی لە بەڵگەنامەی ئەمریكی(بڕیاری ژ:١٣ ـ ٩٩ی سەرۆك لە٤/٢/١٩٩٩بزوتنەوەی ئیسلامی لە سێیەمین حزبەكاریگەریەكانی(٧حزبەكە: ویفاق ـ موئتەمەر ـ

---

یەكلایەنی شەڕی ڕاگرت ودارای لە سوپای عێراقی كرد بچێت ئەركی ئیسلامی خۆی ببینی وبچێتە یارمەتی عەرەب، ئەوەی جێی سەرنجەلەو كاتەی كە عەرەب دەڵێن سەر بە ئیسرائیلە وەك برختان لەلای رۆژئاواش برختانی شیوعیایەتی ونزیك لە سۆڤیەت دەدرا پاڵ مەلا مستەفا ، لە بەلگەنامەیەكی بریتانی ژ:١٠١١٤/٢٢٩/٦٣ لە بالوێزخانەی بەریتانیاوە بۆ وەزارەتی دەرەوە لە سالی ١٩٦٣باس لەوە دەكا كە وەزیری دەرەوەی ئەمریكا(مستەر دالاس) پێی وایە بارزانی دالدەدەری شیوعیەو نزیكە لە سۆڤیەت ، تەنانەت لە هەندێ سەرچاوەی ڕۆژئاوای بارزانیان بە (مەلای سوور-Red mulla) سەیرانە: د كمال مزهر (كوردو كوردستان لە بەلگەنامەی بەریتانی ل٣٧٢-٣٧٤ )

بزوتنەوە ـ پارتی ـ ملکی ـ یەکێتی ـ مجلس ئەعلا) نێو عێراق پۆلین کرابوو،ئەمریکا دەیویست ئەوانیش بەشداری پێ بکا، کەچی هەلخەلەتێنرا دوای ئیسلامیە عروبیەکانیش بە هاناشیان نەهاتن زیاتر لەوەش ناوو ناتۆرەی ترسناکیان دەدانە پالیان.

ئیجابیاتەکانیان:

یەکەم ـ ئەو ماوە دوور و درێژەی دسەلاتی سیاسی کورد و ئەیوبی و... کە لەدوای فەتحی ئیسلامی باس کرا خەزێنەی ئیجابیاتە هەر تەواونابێت.

دوەم ـ هەروەها هەلوێستەکانی و بەراوردی نێوان ئەستەمبۆل و ئەنقەرە کە لەوەپێش کرا...ئەویش ئیجابیاتی لە بن نەهاتوە.

سێیەم ـ لەسەردەمی نوێش: لەگەلْ پشکنینی وورد بەدوای ئەو دەست و لایەنانەی بەدوور و نزیك بەرپرسن لەمەینەتی کورد نەلایەنێکی ئیسلامی نەزانایەکی ئاینی ونەفتوایەکی لایەنگری بەئاست دەبینیەوە.

چوارەم ـ تا سالّی ١٩٨٠ بەدواوە کەمتر نرخ بۆ ئەو هەلّوێستانە هەژمارکراوە، چونکە زانای ئاینی و بزوتنەوە ئیسلامیەکان ئەو سەنگەیان نەبووە یان هەر بونیان نەبووە تا هەلّوێستیان بە ئیجابی و سەلبی هەلّسەنگێنین، لەدوای ئەو بەروارەی سەرووش بەتایبەتی لەکارو ساتە مەزنەکانی ئەنفال و کیمیایی ئەو هەلّوێستە جوامێرانەی خوارەوە لەنارەزایی تۆمار دەکەین لەلایەن بزوتنەوە ئیسلامیەکان:

١ ـ ئەو رۆلەی ئیران بینی لەو کات کەلەلایەن هەمو لایەکەوە باس کراوە، خمینی فتوای شەهادەتی بۆ ئەنفالەکان دا.

٢ ـ راشید غەنوشی سەرۆکی بزوتنەوەی نەهزەی تۆنس

٣ ـ مستەفا مەشهور رابەری ئیخوانی جهان.

٤ ـ دحسن ترابی خۆی هاوسەری سەرۆکی حزبی کۆنگرە.

٥ ـ نوسەرە ناودارەکانی وەك فەهمی هوەیدی ودفهمی شناوی، ئەوەی دوای ووتبووی: جێی سەرسورمانە عەرەب دان بە دەولّەتی ئیسرائیل دەنێن بەلاّم دان بەدەولّەتی کوردی نانێن.

٦ ـ هەریەکەلە مەحفوز نەحناح وعبدالله جاب الله سەرۆکی ئیخوانی جزائیر.

٧ ـ شیخ حافز سەلامەی سەرۆکی کۆمەڵەی هیدایەی میسر.

٨ ـ عبدالعزیز بن باز موفتی سعودیە — داوای زەکات کۆکردنەوەی بۆکردن.

٩ ـ نجم الدین ئەربەکانی سەرۆکی حزبی رەفاهی تورکیا.

١٠ ـ قازی حسینی سەرۆکی کۆمەڵەی ئیسلامی پاکستان.

١١ ـ زەینەب غەزالی پارچە پەخشانێکیشی هەیە بەسەر ئەو زولمەی لەکورد کراوە لەسەر دەستی عەرەبی شۆڤینی.

١٢ ـ هەریەکە لە ئەحمەد شا مسعود ورەبانی وحکمتیاری سەرکردەی ئیسلامیانی ئەفغان.

١٣ ـ حزباللەی لبنان وبزوتنەوەی جیهادی فلستین ود سعید رمزان بوتی موفتی سوریا.ود یوسف قەرزاوی سەرۆکی زانایانی جهان.ومحمد حسین فەزلولله، شیخ عمر عبدالرحمن، زۆر لای تر[٣٧٤]

١٤ ـ لەناو عیراقیش هەریەکە لە مجلس ئەعلا وحزبی دەعوەو زانایانی تریان ...وزۆری تر دەنگی دژ بە زولم لەکوردیان بەرز کردەوە.

کەواتە ئێستا دەروازەی رزگاری لەکام فەزا دێت؟

## دەربازێکی بەهێزونامرازێکی لاواز

بۆمان دەرکەوت لەچوارچێوەی بنەماکانی سایکس بیکۆ و عەلمانیەت رزگاری کوردی لێ بەدی ناکرێ، زیاتر لەمەدرەسە مەبادیەکان بەدی کرا، ئەویش دوان بون، مدرسەی شیوعیەت کە ئێستا لاواز بووە، کەواتە ئەوەی ماوە مدرسەی ئاینیە، کە هەڵوەستەی لەسەر دەکەین بزانین چۆن و بۆچی دەروازەن بۆ رزگاری کورد؟ وە ئایا هیچ رێگەی تر نیە؟ بەتایبەتی گۆرانە ناکاوەکان؟

مەبەست لە دەروازە ئەوەیە کە بەسروشتی خۆی ناوەرۆکی بزوتنەوەی کوردایەتی بەلای کەمی لەو قۆناغەدا رێك دەکەوێ لەگەڵ ئامانجەکانی بزوتنەوە ئاینیەکان، ئیتر ئەوە

[٣٧٤] ئەو زانیاریانە لە: ١-هەلویستی ئیسلامیەکانی جیهان لەمەر کورد ومەرگەساتەکانی –م راگەیاندنی یەککرتوو( ژ:١٠) ، ٢ - جمال نەبەز –نیستەو پاشەرۆژی نەتەوەی کورد وەرگیراوە.

مانای ئەوە نیە ئەو بزووتنەوانە لەکورد کوردتر بن، یان حسابی وایان بۆ بکریٰ، ئەوە باسی ستراتیجیەت و نەخشە و پلانی قوول و زانستیە، مانای باس کردنی هەڵوێستێکی چاکی ئیسلامی لێرەو یەکی خراپ لە شوێنێکی تر نیە، رێکلام و سەلماندنیش نیە، بەڵکو رەوتی توێژینەوەکە وای ئاشکرا دەکا کە چۆن عەلمانی لە (مەینەتی کورد) بەرپرسیارە ئاواش لەبەردەوامیەکەی. کەواتە دەروازەی رزگاریش لەویٰ نیە، بۆیە دەبیٰ بەدوای بەدیل بگەرێین و ئەوانەمان دۆزیەوە، ئێستاش بارودۆخی سیاسی ئێستای کوردستان شی دەکەینەوە زیاتر ئەو ئەلقەی نێوان رابووردوو و داهاتووی ئەو دەروازەمان بۆ یەکلا دەکاتەوە.

**بارودۆخی سیاسی ئێستای کورد لەبەرهەمی کیٰ یە؟**

مەبەست لەوەیە ئێستا بارو دۆخی کورد گەیشتۆتە ئاستێك لە ٩٠سالی رابووردووغونەی نەبوە ..بزانین ئەوە چیەو لە کیٰ هاتوە؟ نامانەویٰ وە لاٰمێکی عاتفیانەمان دەست کەویٰ و بڵێین ئەوە بەرهەمی خوێنی شەهید و ئارەقەی پێشمەرگە و فرمێسکی منداڵە کوردە، ڕاستە ئەوە فاکتەری بنچینەبوە، بەلاٰم فاکتەری سەربار ئاشکراو دیارە، چونکە پێشوتر بەهەمان خوێن و ئارەقە و فرمێسك تەنها دەگەیشتنە ئاستی سەقفێك و نوشستی بەکورد دەهات، ئەو جارە (لەو سەقفە تێپەریووە)، بابزانین لەنێوان ئەو کۆمەڵە گۆرانکاری و هۆکارانەی کاریگەریان لەسەر ناوچەکە هەیە کەبریتین لە: ١ جەنگەکانی ناوچەکە ٢ هاتنی ئەمریکا ٣. شۆرشی ئیران ١٩٧٩ و بزوتنەوە ئیسلامیەکان ٤. لەناو عیراقیش ئەو هێزانەی خواروو هەن بزانین کامیان کاریگەر بووە لەسەر دروست بونی مادەی ١٤٠، رێژەی ١٧٪ی داهات، بونی سەرۆك کۆماری کورد، بەفەرمی ناسینی حکومەتی هەریم و فیدرالیەت.... ئینجا لەناو عیراقیش بزانین کام لەو هێزانەن کاریگەری ئیجابی وکامیشیان سەلبی هەبوە ئەو هێزانەش بریتین لە:

هێزە ئیسلامیەکان مجلس الاعلی و دعوە و ئیسلامی، هێزە عەلمانیەکان لیستی ئەلعراقیە و حزبی شیوعی، هێزە عروبیەکان لیستی حەدبا (نجێفی)، دیالۆك (صالح موتلەگ)، تجمعی عەرەب، هێزە نیشتیمانیە عیراقیەکان: تەیاری سەدری، هەیئەی عولەمای سوننە، تەیاری چاکسازی، بەوشێوەیە هێزە کاریگەریەکان شی دەکەینەوە

بەسانایی ئەو تیۆرو بۆچوونە ساغ دەبێتەوە کە ئاخۆ کێ لەخزمەتی ئەو بارو دۆخە سیاسیەی ئێستای کوردە.

یەکەم لە نێو ئێران: لەپێش شۆرشی ئێرانی ١٩٧٩ئەو شۆرشە چواردەوری کوردستان بەکۆمەڵێك دوژمنی سەرسەخت درابوو، بەپێی ڕێکەوتنە ئیقلیمی و جیهانیەکان هاریکاریان هەبوو لەدژی بزوتنەوەی کورد، هەر لەپەیماننامەی سعد ئابادی ١٩٣٧، ..جزائیر١٩٧٥، لە ساڵی ١٩٨٣ تورکیا و عێراق ڕێکەوتن هەریەکە بۆی هەبێت ٢٠کم بچێتە ناو خاکی یەکتر*

هەرشۆرشێکی کورد (بەتایبەتی لەباشووری کوردستان) سەری هەلدەدا تا سەقفێك گەشەی دەکرد و بەهۆی (وفاق اقلیمی) و ڕێکەوتنێك تێك دەرووخا، لەبەر هۆیەکی زۆر سادە، چونکە بەرژەوەندی وولاَتی داگیرکەر بۆمانەوەب کوردستان لەژێر دەستیان بالاتر بوو لەهەر کێشەیەکی تری ناوخۆ، بەو شێوەیە ئەزموونی شۆرشەکانی کورد لە ١٩٢٥ ەوە تا ١٩٧٩ بەو ئەزمونە تێدەپەڕی وئەوەش فاکتەری بە ئالۆزبونی کێشەی کورد بوە.

سروشت و بنەماکانی ئەو شۆرشە: ئەو شۆرشە نە نەتەوەیی بوو نە نیشتیمانی، بەڵکو شۆرشێکی ئاینی ئیسلامی بوو، زۆر بەخێرایی سروشت و ڕەهەندە ئیقلیمی و جیهانیەکەی دەرکەوت، زاراوەی (شۆرش ناردن _ تصدیر الپورە)ی لەگەڵ ب لاَو بۆوە، پشێویەکی بێ هاوتای خستە نێو وولاَتی دیکتاتۆر و داگیرکەرانی ناوچەکە، بووە هۆی سەرهەڵدانی بزوتنەوە ئیسلامیە شۆرشگێرەکان لەناوچەکە، هەرچەندە وولاَتی عەرەبی و ئیسرائیل و ڕۆژئاوا توانیان بەهۆی جەنگی عیراقی _ ئێرانی لە ١٩٨٠ _ ١٩٨٨ تا رادەیەك بەری لێبگرن، ئەوەی پەیوەستە بە ستراتیژیەتی کورد لەوشۆرشە و سەرنجامەکەی ئەوەیە:

١. باوەڕو کارنامەی ئێران وبزوتنەوە ئیسلامیەکان بەو سنورە دەستکردانەی ناوچەکە نیە.

٢. ئەو (وفاق اقلیم)یە و سێ کوچکە خنکێنەرەی سەر کوردیان تێك وپێك شکاند و هەمو ئەو ڕێکەوتنانە کۆنە لە (سعد ئاباد) و (سەنتۆ)و(بەغدا).... تا (جزائری ١٩٧٥)

* ئەو جۆرە ڕێکەوتنە یەکەم جار لە نێوان کوردونەرمەن کرا، لە مادەی (٢)ی ڕێکەوتنی پارتی شۆرشگێری نەرمەن (تاشناق) لەگەل کۆمەلەی سەربەخۆی کورد (خۆیبوون)لە ٢٩\١٠\١٩٢٧ مۆر کرا، لە ١٩ مادە پێك هاتبوو.

یان هەڵوەشاندەوە، دەوڵەتێك دروست بوو لەناوچەكە، فاكتەری تێكدانی ئەو(سەقفە هاریكاری)ەی دژ بەكورد بوو.

٣. لەگەڵ (وفاق الدولی)یش ناتەبایە.

٤. تارادەیەك كۆتایان بەوە هێنا كە: تەنهادەوڵەت بناسرێ نەك میللەت، پیرۆزی سنور، پیرۆزی ڕێكەوتنامە و رییسا دوەلیەكان... هتد، ئیتر كۆمەڵێك گۆرانكاری زۆر مەزنی لەناوچەكە هێنادی، خۆی لەخۆیدا بووە تەكانێكی وا گەورە بەشۆرشی كوردستانی نەدەكرا، تائەو ساتەش تەوژمەكەی خەفە نەبوویتەوە، ئەوە مانای ئەوە نیە ئامانجی ئەو شۆرشە رزگاری كوردستان بێت، یاخود سەركردەكانی ئەو شۆرشە (كوردستانی تر) بن لەكورد، نەخێر، ئەوە مەبەست نیە، مەبەستمان سروشتی شۆرشەكە و بزوتنەوە ئیسلامیەكان وایە كە زیاتر میللەتانی بێ كەس وبن دەست لێ ی سوودمەند دەبن، بەپێچەوانەی وولاتی عەلمانی شۆفینی ناوچەكە و سیستەمی ڕۆژ ئاوا بۆ ناوچەكە كەبریتیە لە:

أ. بنەمای (عدم المس بالأرث الأستعماري) + بنەماكانی ئایزنهاور.

ب. ناسینی دەوڵەت وەك نوێنەری میللەتان.

ت. ئارامی وپابەند بون بە ڕێكەوتنامە نێو دەوڵەتیەكان...

هەڵبەتە لەو بنەمایانەماڵی كورد و میللەتانی ژێر دەستە ویران دەبێ، چونكە: نەكورد دەوڵەتی هەیە و نە ئارامی و تەبایی ناوچەكەش لەبەرژەوەندی ئەوە، هەر میراتی ئیستعماریشە كوردستانی وادابەش كردووە، بەپێچەوانەوە هەمو بنەماكانی پرۆژەی ئیسلامی (كەلەسەروو باسكرا) لەقازانجی ستراتیژیەتی كوردە.

بەرهەمە ڕاستەوخۆكانی ئیسلامی بۆ كورد: ئەوەی سەروو باسمان كرد بنەمای گشتی وئیجابیاتی گشتیە بۆ میللەتانی ژێر دەستەی وەك فەلستین و كوردو خوارووی لبنان و.... زۆر شوێنی تر، ڕاستەوخۆتر شۆرشی ئێران و سەرهەڵدانی بزوتنەوە ئیسلامیەكان بووە هۆی ئەوەی:

١ ئەو هاریكاریە ئیقلیمی و نێودەوڵەتیەی دژ بەكورد درزی گەورەی تێبكەوێ.

٢. شۆرش و بزوتنەوەكانی كورد تەكانی مەزنی پێدرا تا ئەو ساتەش بەردەوامە.

٣. یەکەم هەنگاوی ڕاستەوخۆ ئەوەبوو (أخیمنی) لەوە لاّمی کۆمەڵێك بروسکە بەبۆنەی یادی سەرکەوتنی شۆرش لەلایەن (احمد حسن البکر، ملا مستەفا، جلال تالەبانی، مسعود بارزانی، ئیدریس بارزانی، محمد باقر الصدر، لەچوارچێوەی عیراق) تەنها وە لاّمی بروسکی ملا مستەفا و محمد باقر الصدری داوە بەئیجابی، وە لاّمی بروسکەکەی (احمد حسن البکر _ کۆماری عیراق) بە (السلام علی من اتبع الهدی) دایەوە، لەبروسکەکەی بۆ بارزانی داواشی لیّ کرد بگەرێتەوە ئیران، چونکە لەوکاتی بارزانی و خانەوادەی لە ئەمریکا بون لەدوای شکستی شۆرشی ١٩٧٥ بەدەستی ئیرانی شا و ئەمریکا، بەلاّم بارزانی پیّ رانەگەیشت بگەرێتەوە وەفاتی کرد، هەربۆیەش مسعود بارزانی لە ١٩٧٩\٣\٣ لەکاتی بە خاك سپاردنی بارزانی لەشنۆ ووتی: بارزانی نەمرد بەڵکو سیای ئەمریکی و ساواکی ئیران بەدەرمان خۆر شەهیدیان کرد، ...بەشێك لەسەرکردە کوردەکان هەرچوار پارچە(زیاتر عەلمانیە توندەکان) بەو هەنگاوەی خومەینی دەرهەق بەبارزانی خۆشحال نەبون، لەوکاتیەوە وەسفی سیستەمی نویّ ی ئیران بە رەجعی و ئاخوند و مەلالی و... کرا، بەشێکیش پێیان وابوو ئەوە هەنگاوێکی مەزنە لەناوچەکە و جیهان وەك دەرفەت بۆ کورد هاتە پێش پێویستە بەووردی و زانستیانە بقۆزرێتەوە، دۆخێکە وێچووی ئەو دابەشیەی لە نێو ریزی بزوتنەوەیی کورد سەری هەڵدا کە بەشێك پێیان وابوو لەگەلّ ئەستەنبول و عوسمانی مافی کورد دێتە دی، بەشە عەلمانیەکەش پێیان وابوو لەگەل کەمالی، دوای لەگەل سەرکەوتنی عەلمانی و کمالی مالی کوردیان وێران کرد، ب لەناو ئیران عەلامە احمد مفتی زادە و هەندیّ لە پەیرەوانی لەهەموان ووردتر لەوهەنگاوە ئیجابیە گەیشتون، لەدوای ئەو شەهید د. عبدالرحمن قاسملۆش رەچاوی ئەو هەنگاوە و مانای دەوڵەتی نویّ ئیرانی زانی چیە، بەلاّم باقیەکەی تر لە کۆمەڵە و مامۆستا شێخ عزالدین حسینی و هەندیّ شیخی ترو بنکەکانی تری حزبی دیموکرات و زۆر لای تر لەو مانایە نەگەیشتن، زیاتر کەوتنە ژێر کاریگەری پلانی بەعس و جامیعەی عەرەبی و ڕۆژئاوا، دوای حزبی دیموکراتیش بەتەواوی تێوە گلاّ، لە کورستانی عیراقیش هەریەکە لە ئیدریس بارزانی و مسعود بارزانی و رسول مامند، لەنێو یەکێتی د. فوئاد معصوم پێچەوانەی رای مام جلال و د. محمود کۆمەڵەی رەنجدەران....بوو، تالەدوای بووە شەڕی نێوخۆ بەجۆرێك سۆشیالیست و پارتی کەوتنە لای ئیران و یەکێتی و حزبی

دیموکراتی ئێران کەوتنە لای حکومەتی عیراق، شەر لەنێوانیان دەستی پێکرد و مفاوەزاتی ١٩٨٣ ی نێوان (ی ن ك)و بەعسی لێ هاتەدی وبزوتنەوەی کوردی دووچاری هەلدێرێکی مەترسی کردو بوە هۆی ئەنفال وکیمیایی وهەمو کوردستانی عیراق لە ٨٠ تا ٩٠کلم[٢] کۆکرایەوە.

مانەوەی دەوڵەتی ئێران بەو سروشتە یارمەتی هەمیشەیە بۆ بزوتنەوەی کوردایەتی، بەلاّم هەرکاتێ هاتەسەر رای (ریفۆرمخوازەکان) و بەرژەوەندی دەولّەت و میللەتی ئێرانی خرا سەرووی بەرژەوەندیەکانی تر وەك (باقی دەولّەتە نیشتیمانی و نەتەوەییەکانی تر) ئەوا کۆتایی بەو ئیجابیاتەی دێت بۆ ستراتیژیەتی کورد، واتە لەنێو ئێرانیش دا بالّەکان جیا جیان، هەر هەموی بەیەك رادەو تەوژم پۆلین ناکرێن، نابێ لەبیر بکەین ئەو توێژنەوەیە هەلّسەنگاندنی کۆماری ئیسلامی ئێران نیە تا چاك و خراپەکانی باس بکەین، تویژینەوەیەکی ستراتیژیە پەیوەست بە کاریگەریەکانە لەسەر کوردە، ئەگینا ئەویش سەلبیاتی گەلێ زۆرە لە هەموی نزیك تر تا ئەو ساتە نەیتوانیوە مادەی( ١٥ ) دەستورەکەی خۆی جێبەجێ بکات کە بریتیە لە خوێندن بە زمانی خۆیان[٣٧٥]

ئەوانەو زۆر دیوی تر هەیە ڕاستەقینەن، توێژینەوەکەی ئێمە ئەوە نیە بەلّکو پانتایی ستراتیژی وەرگرتوە، واتە تێکرای بەراوردەکان وەردەگیرێن، کە لەسەر ئاستی نێوخۆ و ناوچەکانی جیهان زۆر لەسەردەمی (شا) باشترە، لەسەر ئاستی ناوچەکە و جیهان روونە و کەمتر کێشەی لەسەرە، بەلاّم بۆ باری ناوخۆ هەندێ معارەزە هەیە دەڵێن ئەویش مافی کوردی نەداوە، تا ئەوساتەش بەرپرسانی غەیرە کورد فەرمانرەوای کوردستان دەکا، بەتایبەتی تورکمان (عەجەم) ئینجا خوێندن بەزمانی کوردی نیە.... لەگەڵ زۆر مافی تر..

---

[٣٧٥] دەستوری کۆماری ئیسلامی ئێران لەسالی ١٩٧٩ بەپێی راپرسیەك لە٩٨٪ی رازی هاتە کایەوە، پێك هاتوە لە١٧٦ مادە ، دەقی مادەی ١٥: اللغة والكتابة الرسمية والمشتركة" هي الفارسية لشعب إيران، فيجب أن تكون الوثائق والمراسلات والنصوص الرسمية والكتب الدراسية بهذه اللغة والكتابة. ولكن يجوز استعمال اللغات المحلية والقومية الأخرى في مجال الصحافة ووسائل الإعلام العامة، وتدريس آدابها في المدارس إلى جنب اللغة الفارسية.

بەشێك لەوانە ڕاستە بەڵام بۆکورد ناشێت لاسایی ئەمریکا و بەریتانیا بکاتەوە، پێویستی بە عەقلانیەت و دانایی هەیە مادام نەتەوەی سەردەست نیە، مادام جۆرێك لە هەبژاردن و دیموکراسی و سەروەری دەستوور مافی هاوڵاتی بون هەیە، مادام ئوستانێك بەناوی کوردستان هەیە، کەناڵی ئاسمانی بەکوردی هەیە... هتد، مانای جێ ی دەست خۆشیە و خەبات و تێکۆشانی ئاشتیانەی پێویشتە تا زۆری تر بەدەست بهێنرێ.

دوەم لە نێو تورکیا: لەدوای سەدەی ١٧ەمەوە(٥)ویلایەت لە ئیدارەی عوسمانی بە(کوردستان) ناوز زەد دەکرێت، لەهەمو بەشەکان ئالۆزتر کوردستانی تورکیایە، لە ٢٩٪ ی خاکی تورکیا پێك دەهێنێ کوردیش لە٢٥٪ی دانیشتوانە[٣٧٦]، کە بەخوارووی ڕۆژهە ڵات ناو دەبرێ نەك کوردستان، بۆ یەکەم جار لەسەردەمی دەسەڵاتی ئیتحادولتەرەقی ناوی کوردستانی (کە فەرمیەتی ئیداری وسیاسی ویاسایی وەرگرتبوو)لە پرۆگرامی خوێندن کوژایەوە[٣٧٧]، تا دوا نەخشەی عوسمانی ١٨٩٣ و ١٨٩٦ئیداری ناوی کوردستان هەر بەگەورەیی مابوو، ویلایەتەکانی خوارووشی دەگرتەوە ئەگەر چی لە ئیداری هەر ٥ ویلایەتەکەی (محمودیە، العزیز، دیاربکر، بدلیس، وان)[٣٧٨] دەگرتەوە.

لەدوای شکستی هەردوو شۆرشی شێخ سعید ١٩٢٥ و شۆرشی ئیحسان نوری پاشا لە ١٩٢٧تا١٩٣٠ کوردستانی تورکیا (باکوور) کەوتە مەینەت و زیندانیەکی داخراو، بە کتابێکی فەرمی ژ:١٥٠٥ی سالی ١٩٢٣مولك ومالێکی زۆری کوردان دەستی بەسەرداگیراو دووپاتی فەرمانەکانی سەردەمی ئیتحاولترەقی کرایەوەو ناوی کوردو کوردستان وزمانەکەی قەدەغە کرا، لەسەر نەخشەش ناوی کوردستان بە یەکجار هەڵگیرا، لەدەستووری تورکیا دا نکۆلی لەبونی کورد کرا، هەرچەندە لەدروست کردنی تورکیای نوێ

---

[٣٧٦] ئەوە لە بەڵگەنامەی بریتانی وئەمریکی وەرگیراوە نزیکە لە راستی وتورکیا ئاماری نیە لەو بارەوە.

-[٣٧٧] مالیـازد - القومیة الکردیة ودعبداللة جودت ص٦٢، یەکەم جار ئیتحادوالترقی لە رۆژنامەی (تەنین) لە جیاتی کوردستان ویلایەتی شرقی بەکارهێنا.

[٣٧٨] ئەوە لە بەلگەنامەیەکی ئەمریکی بە ٥ ویلایەت هاتوە، ئەوەش دەقی بەلگەنامەکەیە:

وزارة الخارجیة الأمیرکیة، الوثائق الدبلوماسیة السریة المنشورة

الشرق الأوسط، منشورات الجامعة الأمیرکیة. واشنطن سري

القنصلیة الأمیرکیة، حلب، سوریة ٣ – آذار – ١٩٢٤ الموضوع – الأنتفاضة في کردستان

الی: سعادة وزیر الشؤون الخارجیة

...و لکن ذلك لم تقضي علی التمرد، حیث هناك العدید من المدن و القری الخاضعة للسیطرة المطلقة لقادة التمرد. یقال بان حرکة التمرد شملت کل من الولایات التالیة: محمودیة، العزیز، و دیاربکر، بدلیس، وان، وأن هذه المنطقة مجتمعة تشکل ما یعرف بکردستان.

(ئەگەر هەڵەش) بێت کورد بەشدار بووە لە پەرلەمانی تورکیا (بویج ماجلیس) لە مادەی (١)ی میساقی نەتەوەیی تورکیا ئەوە مافە سەرەتایانەی تێدایە، لە دەوروبەری ١٩٢٢/١/١٦پەرلەمانی تورکیا پرۆژەیەکی ئەتاتورکی گفت وگۆ کرد سەبارەت بە فیدرڕالی بۆ کوردستان، پێك هاتبوو لە ١٨ مادە ـ ئەوەی خوارەوە دەقی ١٨ مادەکەیە لە بەڵگەنامەی بەریتانی هاتوە[٣٧٩]، هەروها لە مادەکانی (٦٢، ٦٣، ٦٤) ی سیڤەر

---

[٣٧٩] مشروع مصطفى كمال للحكم الذاتي
وزارة الخارجية البريطانية دائرة الشرق الأدنى-تركية { ٣٥٤٣/٩٦/٦٥ E } سري للغاية
من سير ايج رامبولد الى:ماركيس كوزون كيدلستون رقم التقرير ٣,٨
سيدى: أشارة الى كتابي رقم ٥٣ المؤرخ في ١٩٢٢/١/١٦ و مراسلاتي السابقة بصدد المسألة الكردية.... كان بنود المشروع المقترح لمعالجة المسألة الكردية كالآتي:

١. أنطلاقا من الحرص على ضمان تقدم الشعب التركي و نهضته و أستنادا الى المباديء الحضارية التي نؤمن بها، يقترح المجلس الوطني تشكيل أدارة للحكم الذاتي للشعب الكردي بما يلازم عاداتهم و تقاليدهم.
٢. قد يعين الحاكم العام في المناطق ذات الأكثرية الكردية من قبل الأعيان الكرد و يساعده في أدارة الحكم مساعد الحاكم العام الذي قد يكون كرديا أو تركيا و يعين من قبل المجلس الوطني التركي
٣. يقوم المجلس الوطني بالموافقة على الحاكم العام للمنطقة و الذي يجب أن يكون اداريا جيدا و مجربا و ذات سمعة جيدة و يحضى بتقدير و احترام جميع الكرد.
٤. يعين الحاكم العام لمدة ٣ سنوات و في حال انتهاء تلك الفترة يقوم المجلس الوطني كردستاني المحلي بترشيح أسم شخص جديد للمنصب و لكن في حالة موافقة أكثرية الكرد يمكن تمديد الحكم للحاكم العسكري لفترة أخرى.
٥. رغم أنه من صلاحية المجلس الوطني أن يقرر فيما اذا يكون نائب الحاكم العام الكرديا او تركيا، ألا النائب العام يجب ان يكون منتخبا مباشرة من المجلس الوطني كردستاني. يجب ان توافق حكومة أنقرة على أسماء المرشحة لمنصب الحاكم العام و نائب الحاكم العام و منصب المفتش
٦. تنتخب المجلس الوطني كردستاني من قبل سكان الولايات الشرقية عن طريق الأنتخابات العام المباشر و تكون ولايته لمدة ٣ سنوات. تبدأ أجتماعات المجلس في الأول من آذار من كل عام و ان مدة عقد الأجتماعات تكون لفترة ٤ أشهر. و اذا لم تكن هذه الفترة كافية لأنهاء أعمالها يمكن تمديد الفترة و ذلك من خلال طلب يقدم المجلس الوطني كردستاني و يجب ان يحضى الطلب بموافقة صوت الأكثرية من الأعضاء و تصديق حكومة أنقرة لذلك.
٧. يحق لمجلس الوطني ان يدقق في الموارد و ميزانية و مصروفات الولايات الشرقية او النظر للمظالم الذي قد يتعرض احد موظفي الدولة. يحق للمجلس الوطني المحلي ان يتخذ اي قرار من اجل تطور و ازدهار المنطقة، و لكن يجب ان يعلم سلطات أنقرة بالقرار و قد يكون المجلسل الوطني على علم مسبق بالقرار.
٨. يبت المجلس الوطني في جميع المسائل الخلافية بين الحاكم العام و المجلس الوطني كردستاني و على الطرفين القبول بقراره.
٩. لحين يتم تحديد حدود المنطقة الكردية من قبل لجنة مشتركة من الكرد و الترك يكون المجلس الوطني كردستاني ممثلا للولايات التالية: وان، بدليس، دياربكر، درسيم، و بعض الأقضية و النواحي الأخرى.
١٠. يتم تأسيس نظام قضائي خا ص للمنطقة الكردية و يكون هذا النظام منسجما مع العادات و العرف المتبع في المنطقة. ففي الظروف الحالية يتم تعيين اداريين أكفاء، نصفهم من الكرد و النصف الآخر من الترك لأدارة الشؤون القضائية. و في حالة أحالة الموظفين الترك الى التقاعد يمكن ان يعيين محلهم اداريين من الكرد.
١١ أبتدأ من تأريخ بدأ العمل بهذا القرار {مشروع الحكم الذاتي} لا يمكن ان يفرض في المنطقة أي ضريبة كمساهمة للمجهود الحزبي او اي ذريعة مماثلة. و يلغى العمل بكل الضرائب المالية المفروضة حاليا اذا رأى الحاكم العام ذلك و يعطي الضرائب العادية مرة كل سنة. ان كمية الموارد المالية التي سترسل الى الخزينة المركزية في أنقرة تحدد من قبل لجنة مشتركة ·يكون اعضائها من المجلس الوطني كردستاني و المجلس الوطني تركى.
١٢. تشكل قوة جندرمة خاصة في الولايات الشرقية و تشرع االمجلس الوطني الكردستاني قانونا خاصا لتنضيم عملها و لكن ستظل المناصب العليا في الجندرمة بيد الضباط الترك الى وقت يتم اعفائهم من المنصب.
١٣. يبقى الجنود و الضباط من الكرد يخدمون في مواقعهم الحالية لحين عقد معاهدة السلام (المقصود إتفاقية للشلام بين تركية و دول الحلفاء-المؤلف) و بعد عقد اتفاقية السلام يحق لهؤلاء العودة الى الولايات الشرقية.
١٤. بعد عقد اتفاقية السلام تقوم الحكومة بتقرير قيمة الأموال و الحيوانات التي اخذت من الناس في الولايات الشرقية و تعوض الحكومة الكرد بذلك في فترة لا تتجاوز سنة.

باسی لەدەوڵەتیك كوردستانی كردووە بەدانانی یاسایی لەدوای سالیك، لە لۆزانیش لەمادەكانی (٣٨، ٣٩، ٤٠) داكۆكی لەمافە كەمەنەتەوەكانی توركیا كردووە [٣٨٠]، بەڵام دوای سەركەوتنی ئەتاتورك لەهەموی پشیمان بوەوە، بەو شێوەیە پرۆژەی عەلمانیەتی كورد شكستی هینا، كەپێیان وابوو دەتوانی لەچوار چیوەی دەوڵەتیكی نەتەوەیی مۆدیرن مافی تەواویان هەبی، بە پیچەوانەی لای دوودم كە ئاینیەكان بون [٣٨١] پێیان وابوو لەچوار چیوەی عوسمانی دەشی وەك بینرا دەوڵەت و میرنیشینی مەزنی لیهاتە دی، بەڵام لەچوار چیوەی دەوڵەتی توركیای نوی ئەستەمە، پرۆژەی ئاینیەكان لەدەرەوەی توركیاو كەمالی بوو، بوە شۆرش و شكستی هینا، هەرچی عەلمانیەتی كوردی بوو لەگەل كەمالیەكان توانەوەو شەرمەزاریان هینا، لە كۆتایدا نكۆلی لەهەمو كورد كرا دەستوریك دارژرا جیا لە دەستورەكانی جهان یان پتەو یان نەرم، دەستوری توركیا هەردوو لایە، بەشێوەیەك ئەو مادانەی ئاماژەیە بۆ پیكهاتەی توركیا بە(پتەو) تۆمار كراون، لەمادەی (١، ٣)و، (٦٤ ـ ٦٨) بەتایبەتی مادەی ٦٦، واتا ئەوانە نابی دەست كاری بكری، بەوشێوەیە فەرمانرەوای توركیا دەرگای لەسەر زیندانی كورد داخست، ناوە ناوە تەكانیك بووە لەچوار چیوەی ئەو بنەمایەی لە پیشووتر باسمان كرد، لەكۆنگرەی(٤)ی ٣١/١٠/١٩٧٠حزبی كاری توركی بۆ یەكەم جار دانی بە بونی كورد هێنا لە نێو توركیا، بەڵام كایگەری نەبوو چونكە ئەو هەلویستەی بوە هۆی ئەوەی دادگای توركیا لە٢٠/٣/١٩٧١ چالاكی یاسایی

---

١٥ يستعمل اللغة التركية فقط في داخل المجلس الوطني كردستاني و مكتب الحاكم العام و دوائر الدولة. و لكن يمكن ان يدرس اللغة الكردية في المدارس و الحكومة قد تشجع ذلك بشرط لا يكون ذلك خطوة تمهيدية بالمطالبة من أجل جعل اللغة الكردية هي اللغة الرسمية للحكومة في الولايات الشرقية.

١٦ يكون الهدف الأساسي للمجلس الوطني الكردستاني هو تأسيس جامعة في المنطقة و تكون فيها كليات القانون و الطب.

١٧. لا يمكن للمجلس الوطني الكردستاني ان يفرض أية ضريبة قبل موافقة الحاكم العام و أعلام المجلس الوطني بالأمر.

١٨. ليس من حق المجلس الوطني الكردستاني أن يعطي أية امتيازات (المقصود هنا امتيازات أجنبية-المؤلف) بدون موافقة المجلس الوطني.ن

هذا العرض الموجز لقانون الحكم الذاتي المقترح يبين لنا عارضة النواب الكرد بشدة.

لي الشرف

هوراس رامبولد

تێبینی: ئەو بەندانە لەژێر بارو دۆخی خەلافەتی ئەستەمبۆل وكۆنگرەی سیڤەروجەنگی توركیا لەگەل یۆنان وكیشەی ویلایەتی موسل و هیزی كورد لەو كیشانە هات، لەنیو پەرلەمان گفتو كۆی لەسەر كرا بەڵام كوردی نێو پەرلەمان پێی قایل نەبوون.

[٣٨٠] بروانە دەقی رێكەوتنی (لۆزان -تەنها بە ئینكلیزیەكەی هەیە) [٣٨٠] لە هەندێ سەرچاوەی وەك د.محمد ئەمزینی لە كتێبی (جولانەوەی رزگاری نیشتمانی) محمد شێرزاد لەكتێبی (رجال الاكراد)، د.قاسملو و چەندین كتێبی تر ئاماژەیان بە ماددەكانی (٣٨، ٣٩، ٤٠)ی لۆزان كردووە گوایە مافو ناوی كوردی تیاهاتووە، دوای ئەوەی بەوردی بەراوردمان كرد لەگەڵ دەقی رێكەوتننامەی لۆزان بە ئینگلیزیەكەی دەركەوت ناوی كوردی تیا نەهاتوە. بەڵام لە كتێبی (الحركة الكردية في العصر الحديث- لازاريف وجليلي -ص١١٧)، ماددەكانی ٣٨، ٣٩ یان وەك خۆی گواستۆتەوە بێ ناوی كورد.

[٣٨١] - لەلایەن ( فۆرستەرەوە) بەنەستەمبولیەكان ناودەبران.

وەستێنرا هەروەك حزبی رەفاهیش بە هەمان دەرد چوو، تارادەیەك چەپیەكان ویستیان دەرگای ئەو زیندانیە بكەنەوە.

بەلاّم كاریگەریەكی وای نەبووە، تاسەرهەلّدانی ئیسلامیەكان لە توركیا، لەسەرەتادا لەیەكەم هەلّبژاردن نجم الدین ئەربەكانی سەرۆكی حزبی رەفا توانی حكومەت پیك بهینیت و بەهۆی هەلویستە چاكەكانی بەرامبەر كورد سوپای توركیا لەدەسەلاّت نەیانهیشتن، دوای لە زنجیرە هەلّبژاردنەكانی سەرەتای سەدەی (٢١)پارتی دادو گەشە بەرابەرایەتی ئەردوگان وعبدالله گول لە٤٢٪ی دەنگەكانیان هیناو زۆرایەتی كورسیەكانی پەرلەمانیان مسۆگەر كرد: دوای سەرۆك وەزیرانیش و لە هەرە دوایش سەرۆكایەتی كۆماریشیان مسۆگەر كردو وا هێرش بەرەو دەستوورودادگاشە.

ئەوگۆڕانكاریەی توركیابەرە بەرە دەرگا داخراوەكانی شل كردەوەوبوە تەكانێكی تربە بزوتنەوەی كوردایەتی، لەگەل بەردەوامی ئەوانە داهاتی ستراتیجی زیاتر دەبیّ، لەوەش زۆر زیاتر دەبیّ ئەگەر سەركردایەتی سیاسی كورد لە ئاستی تێگەیشتنی ئەو گۆڕانكاریانە بن، كە گومان هەیە وابن.

سێیەم ـ لەنێو عیراق: پرسیارە بنچینەیەكە لیرەش ئەوەیە لەسەرەتای مەینەتی كورد لەو بەشە هۆیەكانی كام لابووینە؟ عەلمانی یان ئیسلامی ئینجا هۆیەكانی بەردەوام بونی؟ لەكاملاش بواری دەربازی كوردی تیایە، یاخود بەروون تر بلین لەنیو ئەو پیكهاتانەی عیراق: شیعە سونە، عەلمانی ئیسلامی، عروبی نەتەوەیی یان عروبی نیشتمانی... لەكامیان بەختەوەری و سەلامەتی بۆ كوردستان هەیە؟ لەكامیشیان سەرچاوەی هەرەشەی تەعریب و ئەنفال و كیمیایی و ویرانی بووە..

**دروست بونی عێراق.. مال وێرانی:** لەبەر ئەوەی زۆر بە زیادەڕەویەوە باس لە تیۆری پیلان دەكری، ئەوا گەلیّ جار لای خوێنەرراستیەكانیش دەشێوێنن، ئەگیناتیۆری پیلان گێڕی سەرتاسەری هۆنینەوە نیە، بەتایبەتی لە سەردەمی خیلافەتی عوسمانی و كۆنگرەكانی ئەو سەردەمی، بەپێی هەندیّ سەرچاوە نزیكەی١٠٠ كۆنگرەی ئاشكراو نهێنی لەو پێناوەكراوە، دەتوانین بلێین زۆربەی ئەونەخشە سیاسی و مدرسە فكری و

سیاسیانەی لەناوچەکە دروست بونە بەرهەمی ئەو کۆنگرانەن، نەك بەرهەمی ڕەوتی سروشتی ناوچەکە بێت، لەوانەش سەرهەڵدانی فکری عەلمانی و فکری نەتەوایەتی و زاراوەی وەك (امە العربیە) و (امتی العربیە والاسلامیە) زیاتر لە وەش زەق کردنەوەی ناوی وەك سوریا و عێراق و ئوردن و کویت، دروست کردنی دەوڵەتی عێراق و سنور و دام و دەزگاکانی هیچی (بەموتلەقی) لەبەرهەمی خەڵکی ئێستای عێراق و ناوچەکەش نیە، هەر هەموی بەرهەمی ڕۆژ ئاواییە، ئەوەی بووە بەلای زیاتر لەدروست کردنی عێراق ئەوە بوو ئەو دەوڵەتە لەسەر بنچینەیەکی لوجیکی ئیمپریالیزمیش دروست نەبووە، کە پێوەکانیان بریتی بوو لەدەوڵەت دروست کردن لەسەر بنچینەی ڤاکتەریکی کۆمەڵایەتی یان نەتەوەیی یان ئاینی و میژووی دیایکراو، کە چی عێراق لەسەر ئەو بنچینانەنەبوو: لەسەر بنچینەی بەرەنجامی دیفاکتۆی هیزی سەربازی بەریتانی بوو، (فقد جاء في برقية من الحكومة البريطانية الى المندوب السامي في بغداد يبلغه بأن يؤسس دولة عربية في مناطق التي تصلها نفوذ بريطانيا بإسم العراق)[382]، بە پی ی بروسکەی (چەرچل) بۆ سەرکردە سەربازیەکان و بۆ خودی شا فەیسەلیش خوارووی چیای حەمرین بە سنوری سەرووی (عێراقی دروستکراو)دیاری دەکا[383] ودەڵێت: اننا وعدناك بتأسيس دولة عربية وليست امبراطورية، لذلك ان حدودك لن تتجاوز جبل حمرين الى ما ورائه فهو كوردستان))[384]..، بە سەرکردە سەربازیەکان دەلی دەوڵەتیك دروست بکەن سنوری خوارەوەی (فاو) بیت سنوری سەرووش لەژێر پای دوا سەربازی بەریتانی بیت، ئەوەش گوزارش لەمەبەستە نهینیەکانی سایکس بیکۆ و کۆنگرەکانی تر دەکرد، کە بەکورتی مەبەستیان لەناوچەکە ئەوە بوو خیلافەتی عوسمانی بروخینن و ئەو دەوڵەتوکانە دروست بکەن بۆ ئەوەی: جهانی ئیسلامی دابەش بیت، ناوچەکە هەردەم نائارام بیت، هەمیشە

---

[382] الإسلام والعلمانية ..ص٢٣٨

[383] دەقی بروسکەکە دەلی: ئێمە بەلێنی پێك هێنانی دەولەتۆکەکی عەرەبیمان پێدایت نەك ئیمپراتۆریەت بۆیە سنوری تۆ(جبل حمرين)ە لەوی بەسەرەوە کوردستانە.لە بەلگەنامەیەکی تری بەریتانیا (fo ٣٧١/١٦٣٦٧)تیلکرام ژ:٦١٦ هەمان ڕاستی دوبارە دەکاتەوە.

[384] حدود کوردستان الجنوبية... ص٢١٧

له دوا كەوتن دابيت، لەچوار چيوەی ئەو ناكۆكی و نامۆییە جێ ی دەوڵەتيكی نامۆی وەك ئيسرائيليش لەناوچەكە ببيتەوە.. لەگەل زۆر مەبەستی تر زۆر بەش هاتۆتە دی.

لەسەر ئەو بنچينە گشتيانەو ستاندەرەكانی ئيمپرياليزم و ئاژانسی زايۆن عيراق دروست كراوە، سەرەرای ئەوەش دەوڵەتی عيراقی بەتايبەت تر و لەسەر بنچينەی سزاو پاداشت بە زەبری تانك و فرۆكە دروست كراوە، سزا بۆ ئەوانەی بەرگری نيشتمانيان كرد دژی پيلانی دروستكردنی دەوڵەتی عيراقی، كەزياتر پيك هاتبوو لە هيزە ئاينيەكان وهيزە دلسۆزە نيشتمانيەكان، لە عێراقی ئێستا ميراتگرەكانيان بريتين لە هێزە ئاينيەكان

لەكوردستانيش سەركردەو زانايانی ئاينی و جەماوەرە فراوانەكەيان بەشدار بون، هەرچی لەناوچەعەرەبە سونيەكان هۆشياری ئاينی ئەوەندە گەشەی نەكردبوو، زياتر ناوچەيەك بوو بەهاو نەريتی رەوەندی زال بوو[٣٨٥]، بۆيە مامۆستا ئاينيەكانيان خەلكيان نەبوو، هەر خۆيان لەرێ ی گوتاری هەينی و وەعزەكانی تر لايەنگريان لەبەرگری و شۆرش كرد.

ئەوانە(ئەو چينانەی لەنێو هەرسێ لای شيعەوسونەو كورد) لەشۆرش و بەرگری لەدژی هێزی بەريتانی سەركەوتوونەبون وسزادران، ئەوانی تريش پاداش كران لەلايەن بەريتانيا و دەسەلاتی دەوڵەتی عيراقيان پی بەخشرا، ئەوانەی پاداش كران لەدوای دروست كردنی دەوڵەتی عيراقی بريتی بون لە: بنەمەمالەی شريفی مەكە([٣٨٦]) باوكی مەليك فەيسەلی عيراق، عەلمانی وبەكرێگيراوانی بەريتانيا، بەشيكی فراوان لە تەياری عروبی، عەشيرەتەكانی ئەو ناوچەيە، لەكوردستانيش بەشيك لەتەياری عەلمانی وليبراليەنەتەوەييەكان..، ئەوانەش لەپاداشی هاريكاريان بۆ هێزەكانی بەريتانی وهاوپەيمانی لەناوچەكەو بۆرووخانی عوسمانی ودابەشی ناوچەكە ودەرهينانی قودس لەژێردەستی هێزی عوسمانی پێدانی بە يەهوديەكان... بۆ هەمو ئەوانە عيراق درايە

---

[٣٨٥] بۆ زياتر لەوبارەيەوەبروانە: أ-الاسلام والعلمانيه..ب-زۆربەی كتێبەكانی د علی وردی..ج-الشيعه والدوله العراقيه حسن العلوی .

[٣٨٦] چەند بنەمالەيەك لە نيو عەرەب موچەی مانگانەشيان بۆ برا بەوە لەلايەن بەريتانيا لەوانە (١- ابن السعود ١٠٠,٠٠٠ جنيه، ٢- ملك حسين- شريف مكة- ١٠٠,٠٠٠ جنيه، ٣- فهد الهذال ١٤٠,٠٠٠ ربية ٤- السيد الأدريسي ١٢,٠٠٠ ليرة..) بەلام بنەمالە ئاينيەكان ئەو پارەو زيرەيان رەت كردەوە.

ئەوانە، کوردو شیعە و لایەنە ئاینیەکان بی بەش کران و سزا دران، تانك و تۆپیان لەدژ بەکار هات، بەو شێوەیە دروست بونی عیراق پیش ئەوەی بەلا بیت بۆکورد بۆ عەربیش بەلایە، بوە بەشیك لەدابەشی عەرەب و داوکەوتەیی و نامۆیی و دەستکردەیی و نا ئارامی...، بوویتە بەشیك لەپاساوی بونی دەوڵەتی ئیسرائیل لەناوچەکە، هەمو ئەوانە بوویتە هۆی مال ویرانی بۆ کورد و عەرەب و تورکمان و ئاشوری و هەمو لایەك

لەگەڵ دروست بونی دەوڵەتی عیراقی مەینەتی کوردیش دروست بوو، لەوکاتیەوە هاریکاری و هەڵوێستی مەردانەی زانایانی ئاینی لە عیراق بەدی دەکرێ بەوشێوەیەی خوارەوە:

أ. لەکاتی هێرشی بەریتانیا بۆ سەر ناوچەکە بەمەبەستی جێ بەجێ کردنی نەخشە و پلانی دابەشی کوردستان و جیهانی ئیسلامی لە ١٩١٤ ئەوا هێزەکانی شێخ محمود و هێزە ئیسلامیەکان بەسەرۆکایەتی زانایانی ئاینی نەجەف و کەربەلا و کازمیە و سامرِا پێکەوە جەنگان، لەوزانا ئاینیانەی سەرکردەی بەرەکانیان کردووە،: محمد سعید الحبوبی، باقر الحیدری، محسن الحکیم، مهدی الخالصی، عمر خالصی، جعفر الشیخ الرازی، عبدالکریم الجزائری، عیسی کمال الدین، مهدی حیدری، شیخ الشریعە، مصطفی کاشانی، علی الداماد وعبدالرزاق الحلو..، لەلای عەلمانیەکانیش کۆبونەوە دەکرا بۆ هاریکاری کردنی بەریتانی، هەریەکە لە: (موسی کاظم باجەجی، عبدالرحمن جمیل، یوسف سویدی، یوسف باجەجی، عبدالرحمن النقیب، عبداللطیف تیتان، رشید الهاشمی..)کۆبونەوەو نامەیەکیان بۆ بەریتانیا نارد بۆ پەیوەندی ژێر بە ژێر، بەشێکیشیان لەگەرمەی جیهاد چوونە رِیزی بەریتانیەکان لەوانە::مولود مخلص، علی جودت أیوبی، عبدالله دلیمی.. هتد[٣٨٧]

لەماوەی سا لانی ١٩١٨ تا ١٩٢٠ سێ حکومەت لەوخاکەی ئێستا پێی دەڵێن عیراق دروست ببوو حکومەتێك ئیسلامی لە فوراتی ناوەرِاست بە سەرۆکایەتی (ا. شیرزای)[٣٨٨]

---

[٣٨٧] أنررعلی الجبوری- دورالمثقفین فی الثورة العشرین ص ٣٣-٣٥

[٣٨٨] وچەند نەنجومەنیکی بالآی سەرپەرشتی کە لە ١٩٢٠/٨/٢٥ دامەزران بەوشێوەیە: ١ نەنجومەنی شاردوانی ٢. نەنجومەنی کارگێری ٣. نەنجومەنی جێبەجێکردن(حکومەت) ٤.نەنجومەنیکی زانستیش پێك هاتبور لە (١٤) زانا بە سەرکردایەتی (شیخ الشریعە)بۆ سەرپەرشتی وچاودێری حکومەت وشۆرش بکەن بروانە: أ-وردی... لمحات ج٥ص٢٩٢ ب- العراق... ج١ص١٦٦-١٦٧

حکومەتی دوەم عەلمانی عروبی لە بەغدا و حکومەتێکی نیمچە ئیسلامیش لە سلێمانی، حکومەتی ئیسلامی کەربەلا دانی بەو حکومەتەی سلیمانی هێنابوو، نامەی ئالوگۆڕیش لەنێوانیان هەبوویە تایبەتی لە نێوان شیخ محمودو مهدی خالصی[389]

ب. دوای شکستی هەردوو حکومەتی خواروو و سەروو و سەرکەوتنی حکومەتی بەغدا، ئەو هاریکاریەی بەردەوام بوو، لەسالی ١٩٣٥ لەنێوان بکر صدقی کورد و أ. کاشف الغطاء....، لە چوارچێوەی بەردەوامی ئەو پەیوەندیە لەسا لآنی ١٩٦٣ دیسان لە نێوان بارزانی و محسن الحکیم بووە هۆی ئەوفتوایە بەناوبانگەی حکیم سەبارەت بەشۆڕشی کورد کە تا ئەو ساتەش کاریگەری ماوە.

ت. لەدوای ئەوەش هەڵوێستی زانایانی ئاینی تریان لە محمد باقر الصدر، محمد باقر الحکیم، علی سیستانی، ..باشتر بوە لە عەلمانیەك عروبیەکان.

ئەو بارو دۆخە نا ئاساییە لە عیراق بەردەوام بوە بێ چارەسەریەکی ڕاستەقینە، هەربۆیەش ولآتێکی نا ئارامو پڕ لە پشێوی لێ دروست بوە، سەرجەم زیاتر(٣٦) ئینقلاب و ڕاپەرینی ئاشکراکراوە[390]، شۆڕش ڕاپەرین تاگەیشتە رادەی بەکار هینانی چەکی کیمیایی و ئەنفال و وێران کردن، ئینجا دەرچوونی سزای نیو دەوڵەتی لەدژی دەوڵەتی عیراقی و قۆلبەستکردنی لە بەندی (٧)ەمی میساقی نەتەوە یەکگرتووەکان و دەرچوونی (٦٥) بریار لەدژی، دواییکەش لەسێدارەدانی سەرۆك کۆماری، ئەوەش کۆتایی زۆربەی سەرۆك و بەرپرسیەکان بووە لە عیراق، جگە لەوەی یارمەتی نەبووە لەسەر ئاستی عەرەب و بۆ کێشەی فلستین بەڵکو بەشیك بووە لەپیلان و داگیر کاری کویت و جەنگەکانی تری لەگەل ئیران و... زۆر مەرگە ساتی تر..، بەڕاستی ئەو پێشبینیەی بۆ ئەو دەوڵەتانەی ڕۆژهەلآتی ناوەڕاست هاتە دی کە لە:١ ـ مەبەستەکانی سایکس پیکۆ دارژرابوو ٢ ـ پرۆتۆکۆلی ژ:٧ کە دەڵێ دروست کردنی

[389] لەکاتی هێرشی شێخ محمودبۆ کەرکوك ئاگاداری شیخ خالصی کردۆتەوە وەك لە کتێبی (کوردستان من بدایة الحرب العالمیة الأولی الی نهایة مشکلة الموصل –سروة اسعد صابر ص٢٤٧هھاتوة.

[390] بروانە: ١-کتێبی (انقلابات فی العراق) ٢- کتێبی: العراق ج٢ص١٢١ حتا بەتاتو - تیایدا ئەو ئینقلاب وراپەرین و یاخی بوونانەی سەر ژمێر کردوە

ئەو دەوڵەتانە وەك بۆمب وایە لەناوچەکە هەردەمەك بمانەوێت دەیتەقێنینەوە٣ ـ ئەوەی لۆرانس وتی ئەو دەوڵەتانە دروست دەکەین بە قازانجی خۆمان نایەلین نرخی سەنتێکیشیان هەبێ تەواو وادەرچوو.. کەواتە چۆن عێراق بەلا بووە بۆ کورد ئاواش بەلا بووە بۆ عەرەب، بۆیەش لەدوای یەکسەدە لەتەمەنی دەوڵەتی عێراقی ئینجا شێخێکی عەرەب بە پۆل بریمەری ووت تکاتان لێ دەکەین عێراق بکەنە ویلایەتی ٥٣یەمینی ئەمریکا[391]، لەسەر ئەو بنچینەیە لەسەر ئاستی بەریتانی وعەرەبی وزۆر لای تر ئامۆژگاری بەریتانیان کردوە کە عیراق سەرکەوتو نابێ وبادروست نەکرێ، هەندێك لەو ئامۆژگاریانە تۆماردەکەین:

١ ـ زانای بەریتانی تۆینبی وتی دروست کردنی عیراق بەو سنورەو لکاندنی بەشێك لەکوردستان بە عیراق دەبێتە هۆی تێچوونی کوردستان وعیراق پێکەوە.

٢ ـ شای سعودیە لەرۆژی١٨/مایس/١٩٢١لەسکالایەکی فەرمی بۆ برسی کۆکس دەڵێت سەرکەوتنی دەوڵەتێکی عەرەبی لە عێراق مەحالە، داوات لێدەکەم دروستی مەکەن.

٣ ـ لەبەڵگەنامەکانی بەریتانی پریەتی لەوەها ئامۆژگاری، لەهەموان روونتر راویژکاریوەزارەتیناوەخۆراپۆرتێکبەرزدەکاتەوەبەژ:١١\١٢شوبات \ ١٠٣٠دەڵێ ئەوەی من دەیبینم لەدروست کردنی ئەوعێراقەهەموی دەبێتە ناکۆکی وشۆرشی کوردو نا ئارامی وشکستی ئەو دەوڵەتەی دروستی دەکەن

٤ ـ لەناو عیراقیش لەسەرەتا دلسۆزانی عەرەب وتەیاری ئاینی پێی رازی نەبون، گەیشتە ئاستی هونەر وشیعر، ئەوانەی خوارەوە هەندێ لەو شیعرانەی:

*الشاعر محمد صالح بحر العلوم:

سیاسه شرعهاالأنتداب فقام فی تنفیذها الخائنون

فغیبت الشمس وراء الضباب لعله یعرفها المخلصون[392]

*الشاعر طیری الهنداوی:

یاقوم لاتتکلمو     أن الکلام محرم

---

[391] عام قضیة فی العراق ص٧٦

[392] موسوعه العراق    المصدرالسابق ص٤١٢

ناموا ولا تستيقظوا     مافاز الا النوم

*الشاعر عبود الكرخي:

يانقيب يانقيب عجيب ماعندك صحيب

من عفت جدك (محمد) صارا اليك (الكوكس )حبيب[٣٩٣]

وقدأعترف(نقيب) نفسه وقال أنني خنت الإسلام

چارەسەریەکانی: لەوە بۆمان دەردەکەوی کەدەوڵەتی عیراق بەو سنورو قەبارەیە سروشتی نیە، بە ئیرادەو ڕێکەوتنی میللەتانی عیراق دروست نەبووە، بەڵکو بە تۆبز و زەبرو زەنگ بووە، مانەوەی ئەو دەوڵەتەش بە هۆی داپڵۆسینی و سوپاو هەوالگری ماوە، واتە بەرگەی(مقەوەماتی) سروشتی و بەشەری و سیاسی زۆر لاوازە تا ئەو ساتەش، لەوەش دەوڵەتی نیشتمانی وخۆشگوزەرانی و دادگەری دروست نابیت، هەردەم پیکهاتەو لایەنیك بەسەر پیکهاتەکانی تر زاڵ دەبێت، لەنیو ئەو پیکهاتەش لایەن و حزبیك، لەنیو ئەو لایەنەش تاقمیك، لەنیو ئەو تاقمەش کەسیك زال بووە، ئەوەش وەك وەسفی اتحادو الترقی کە بونە مایەی رووخانی دەوڵەتی عوسمانی (علی فوئاد)گۆتەنی هەمو عوسمانیان خستبووە ژیر دەستی اتحادو الترقی، ئەویشیان خستبووە ژیر دەستی (مرکز العام)، ئەویش لەژیر دەستی انور پاشا بوو[٣٩٤]،    سەرەنجامەکەش نەك بۆعوسمانی بونە بەلا و مەینەت بەڵکو بۆ هەمو جهانی ئیسلامی.

کەواتە چارەسەری بۆ عیراقی ئێستا هەنگاوەکانی پیچەوانەی دروست بون و هۆکارەکانی بە بەلا بونە، چاکترین چارەسەر ئەوەیە تەواوی سەرخانی سایکس پیکۆ و کۆنگرەکانی سان ریمۆ وسیڤەرو لۆزان وبەلینی بەلفۆر هەلوەشێتەوە، دەوڵەتی سروشتی بنیات نریتەوە، بنەمای مافی چارەنووس پیادەبکری، یاخود دروشمە بەناو بانگەکەی شیخ سعید پیادە بکریٚ: یان هیچ میللەتێکی ئیسلامی دەوڵەتی تایبەتی نەبی هەمومان خیلافەت دروست بکەینەوە یان کوردستانیش با دەوڵەتیکی هەبیٚ، ئەگەر هەمو ئەوانە ئاستەم بیت، ئەوا: بۆ ئەوەی لەدەوڵەتیکی وەك عیراقی دروست کراو جاریکی تر دام و دەزگاکان لەسەر بنچینەی ڕێکەوتن لەنێوان پیکهاتەکان دروست بکریتەوە، هەرلایەی ئەرك و مافی خۆی لەدەستور بۆ دیاری بکری، بۆ ئەوەی ئەو پرۆژەیە ببتە زەمانەتێك بۆ

---

[٣٩٣] موسوعه العراق   ص٤١٢

[٣٩٤] بروانە: الإسلام والعلمانیە.. ص٧٢

هەمو لایەك تا دەسەڵات نەبتە تیغ بۆ سەرملی لایەك یان دوولابەدەست لای سێیەم، ئەوا پێویست بە(میساق)و(تەعەهودات)ێك دەكالەنێوان پێكهاتەكانی عێراق، پاساودیاسایی وسیاسی وكۆمەلآیەتی ونیشتمانیەكانیش ئەوانەی خوارەوەن:

١ ـ بۆ ئەوەی بەڕاستی بناغەی دەوڵەتێكی عێراقی هاوچەرخ وئارام ودیموكراس دروست بێت، دەبێ پێگا یاسایە سەرەتاییەكانی تەواو بكا كە بریتیە لە أ ـ یەكێتی گەل (ئەویش بە یەكێتی پێكهاتەكانی نێو عێراق بە هۆی میساقێكی ئاوا دەبێ ببەسترێتەوە بە یاسای نێو دەوڵەتی. ب – یەكێتی هەرێم ئەویش بە پێك هێنان وكۆكردنەوەی هەردوو هەرێمی كوردستان وعێراقی عەرەبی بە هەمان شێوەی (أ) .ج ـ ئینجا دەسەڵاتی سیاسی لەسەر دروست دەكرێ

٢ ـ ئەو(١٠)تەعەهودەی عێراق بە (عصبە)دابووی لە١٩٣٢[٣٩٥] دەبتە هەمان پاساوی یاسایی سەرباری تر وەك لەخالەكانی خوارەوە زیاتر دەردەكەوێ

٣ ـ هەروەك چۆن لەگەل سەرهەڵدانی مەینەتی كورد لە سەرەتای سەدەی بیستەم بۆ یەكەم جار دووچاری پاكتاوی رەگەزی وهاولاتی پلە دوویی وزۆری تر بوو، ئەوا بۆ یەكەم جاریش دووچاری جینۆساید بوویەوە، لە ١٩٦٣ یەكێتی سۆڤیەت بە سكالآیەكی فەرمی داوای لە نەتەوە یەكگرتوەكان كرد كە ئەو جەنگەی ولآتانی عەرەبیو عێراق دژ بەكورد دەیكەن بریتیە لە جینۆساید (رقم E/٣٨٠٩ ٩تموز ١٩٦٣ الجلسة ٣٦، المادة رقم١ في جدول الاعمال، " سياسة حرب الابادة ضد الكرد من قبل الحكومة العراقية" رسالة رئيس بعثة الاتحاد السوفيتي الى الامم المتحدة)، وبەردەوامی جینۆساید[٣٩٦] هەتا لەدوای ڕووخانی بەعسیش بە هۆی تەقینەوەی كۆمەڵ كوژی، بە تایبەتی دژ بە شیعەو كورد و كەمایەتیەكانی تر

٤ ـ واقعی ئێستای عێراق بە تایبەتی لە نێو تەیاری عروبی شۆفینیست زیاتر ئەوپرۆژەیە پێویست دەكا

٥ ـ ئەگەر بە (فەرەزیش)دامانئا ئێستا باشە، ئەگەری بونی ئینقلاب هەیە یان سەركەوتنی لایەك لە توندڕەوان ئەوانی تر دوور دەخاتەوە لەدەسەڵات (هەروەك لیستی

---

[٣٩٥] تەعەهودەكان ژمارەیان ١٠ بوو، لەلایەن لیژنەیەك نوسرایەوە پێك هاتبوو لە: ١- داود حەیدەری - سەرۆك (كورد) ٢-غەیاسەدین نەقشبەندی –جێگر(كورد) ٣-عبدالجبار ئەلتەكەرلی –بڕیاردەر، سەبارەت بە وەرگێرانی عێراق بوو لە عصبە الامم
لە تەعەهودی ژمارە (٩) باسی كوردی تێدایە، لە مادەی (١٠)ش باس پێشێل نەكردنی دەكا ، ئەوتەعەهودانەش لە ١٩/مایس/١٩٣٢ نوسرایەنەوە.

[٣٩٦] جینۆساید كە بەبەبڕیاری ژ:٢٦ی ١٠/٩/ ٢٠٠٨ ئەنجومەنی سەرۆكایەتی كۆماری عێراق وپەرلەمانیش بڕیارپاندا: ئەوەی بەسەر كورد هات جینۆساید بوو بەهەمرو پێوانەیەك .

حدبا بەرامبەر کورد کردوویەتی) دیسان عیراق دەکەوێتەوە ژێر یاساو حوکمی (تاریخ العراق الدموی ).

٦ ـ بە ئەزمون سەلمێنراوە لەنێو هەمو پێکهاتەکان لایەنی توندڕەو بکوژی تێدایە، بۆیە پێویستە میکانیزمێك دابنرێ تا هیچ لایەك وازاڵ نەبێ بەسەر لاکانی تر، هەمو لایەك چاویان لەوە بێت نە زۆردار بن نەزۆرداریشیان لێ بکرێت

٧ ـ لە ڕاستێدا کەم وزۆر حوکمی هەمو لایەك بەسەر هەمو لایەك بینرا، حوکمی سونی بەسەر هەردوولا و وێرانی بوە، حوکمی شیعەش لە دوای ٢٠٠٣ بینرا چاك یان خراپ سونیەکان پێی رازی نەبون، حوکمی کوردیش بینرا بەسەر عەرەب لە کەرکوك وموسل ئەوانیش پێی رازی نەبون...کەواتە هیچ پێکهاتەك بەوی تررازی نیە، ئەوەی نکولی لەو ڕاستیە بکا ئەوە دەیەوێ حوکمێکی دیکتاتۆری تاك ڕەو ی سەدامی پەیڕەوە بکا

٨ ـ بۆ ئەوەی جارێکی تر دەسەڵاتی تاك ڕەوی وشەڕانی لە عێراق دروست نەبێت ببتە هەڕەشە لەسەر ئاشتی نێوخۆو دەرەوە، جارێکی ترعیراق نەکەوێتەوە ژێر باری بەندی (٧).

## کێ ئەو چارەسەریانەی پێ دەکری؟

ئەو چارەسەریە تەنها بۆ کورد نیە، لە ڕاستێدا ئەوە بەشێکە لە چارەسەر وریفۆرمی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، لە قازانجی هەمو لایەکیشدایە، ماوەیەکی دوورو درێژ تەقەلای چارەی تر لەلایەن بەغدا و کوردستان دراوە چارە نەبووە، لەلای بەغدا هەوڵ دراوە شان بەشانی بەکارهێنانی سوپاو تانك و تەیارە گوتاریکی ساویلکانە بەناوی برایەتی کوردو عەرەب و ئێمە هەمو عیراقین هەمو هاولاتیەك مافی یەکسانە... هتدبەکاربهێنێ، ئەو دروشمانە سوایتەوە و خەڵکی کورد زەندەقی لیچووە، چونکە (صدام حسین) زیاتری لەوە دەووت، دەیووت عەرەب یەك مافی هەیە کورد دووجار مافی هەیە!! چونکە جارێك دەنگ بە بەرپرسایەتی عیراقی دەداو جارێکیش دەنگ بە بەرپرسی کوردستانی دەدا، کەچی لەوکاتە بوو کەهەمو کوردستان کۆکرابووە لە ٨٠ – ٩٠ کم و هەموی وێران کرابوو، بۆیە ئەوەی ئێستا ئەو گەلالانە پێش کەش دەکاتەوە و باس لە برایەتی دەکا،

گەلالەکانیش پڕە لەقین و ڕەگەز پەرستی، نکولی لەهەمو مافێکی کورد دەکا، تەنانەت فیدرالیش بەجیاوازی خوازی و دابەش دەزانی، بەشێکی ترکە تارادەیەك میان ڕەون لە نێو عەرەبەکان، باس لەوەدەکەن کە عیراق لەسەر بنچینەی (امە العراقیە) و (چەمکی هاولاتی)و... دوور لە تایفی ورەگەزی دروست بکەینەوە، ئەوە واقیعی نیە چونکە: ١ ـ دابەش سیاسی هەر لەمەر حزب و لایەنەکان نیە، بەلکو کۆمەلگەکەش دابەش بووە لەئەنجامی ئەو ٨٠ ـ ٩٠ سالەی حوکمی عیراقی سەقەت و تایفی و رەگەزی ٢ ـ حکومەتی عیراق و زۆربەی حوکمەتە عەرەبەکان ناشیونالیزمن بەهۆی بونیان بەئەندام لە جامعەی عربی کە لەمادەی (١)ی میساقی جامعەکە داکۆکی لە ناسنامەی عرب بۆ ئەو ولاتانە کراوەتەوە، هەرچەندە ئەو ناسنامەیەش نەبوویتە ئەوەی ئەو ولاتانە ڕۆلی نەتەوەیی ببینن، بەلکو بە پیچەوانە دەبینین زۆربەی هەرە زۆریان دەرد بووینە بۆ کێشەی فلستین و دۆزەکانی تری عەرەب، دروست تر بلێن ئەو ولاتانە لە بنەچە بۆ دژی یەکێتی عەرەب وبۆ پاریزگاری ئیسرائیل دروست بووینە، لەدوا هیرش ئیسرائیلیش بۆ سەر غزە لە (٢٠٠٩) ولاتانی ئوردن و میسرو سعودیە و دەسەلاتی فلستین لایەنگیری ئیسرائیلیان کرد، تائەو ساتەش ئابلوقە خراوەتە سەر فلستین لەلایەن عەرەب خۆی... واتە عروبیەکەی عێراق خزمەتی دۆزی عەرەبی پیّ نەکراوەو بوویتە کێشەش بۆ ناوەخۆی عیراق ٣ ـ ئەو بانگیشەیەی (ئینتمای عیراقیانە بخریتە سەرووی هەمو ئینتمایەکانی تر) بریتی یە لەمانای بون بەدەولەتی نیشتمانی مۆدیرن، ئەوەش بە بریارو دروشم نابیت، متمانەو پرۆسەو گەشەیەکی سروشت و دروستی کۆمەلایەتی و سیاسی و فەرهەنگی و دەستوری پیویستە، ئەوانە نمونە بەولاتانی ئەوروپی دەهینەوە ! عیراق و ولاتانی عەرەبی زۆر دوورن لە ولاتانی ئەرووپا، جگە لەوەی نەتەوەیین ئینجا لەدەستوریش تۆماریان کردووە کە ئەو ولاتە بەشێکە. لە امە العربیە، بۆنمونە عیراق (لەمادەی یەکەمی دەستورەکانی تۆماردەکرا، لەدەستورەکانی میسر، لەسوریا، لبنان، موریتانیا، هەتا لە دەستوری فلستینیش..بەو شێوەیە دەولەت وەرناچەرخێتە دەولەتی نیشتمانی و بنەمای

هاولاتی بونی دەستوری، ڕاستە زۆربەی دەوڵەتانی هاوچەرخ لەسەرەتادا دەوڵەتی نەتەوەیی بون، ئەوانە و (لەئەوروپاش) دوو ڕێبازیان گرتە بەر، یەکەمیان بەرەو زیاتر ناشیونالیزمی و مەرکەزیانە ڕۆیشتن و دەوڵەتی نازی لەئەلمانیا و فاشی لە ئیتالیاو ڤالانژیس لە ئیسپانیای لی دروست بوو، هەرچی دەوڵەتەکانی ترە بەرە و فیدرالی و لا مەرکەزی ڕۆیشتن وەرچەخانە دەوڵەتی نیشتمانی مۆدیرن[397]، ئەو هەنگاوانەش بە ئەزموونیك تیپەرین کەتیایدا نەتەوەی سەردەست دەسەڵاتی قورخ نەکرد، بە کاریشی نەهینا لەدژی نەتەوەو پیکهاتەکانی تر، بۆیە بەرە بەرە بە سروشتی گەشەی خۆی خەڵکی ئینتما ستونیەکانی کال بوویەوە ئینتمای ئاسۆیی و هاولاتی بون و بەرژەوەندی هاوبەش هاتە جێ، لەرۆژ هەلاتی ناوەڕاست و(ولاتانی عەرەبی بەتایبەتی) بەو ئاراستەیە نەبوە، بەڵکو برەو بە ئینتمای عەرەبی و ناسنامەی دەوڵەت دراوە، عروبەیی سەرمەشق بوە، یان وورد تر ئەو عروبیەیان بەرامبەر ئیسرائیل نەکردوە، بەلام بەرامبەر میلەتێکی هەژاری وەك کورد یان میللەتە دۆستەکان بە قڕ کردنەوە کردوە، لەوەشەوە هەرکێشە سەرهەلدەدا لەمەغریب و جزائر لەگەل ئەمازیغەکان، لەسودان لەگەل مسیحی و دارفۆریەکان، لەمیسر لەگەل قبتی، لەکەنداو لەگەل کەمایەتی شیعە، لە یەمەن لەگەل حوسی، لە لبنان لەگەل مسیحی، لەسوریا و عیراق لەگەل کورد، جگە لەوەی ولاتانی عەرەبی لەگەل دراوسێکانیان ناتەبان، لەتورکیاش هەمان کێشە هەست پی دەکری، لەدەستوری تورکیا (ئەنایاسا) لەمادەکانی (٦٤ – ٦٨) سەروەری بەرەگەزی تورك دراوە و بەس، هەرچەندە تارادەیەك دیمکراسیش پەیرەو کراوە، بەلام نەبوویتە چارەسەر مادام رەگەزپەرستی لەنێو هاوکێشەکانی دەسەلات هەبی، تارادەیەك ئیران لەو رووەوە چاکترە، وەك تۆماس بواش دەڵێ لە دوای رووخانی خیلافەت باری کورد لە ئیران چاکتر بوە لە وانی تر[398]، توانیویەتی دەوڵەتەکەی بەرەو نیشتمانی بروا هەرناوی دەوڵەتەکەش(ئیران)ەهەمو

[397] یەکەم هەنگاوی وەچەرخانی نەتەوەیی بەرە و نیشتمانی لەشۆرشی ئەمریکای ١٧٧٦ بەدی دەکری.

[398] تأريخ الأكراد ص٢٠١

پێکهاتەکان دەگرێتەوە، لەدەستوریش سەروەری بەرەگەزی فارس نەدراوە[٣٩٩]، پێکهاتەکانی غەیرە فارسیش دەگریتەوە،... لەو بارەیەوە با دەستوری ئەفغانستانیش وەك نمونە وەرگرین دەبینین ناوی هەمو پێکهاتەکان بەیەکسانی هاتوە(مادە٤:ملت افغانستان عبارت است ازتمام افرادی کەتابعیت افغانستان را دارا باشند، ملت افغانستان متشکل از اقوام پشتون، تاجك، هزارە، ازبك، ترکمن، بلوچ، پشەای، نورستانی، ایماق، عرب، قرغیز، قزلباش، گوجر، براهوی و سایر اقوام میباشد)، تەنانەت لە ولاتێکی وەك مەنگۆلیا(پێکهاتوە لە: ٩٠٪مەنگول، ٤٪کازاخ، ٢٪هان، ٢٪روس، ئاینیش: ٩٠٪ بوزی، ٨٪ مسیحی، ٢٪ موسلمان ) کە بە دواکەوتوو ودابڕاوترین ولاتی جیهان دەژمێررێت، کەچی لەگەل ئەو کەمایەتیانەی لەنێویان دەژین کێشە نیە، چونکە رەگەزپەرستی نەتەوەییان نیە، لە زۆربەی دەستورەکانی جهان وایە، لەدەستوری ئەمریکا نەنوسراوە گەلی ئەمریکا بەشێکە لە میللەتی مەزنی ئەنگلۆ سەکسۆنی...، هەرچی ولاتانی عەرەبی وتورکیایە دوو ولاتی دەگمەنن لەو سەردەمە رەگەزو تایفەیان بەدەستورو یاساو سیاسەتیش کردوە.

لەو سەرەنجامانەوە مەنتیقیە کێشەی نەتەوەیی و تایفی و ئاینی سەرهەلبدا، کەچی ئەگەر بەرگریش لەخۆت بکەیت دەلێن ئەوە پیلانی زایۆنی و ئیمپریالیزمە، جوداخوازیە، تێکدانە، پیلانی دابەشیە...، نالێن لە بەرامبەر ئەو زولمانەی داگیرکەر پشێوی و نائارامی و شۆرش سەری هەلداوە، چارەسەری ئەوانیش یەکسەر تانك و تۆپ بەکار هاتووەو...، لەلای کورد وێرانی و لەلای دەسەلاتیش ئنقلاب و دادگایی و سێدارەی سەرۆکەکانیان کراوە...، کەواتە ئەوە چارەسەر نیە، لەلای کورد بەشیك لەناشیونالیزم ولیبرالی کورد هەر لەژێرخانەوە بەهەلە لە سەرچاوەکانی مەینەتی کورد گەیشتووە، دەستپیکی گوتارەکانی وەك لە پێشوو باسمان کرد ئەوەیە: میللەتی کورد هەزاران سالە

[٣٩٩] ئەگەر چی دەستورەکەیان تەنها دان بەکەمایەتی ئاینی دەنێ نەك کەمایەتی رەگەزی، بەلام هیچ جۆرە سەروەریەك بە رەگەزی فارس نادا، تەنها لە مادەی ١٥ و١٦ باسی فارسی تێدایە ئەویش لەبارەی زمانی فەرمی وولاتە، کە لەپال ئەو زمانە رێدراوە بۆ خوێندن ونوسین وراگەیاندن بۆزمانەکانی تریش.

دچەوسیتەوە، لەشەری چالدیرانی ١٥١٤ ی کوردستان دابەشکراوە، هەر عەرەب زولمی لەئێمە کردووە... هتد، ئەو گۆتانە هەرهەلەی سادە نین، بەلکو بە پێی ئەو تێگەیشتنە کۆمەلێك چارەسەری بەهەلەشی دارشتووە، وەك لە خوارەوە باسیان دەکەین:

١- دیموکراسی بۆ عیراق ئۆتۆنۆمی دوایش بووە فیدرالی بۆ کوردستان، زیاتر لەنیو سەدەیە ئەوە دروشمی بزوتنەوەی رزگاری خوازی کورد بووە، لەناکاو لەدوای سالی ٢٠٠٣ (دروشمەکەی کورد) دیمکراسی هاتەدی، دەرکەوت مالی کورد ویران دەبی لەبەر هۆیەکی زۆر سادە، ئەویش ئەوەیە (وەك خەلەلیکی دیمکراسی) زۆرایەتی کەمایەتی دەبا، با لەسەر هەقیش بن، هەلبەتە کوردیش کەمایەتیە لەنیو پەرلەمان، بەو شێوەیە لەناکاو ئەو دروشمە گۆرا، دروشمی تەوافقی سەری هەلدا، کەکەس پیشووتر گویێ ی لی نەببوو، ئیتر ئەو دروشمە دیرینەی کورد هەلە دەرچوو، هەلەکەش لەوە دیت (دروشمی دیمکراسی بۆ عیراق) زامنکەری نەتەوەیی نیە، چونکە ئەو ئەزمونە لەولاتانی وەك بەریتانیا و ئیسپانیاو فرنساوتورکیا و هند و ئیسرائیل پەیرەو کرابوو، کەچی هەریەکە کێشەی نەتەوەییان لەگەل ئیرلەندا و باسك و کۆرسیکاو کوردستان و کشمیر و فلستین هەیە، جا ئەوە لەولاتانیکی نیشتمانیە، چۆن لە ولاتێکی ستونی وەك عیراق کەپەیرەوەی سیستەمی ناشیونالیزمی دەکریێ دەنگ دان لەسەر بنچینەی ئینتمای ستونی بیت ئەوە مافەکانت دەخوری و دیمکراسیش نابیتە دەرمانی هەمو دەردان وەك لە راپۆرتی سیاسی هەردوو کۆنگرەی (١)، (٢)ی (ی، ن، ك) هاتووە.

٢ ـ پۆلینی دۆست و ناحەزانی بزوتنەوەی کورد: لەسەرەتای سەرەهەلدانی بزوتنەوەی کوردایەتی بالی ئاینی و بالی عەلمانی لێك جیا بووینە لەدەست نیشان کردنی دۆست و ناحەز، بالی عەلمانی زۆر خراپ تیایدا بەهەلەدا چووبوو، ئەوە بوو باسی ئەو کێشەمان کرد لە ئەستەمبۆلّ و ئەنقەرە و هەلویستی هەردوولا و سەرەنجامەکانیشی، دوایی وتا ئەو ساتەش ئەو دوو هەلویستەهەرلێك جیابووە، لەراستێدا عەلمانیەتی کورد تا سالی ١٩٧٦ بەدواوە ئینجا دەسەلاتی شۆرش کوردیان

کەوتە دەست[*]، لەگەل ئەوەی قارەمان بووینە لە هەلگیرسانەوەی شۆرش وجانفیدایی ونەبەزیان دیارە، بەلام سەلبیاتی ترسناکیشیان داهێناوە، ئەو سەلبیاتانە هەلدەبژێرین کەلەگەل ڕەوتی بابەتەکەو وەلامی پرسیارەکانی سەروو بێت، لەوانە:

أ ـ پەرتەوازەیی و شەری برا کوژی ب ـ ئنشقاقی زۆر ج ـ خوویستی و گیرفان پرکردن د ـ پەیدابونی مەلەفداری هـ ـ داڕووخانی کۆملگەی کوردەواری ع ـ زیاد بونی قەبارەی جاشی بە ١٠٠ هێندە ق ـ بی متمانەی نێوان سەرکردایەتی و جەماوەر ك ـ خۆبەستنەوە بە عەلمانیە توندرەوەکانی وەك مارکسیەت و دوایش تەغریبیەکی سەخت، لەسەر ئەو بنچینەیە تیڕاوانینی عەلمانی کورد بۆ جهان کە خۆی زیاتر لەبەیانی دامەزراندنی (یەکیتی نیشتمانی کوردستان) دەنوینیت بەو شیوەی خوارەوەبوو:

أ ـ دۆستەکانی کورد بریتی بون لەیەکیتی سۆڤیت ولاتانی سۆسیالیستی و بزوتنەوەی برولیتاریا و هیزە عەرەبیە پیش کەوتووەکان عەلمانیەکان

ب ـ ناحەزەکانی کورد بریتین لە سیستەمی سەرمایەداری و ولاتانی کۆلۆنیازمی ڕۆژ ئاوایی، لەسەرووی هەمویان ئەمریکا و هیزە کۆنە پەرستەکانی عەرەبی و ئیسرائیل و چینی بەرجوازی و بالی سەرکردایەتی عەشایری ئاینی کورد کەخۆی لەمەلا مستەفا بارزانی دەنوینیت[٤٠]

ج ـ ئەو تێ ڕوانینانە ئەوەندە بەتەوژم بون هەمو لایەنەکانی سەرگۆڕەپانی بزوتنەوەی کوردایەتی گرتەوە، هەتا (پارتی دیموکراتی کوردستان) کە لە مادەی (٥) (٦) ی بەرنامەی کۆنگرەی (٩)ی سالی ١٩٧٩ هەمان ناوەرۆکی سەرووی تۆمار کرد، هەروەها pkk و حسك و کۆمەلەو، حزبی دیمکراتی ئیرانیش لەدروشمی کردنەوەی رادیۆکەیان بەوە بوو: تێ دەکۆشین لە پیناوی هینانەدی کۆمەلگەیەکی سوشیالیستی و رووخانی قەلای سەرمایەداری بەتایبەتی ئیمپریالیزمی ئەمریکا.

د ـ لەچوار چێوەی بەرجەستەکردنی ئەو بیرو رایانە هەریەکە لە (ی، ن، ك) و (پ، د، ك) هاوپەیمانیان لەگەل هیزە ناشیونالیزم و عەلمانیە عەرەبی و فارس و تورکیەکان دەکرد،

---

[*] سەرەتای شۆرشەکان کە لەکۆتایی سەدەی ١٩ دەست پێ دەکا هەم سەرکردەو پەیرەو جەماوەرەکەی ئاینی بور، دوای سەرکردە ئاینی بوو بەلام پەیرەوو حزبەکە عەلمانی بور، تاڕووخانی شۆرشی ئەیلوول لە ١٩٧٥ بەدواوە هەم سەرکردەو هەم شۆرش وحزب هەمووی عەلمانی بوون.

[٤٠] بروانە دقی بەیانی یەکەمی دامەزراندنی (ی ن ك)کە لە ١٩٧٥/٦/١ دەرچووە.

لەباشــور دوو بــەرە لەســالی ١٩٨٠ هاتــە کایــەوە بــەرەی نیــشتمانی نەتــەوەی دیموکراسی(جوقد) کەلە ١٩٨٠/١١/٢ لە دیمەشق دروست بوو، پێك هاتبوو لە: یەکێتی ـ حسك ـ شیوعی ـ بەعسی سەر بە سوریا، یەکێتی لێی بنچینە بوو، بـەرەی دوەم بـەناوی بەرەی نیشتمانی دیموکراسی (جود)یش پێك هاتبوو لە: حسك ـ پ.د.ك ـ شـیوعی لێـی بنچینە بون، ...ئەگـەر پێدابـچین هەرچـەوتی ولـەنگی لـە سـتراتیژیەتی بـاڵی عـەلمانی کوردستان هەر تەواو نابێت، بەشێك پێیان وایە ئەسلەن هەر ستراتیژیەتی نەبوەو نیە.

هەرچی باڵی ئاینیە هەتا دوا قۆناغ دەبینین مەلا مستەفاش (کەسەر بەمەدرەسەی ئاینیە) لەدەست نیشان کردنی دۆست و ناحەز زۆر وورد بووە و زانیویەتی سروشتی دۆستەکانی کورد بریتیە لە دژەکانی: أ ـ سایکس بیکۆ ب ـ وفاقی ئیقلیمی و جهانی ج ـ یاساوپەیوەندی نێودەوڵەتی د ـ وڵاتانی سەر بە ڕۆژ ئاواو ڕۆژ هەلات ف ـ باڵی عەلمانی و ناشیونالیزمی ناوچەکە.. هەرچەندە ئەویش وەك سەرکردەکانی پێشوو هەرتەقەلای لەگەل هێزە گەورەکان داوە بۆ پشتگیری کردن، بەڵام لێیان دلنیانەبووە، لەبەرامبەردا پێ ی وابووە هێزە ئاینی و زانایانی ئاینی و پاریزگاران و هەمو ئەو هیزانەی تەبانین لەگەل لائیکی و نەخشەی سیاسی ڕۆژ هەلاتی ناوەڕاست دۆستن بەڵام ئەو کاتی ئەو هێزانە وەك ئێستا کاریگەر نەبون، لەسەر ئەو بنچینەیە پەیوەندیەکی پتەوی لەگەل زانایانی ئاینی نەجەف و کەربەلا و کازمیە هەبوو، لەنێوانیشاین دا لەگەل محسن الحکیم و الخمینی، هەرئەو پەیوەندیەیە تا ئێستاش کورد سودی لی وەر دەگری، ئەو پەیوەندیەی بارزانی هەر لەگەل زانایانی ئاینی شیعە نەبووە، لەگەل سونیە عەرەبەکانیش هەبووە، نامەی بۆ جمال عبدالناسر نووسی بۆ ئەوەی (سید قوتب) لەسێدارە نەدرێ، ئەو تێڕوانینە وای کردبووڕوولەزانایانی ئاینی کوردستانی بکا تا ئەو ڕادەیە داوای لێ کردون شۆڕشەکە بکرێتە ئیسلامی، بەڵام زیاتر لەگەل زانایانی شیعە گەرم و گورتر بووە، ئەوەش لەبەر ئەوەی:

أ ـ پەیوەندیەكی میژووی كۆن لەنێوان زانایانی ئاینی كوردو شیعە هەر هەبووە لەنێوان شیخ محمود و ا. شیرازی و مهدی خالسی..، دوای لەكەربەلا لەنێوان بكر سدقی و (ا كاشف الغطاء) [٤٠١] ئینجالەنێوان بارزانی و محسن الحكیم

ب ـ عەلمانیەت و عروبیەت لەنیو ئەوانە كەمترجێ ی دەبودوە

ج ـ ئەوانە زیاتر پابەند بون بەرەگ و ریشەی ئاین بەرێگەی خۆیان ،دوور بون لە دەمارگیری عروبی و(محیط العربی،حاضنة العربیة..)هاوپەیمانە عربیەكانی تری وەك جامیعەی عربی

د ـ لەوەتەی كورد دووچاری مەینەت بووینە بۆ تۆزقالیكیش لەسەردەستی ئەوان زیان نەهاتوە، بە پێچەوانە وە زیاتر ئەو مەینەتیە لەو ناوچانە بۆ كورد هاتووەكە(بەسوننە ناوزەد دەكرین)، سەرەرای ئەوەش بەشیكی زۆر لەزانایانی ئاینی و بزوتنەوە ئیسلامیەكانی سوننە تارادەیەك كەوتونەتە ژیر كاریگەری تەیاری عروبی، كە بۆ كورد مال ویرانی بووە، تائەو ساتەش لەلایەن حزبە ئیسلامیە شیعەكان و زانایانی ئاینی ئەوان تیگەیشتن بۆ دۆزی كورد و كوردستانیش هەیە، بەلام بەشی زۆری سوننە ئەو تیگەیشتنەیان نیەو وادەزانن (یان وابرپیارپیان داوە)دۆزی كورددروست كراوی ئیسرائیل وئەمریكایەیان جیاخوازیە وئەوەی سەدام بەسەر كوردی هێنا پاساوی هەیە، بەشێكی زۆر لەوان هێشتا بە چاوێكی سوكی موالیانە تەماشای كوردو هەتا زانایانی ئاینی كوردیش دەكاو خۆی بە ئەفزەل وشایستە تر بۆ سەركردایەتی دەزانی وكوردیش بۆ پلە دوو و تەنها گوێڕاگرتن، چەندین جاریش لە نێو ئەوانە فتوادژ بەومیلەتە هەژارە دراود هەرەدواییەكەی ئەو زنجیرە فتوایانەی مانگی ٢٠١١/١ هتد، لەبەر ئەو هۆیانە پەیوەندی بارزانی لەگەل لایەنی شیعە زەق تر بووە، بەگشتی لەنیو ئیسلامی و زانایانی ئاینی عەرەب و غەیرە عەرەب یان چاكەیان هەبووە بۆ كورد یان بی زیان بووینە، بەپێچەوانەوە هەرچی بەسەر كورد هاتووە لەسەردەستی عەلمانی و عروبی و تۆرانی بووە كە مدرسەی دژ بەئیسلامن.

---

[٤٠١] بروانە:العراق فی مذكرات الدیبلوماسین الأجانب –بەتایبەتی بەشی:مذكرات (فریتز غروبا)ی‌مەندوبی ئەلمانیا لە عیراق ص٩٢-

کەواتە بەکورتی دەتوانین بلێین بارزانی و سەرکردە ئاینیەکان بزوتنەوەی ئیسلامی ومەرجەع وقوتب ومدرسە ئاینیەکانیان بەدۆست پۆلین کردووە، هەرچەندە بەردەوامیش بووینە لەتاقی کردنەوەی لایەکانی ترلەسەر ئاستی ناوەکی و ئیقلیمی و جهانیش، وەنەبێ ئەوتێڕوانینەیان وای کردبێ هەردەم لەدەرگای ولآتانی زلهێزانیان نەدابێ، بەردەوام گەلالەونامەی ئەوسەرکردانە بەرەو ڕۆژ ئاواو ڕۆژهەلات وولآتی ناوچەکە چووە[٤٠٢]، بەلآم بەشی زۆری سەرکەوتوو نەبووە

لەودی سەروو توانیمان پرسەکە لە بزری ومێژووییەوە بهێنینەوە پێش چاو، کەواتە ئێستا وەلآمی پرسیارەکەی سەروو بەسانایی دەدرێتەوە بەو پرسیارە واقعیەی بارودۆخی ئێستا، بابزانین ئەو دەستکەوتانەی ئێستا لەبونی فیدرالی لەدەستورو مادەی ١٤٠ و سەرۆك کۆماری کوردو بودجەی لە ١٧٪... لەکام لای ئەو لایەنانەی خوارەوەیە: دانایی و زانایی سەرکردایەتی کورد، ئەمریکاو ڕۆژ ئاوا، هیزە عەلمانی و پیش کەوتن خوازەکانی وەك ئەیاد علاوی سالح موتلەگ ئوسامە نجیفی احمد چلبی و.... یاخودلە هیزە ئیسلامیەکان مجلس الاعلی حزبی دعوە حزبی ئیسلامی...، وەلەنیو پیکهاتە کانیش لەکامە هاتووە: شیعە سوننە تورکمان.... وەلآمی ئەو پرسیارە دەروازەی دارشتنی ستراتیژیك دەنوینیت کە بزرە لەلایەن سەرکردایەتی کوردەوە، بۆیە لەسەر هەریەکەیان هەلوەستەیەکی یەك بەیەکە دەکەین تا بەجوانی روون بیتەوە:

یەکەم ـ دانایی و زانایی سەرکردایەتی کورد: بێ گومان سەرکردایەتی شۆرش قارەمان ونەبەزبووینە، پیش مەرگە بووینە لەو شاخە، بەلآم ئەوە ڕێ نابێ لەوە بگرێ هەلسەنگاندنی کارودانابیەکانیان بکەین، لەودوپێشووباسمان کرد کە سەرکردایەتی تازەی کورد زیاتر تێڕوانینەکانی عەلمانیە، هەرلەسەر ئەو بنچینەیەش هەلس وکەوت نەخشەو پلان وستراتیجیەکانیان دارشتوە، بەکورتی ئەو خالآنەی خوارەوە دەری دەخا کە سەرکردایەتی کورد دانا نەبوەلە هێنانەدی ئامانجە ستراتیژیەکان وئەو بەرەنجامە چاکەی بۆ کوردستان هاتەوە:

---

[٤٠٢] هەمو سەرکردەکان هەر لەشێخ عبیداللە تامەلا مستەفاو سەرکردەکانی نیستا هیچ هێزو کاربەدەستێکی جیهانی نەبوە سکالای خۆیان بۆ نەبردبێ، لەو ڕوەوە کەمترشێخ سعیدی پیران ئەو ئاڕستەیەی گرتۆتە بەر

١ ـ له هەڵبژاردنی دۆست ودوژمــن، ئــەمریکای بەسەرســەخت تــرین دوژمــن پــۆلین کرابوو، کەچی ئێستا لە سایەی ئەو دەڵێن ئەو بارە چاکە بــۆ کــورد هــاتوه، بــە هــەمان شێوە لە رووی لایەنە عربی وچینایەتی ومەدرەسەی فکریشەوە زۆربەی نەك بە هەلە دا چووینە بەڵکو پێچەوانە بوە، ئەوەی خوارەوە لیستێکە لەو هەلوێستە پــیــچەوانەکانیان[٤٠٣]

٢ ـ لە گەرمەی جەنگی عیراق ئیران دانوستان لەگەل عیراق کرا ویارمەتی ئەو درا لەو جەنگە سەرکەوتوو بێت وسەریشکەوت یەکسەر ئەنفال وکیمیایی پێشکەش کردن.

٣ ـ لەگەرمەی نارەزایی جیهانی دژ بە بەعس لە ١٩٩١ دیسان دانوستانیان لەگەلی ئەنجام دا، لەسەر ئەو بنچینەیەی گوایە کێشەی کورد لەجیهان بە کێشەیەکی مرۆڤایەتی سەیر دەکرێت نەك سیاسی(بەتایبەتی سەرۆك مسعود بارزانی ئەو بانگێشەیەی دەکرد)،

[٤٠٣] نەوە لیستی هەڵوێستەکانی حزبەکوردستانیەکانە کە پێچەوانە دەرچوە ئیــستا

| پێش ڕووخانی شیوعیەت- ١٩٩٠ | دوای ڕووخانی شیوعیەت |
|---|---|
| ١- دژی دیموکراسی، مافی مرۆڤ، کۆمەڵگەی مەدەنی، ئازادی، هەڵبژاردن بوون بە ئاشکرا و لە نووسینەکانیاندا. | ١- زۆر جەخت لە دیموکراسی و مافی مرۆڤ و کۆمەڵگەی مەدەنی و ئازادی و هەڵبژاردنن لە نووسین و ئاخافتندا. |
| ٢- ئیسلام ئاینی میالی یە و گەڕانەوە بوو بۆ (قرون الوسطی) | ٢- بە گفتە بانگێشەی ئیسلامی دەکەن، نابێت لە سەنگەری کوردایەتی جیابێتەوە، زیاتر گۆتمیە نەك کردەوە. |
| ٣- لایەنگری شیوعیەت، دیکتاتۆریەت، بەرەی ڕزگاری و سۆشیالیستی جیهانی بوون. | ٣- دژی دیکتاتۆرین، دژی شیوعیەت و هەتا بەرەی ڕزگاریشن. |
| ٤- نەتەوایەتی، رەسەنایەتی، بەهاو نەریت بە ڕەجعیەت حساب بوو (کوردایەتی شەرمەزاریە) دروشم بوو لەسەر دیواردکان دەنوسرا.سرودی (ئەی رەقیب)یش گۆڕا بۆ سرودی ئنتر ناشیونال | ٤- زیاد لەپێویست نەتەوەیین و کوردایەتی شەرەفە. |
| ٥- لایەنگیری مافی گەلان بوون. | ٥- تووتیانەدیلێنەوەبە تیرۆر و ئاپاسایی باسیان دەکەن. |
| ٦- دژی ڕۆژئاواو ئەمریکا بوون بە هەموو ئاڕاستەیەك. | ٦- بەو خەستیە پێچەوانەیە لایەنگیری ڕۆژئاوان سەرمەشقی ئەزمونەکانیشیانە. |
| ٧- ئاغە و شێخ و دەرەبەگ و سەرەك خێڵ بەرەی ڕەجعیەت بوون. | ٧- بەبنەماڵەی ئەجیب زادە(پیاو ماقوول)حسابن دەسەڵاتیان دراودتێ. |
| ٨- هەر زانایانی ئاینی هۆی شکست بووینە بوکورد | ٨- هەمووحزبێك لقێکی(یەکێتی زانایان)ی هەیە. |
| ٩- مواسەفاتی پێشمەرگە:دەست و دەم و داوێن پاك، مەبدەئی، (چەکی بێ بیروباوەڕ سێدارەی جەماوەرە)یان پەیرەو دەکرد | ٩- مواسەفاتی ئێستای پێچەوانەیە. |
| ١٠- حزبایەتی ئامرازە، ئامانجیش سۆشیالیزمە. | ١٠- حزبایەتی ئامانجەوئامرازیش کوردایەتیشە. |
| ١١- لە گەرمەی چەپ گەری لایەنە سەلبیەکانی شیوعیەتیان بۆ دەهێنایین نەك ئیجابیەکانی. | ١١- ئێستاش لەجیاتی لاسایی دیموکراسی ڕۆژئاوا و تەکنەلۆجیاکەی تەنها لیبرالیەتی کۆمەڵایەتیەکەی ڕۆژئاوامان بۆ دێنن کە لایەنە سلبیاتیانە. |
| ١٢- زۆر ئایدیۆلۆجیایی بوون نەك مادیانە. | ١٢- زۆر مادیانەن و بی ئایدیۆلۆجیا و بنەمان. |
| ١٣- بەرژەوەندی گشتی لەسەرووی بەرژەوەندی تایبەتی بوو. | ١٣- بەرژەوەندی تایبەتی لە سەرووی گشتیە بە هەموو ئاڕاستەیەك. |
| ١٤- ئەندام و لایەنگریان وشیار و لەخۆبوردوو پلەی بەرگری بەهێز بوو، وڵات پەروەر و پارێز بوو. | ١٤- ئەندام و لایەنگرانی ناوشیار و لەرزۆك و خۆویستن بێئیرادە و بێورە و بێ نیشتمان. |

کەچی دەبینین لە هەمان کات بود برِیارِی ٦٨٨ی یاسایی بۆکوردستان دەرچوو، لە ١٩٩١/٣/٢٠ ئەنجومەنی نوێنەران بەناوی (ولاَتێك بۆ کوردان)تاوتویَ دەکرا[٤٠٤] چ لەوانە یاسایی و سیاسی تر هەیە

٤ ـ تێروانی ستراتیژیەتی عەلمانی نیشتمانپەروەری کورد لە سەرەتادا هەر لەنگ بوە، لەگەل ئەتاتورك وسولتان، لەگەل رِۆژ هەلاَت ورِۆژئاوا، لەگەل ئاینیەکان وناشیۆنالیزمەکان، ...تەنانەت دەتوانین بلێین لە عێراق لەو کاتە بەیەکجاری ناشیۆنالیزمی عەرەبی سونی عیراق دەستیان بەسەر دەولەت داگرت کە سەرۆك ئەرکان(بکر صدقی)ی کورد لە پێش ١٩٣٦ئەو هەلەیەی کرد چوو زۆر بە توندی لە ئاسوری دا، ئینجالاَی سونی وعەلمانیە عروبیەکانی گرت وگورزی کوشندەی لە بەرگری شیعەکان لە ناوچەی فورات وەشاند

٤ـ زۆربەی ئەو دروشم وداخوازی وپلانانەی سەرکردایەتی کورد هەلیدەگریَ ئەگەر بهاتبایەدی مالی کورد وێران دەبوو، وەك سەرکەوتنی سشیالیستی ودیکتاتۆری پرۆلیتاری و هێزە پیشکەوتوو ولائیکیە عەرەب وتورك وفارس ...کە ئێستا دەیان بینین دژی خواستی کوردن، بەنمونە(پ د ك) داوای دەکرد عیراق لەهاوپەیمانیەکانی لەگەل رِۆژئاوا بێتەدەر هەروەك لەبەیانی١٩٥٨/٧/١٤بلاَوی کردبۆوە، هەر لەوبەیانی خۆشحالبوو بەگۆرِینی مەلەکیەت بۆ کۆماری، پشتی حزبی بەعسی گرت لە ئینقلابەکەی دژ بە عبدالکريم قاسم، هەمو ئەوانە لەرِووی ستراتیج هەلەن، یەکەم کەس کە هەستی بەو هەلە ستراتیژیانە کرد مەلا مستەفا بوو ووتی هەلەمان کرد ئێمە عبدالکريمان ماندوو کردو بەعسیش بە ئاسانی راوی کرد.

٥ ـ سەبارەت بە خالی (٤) ئەگەر بەووردتر بۆی بچین دەبینین ئەوەی لە قازانجی کوردە، لەدەرەوەی نەخشەو پلانی کورد بوە، ئەوەی چاکەشی بۆ کورد کردوەو بەشێك لەو واقیعە ئیجابیەی بۆ هێنانینە دی بەدەر بوە لە نەخشەی هاوپەیمانی لەگەل سەرکردایەتی کورد، یان لە ئەرشیفیان بە پیاو خراپ تۆمار کرابوو، نمونەیەکی لەسەروو دەهێنینەوە:لەکاتێکا زۆربەی تەعمیرەکانی کوردستانی سەروو لەسەر دەستی

---

[٤٠٤] کوردو کوردستان لە بەلگەنامەی ئەمریکی ل٣٦٨

ئیسلامیەکان بوەو بەهۆی پەیرەوی میانرەوانە سەبارەت بەکورد حزبی رەفاه لەناوەراستی نەوەتەکان خسترا لەلایەن سوپا، کەچی یەکراییەکی سەرکردایەتی کوردی سەروو وخواروو هەبوو تا دەنگ بدەنە مسعود یەلماس وحزبەکەی نەك ئەربکان، ئێستا هەلەی ئەو هەنگاوە ستراتیژیە روون تر دەرکەوتوە کە بەراورد لەنێوان ئیسلامی تورك ولائیکی تۆرانی تورك سەبارەت بەکورد دەبینرێ.

٦ ـ پێشوو تریش باسمان کرد ئەوانەی لەعێراقیش بەدۆست هەژمار کران وبەرەیان لەگەل کردنەوە، دۆست دەرنەچوون ئەوانەی لە لیستی رەشی کوردی بوو چاکتر دەرچوو، هەر بە نمونە: لەزانیارە نهێنیەکانی پۆل بریمەرکە دوای بەناوی (ئەوەی بریمەر یاداشتی نەکردوە لە کتێبەك لە لایەن سکرتێرەکەی نوسراوە) لە ل١٢٦ هاتوە: بارزانی رقی لە چەلەبی وئال الحکیم، محسن عبدالحمید، جەعفەری دەبۆوە، دڵخۆشیش بوو بەعەلاوی، پاچەچی، جادرچی* ...کەچی دەرکەوت ئەوەی جێی رق لێبونەوە بوو ئەوان چاکترن لەوانەی پێیان دڵخۆشن!.

٧ ـ لە دوای ١٩٩٠ و سیستەمی نوێی جیهانی وفۆرمات بونەوەی جیهان لەدوای هەلوەشانەوەی سۆڤیەت میلەتانێکی زۆر رزگاریان بوو، دوای چوار میلەتی تر کەوتنە رێ بۆ رزگاری (کورد، فلستین، تەیمور، کۆسۆڤا) ئەو دوەی یەکەم لەبەر گەندەلی وخەریك نەبون بە ئەسلی کێشە رەواکە بە جێمان دوەکەی دوای بونە دەولەت، هەر بەنمونە لەو کاتەی کەپێشنیاری (ولاتێك بۆکورد) لە ١٩٩١/٣/٢٠ لەلایەن ئەنجومەنی نوێنەرانی ئەمریکا تاوتوێ دەکرا، زۆربەی سەرکردایەتی کورد بە ئاودیو کردنی کەل وپەل وبەمنافسەویەکتر نەخوێندنەوە سەرقال بوو.

٨ ـ لایەنی عەلمانی کورد لەسەرەتادا بناغەیەکی چەوتی بۆ کوردایەتی وێنە کرد، کورد گیرۆدەی دەستی عەلمانی وئیتحادولتەرەقی وکەمالی بون، کەچی ئەوان سەرسام بون بەمەدرەسەکانی ئەوان، ئەوەتە سەرچاوەی هەمو حزبە کوردستانیەکانی(عەلمانی) بۆ (پ د ك)دەگەرێتەوە، ئەویش بۆ (هیوا)، هیواش بۆ(حزبی دارکەر) بە سەرۆکایەتی رفیق

---

* عدنان پاچەچی لەشەستەکان وەزیری دەرەو بوو دژ بەکورد بوو ورۆلێکی گرنگی بینی لە هێنانی سوپای سوریا بۆ سەر کوردستان - بروانە پاشکۆی ژ: ٤ سکالای سۆڤیەت، بەلام دەتوانین بلێین (کامیل جادرچی) هەلوێستی بەرامبەر کورد باش بوو ، پێش شۆرشی ١٩٥٨یەکەم حزب (پارتی نیشتمانی دیموکراس- بەسەرۆکایەتی کامیل جادرچی) دانی هێنابوو بە شریکایەتی کوردو عەروەب لەو عیراقە .

حلمی، با بزانین ناسنامەی ئەو حزبە لە کێ ساغ دەبتەوە؟ دارکەر کت ومت کۆپی (کاربۆناری) ئیتالیایە کە (ئیتحادولتەرەقی) دژ بەکوردی لەتورکیا هێنا ئارایەوە، چ لەوە چەوت تر هەلسیت موعجیب بیت بە دوژمنت ولاسایی داگیرکەرت بکەیتەوە.

٨ - زۆر خالی تر هەیە لەبارەی ناوەخۆو شەری برا کوژی[٤٠٥] وپیادەکردنی عەلمانیەت وتا دەگاتە دەرەوەو پرسی دەستور ورێکەوتنامەکە لەگەل ئەمریکا ودەرچوون لەبەندی ٧و ناکۆکیەکانی سونە وشیعەو ستراتیجیان لە ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست ...زۆربەی هەرە زۆری لایەنگری ئەو بۆچوونە دەکا کە ئەو دەسکەوتانەی بۆ کوردستان هاتە دی لە دانایی وزانایی سەرکردایەتی کورد نیە

دوەم - ئەمریکاو ڕۆژ ئاوا: لەڕاستێدا ئەمریکا بەپێی بنەمای مۆنرو(١٨١٧ - ١٨٢٥) کەمترخۆی لەکێشەکانی جهان دەگلاند، لەدوای سالانی١٩١٧ڕاستەوخۆ تر هاتە نێو کێشەکان، پێش ئەو بەرواره تائێستا بەلگەنامەیەکی ڕوونمان نەدۆزیتەوە تیایدا جۆرێك لە پەیوەندی کورد و ئەمریکا گوزارش بکا.

لەپیشتر باسمان کرد کە ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست بە کوردستانیشەوە بەپێی هەردوو بەرژەوەندی ئیمپریالیزمی و ئیسرائیلی دابەشکراوە، سنوری ئەودەوڵەتانەی وەك عیراق وئوردەن وسوریاش ..بەوتەرازوە هەستیارە دانراوە، بۆیە دەست کاری کردنی زۆر سەختە هەرودك لە هەردوو بنەمای ئایزنهاوەری١٩٥٧وبنەمای (عدم المس بالإرث الاستعماری) دەردەکەوی، ئەوانە نەبونە یارمەتیدەری دۆزی کورد، بەلام بنەمایەکی تر هەیە ڕەنگە تارادەیەك ببێتە یارمەتی، ئەویش ئەوەیە خودی ئەمریکا لەڕێکەوتنەکانی سایکس بیکۆ و سەرەنجامەکانی لەدابەش کردنی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست و ئینتدابا بەشدارنەبووە، بەریتانیا و فرنسا هەولیان دا چاوی بنوسێنن و ئەرمینیای پی بدەن وەك ئینتداب، بەلام دوای ئەمریکا بۆی دەرکەوت ئەوە فێلی لێ دەکەن، دەیانەوێ بیکەنە سەنگەر لەپیش بزوتنەوەی بەلشەفی شیوعی لەسەردەمی لینین و روسیا، ئەمریکا لەدژی ئەوهەنگاوانەی

---

[٤٠٥] لە بەلگەنامەی ئەمریکی –گفت وگۆ لەگەل دیڤید وێلشی جیگری وەزیری دەرەوە لە١٥/١٠/١٩٩٨ دەلێت:شەڕی براکوژی پارتی ویەکێتی وهاوپەیمانی کردنیان لەگەل عیراق وئیران خەریك بور ئەزمونی کوردستان تێك بداو نەتەوە یەکگرتوەکان وخودی ئەمریکاش دەستیان لێ هەلکرێ –کوردو کوردستان لە بەلگەنامەی ئەمریکی ل٧٦٤

[٥] ئاماژە بەو نامەیەی جیمس مۆنرۆی چوارەمین سەر کۆماری ئەمریکا بۆ کۆنگریسی نارد داوای کرد کە ئەوەندە ئەمریکا لەکیشەو گۆبەندەکانی ئەوروپا نەگلینی.

بەریتانی وهاوپەیمانان وەستا، لەسالی١٩١٨لەلایەن ویلسۆنی سەرۆکیەوە ١٤بنەماکەی بۆ ئەو مەبەستە بلاوکردەوە، لەدوای سالی ١٩١٩لیژنەی (کنگ ـ کراینی) بۆ ناوچەی رۆژهەلاتی ناوەڕاست نارد وداوای (سیاسە الباب المفتوح)کرد، پێشنیاریشی کرد هەمو ئەو ناوچانەی لە عوسمانی جیاکراوە بخرێتە سەر مومتەلەکاتی (عصبە الامم)، یەکەم پەیوەندی کوردو ئەمریکالەو لیژنەیە بەدی دەکرێ کە هاتبون لەکوردستان لەگەل نوێنەرانی کورد دانیشتبون، لەو کاتیەوە تا نیوەی سەدەی بیستەم رۆلێکی وای لەناوچەکە نەبوەو لەگەل کوردیش بەو شێوەیە نەبوە، لەو کاتیەوە دەتوانین بلێین بوە میراتگری بەریتانیا لەناوچەکە، تاکۆتایی سەدەی بیستەم و رووخانی یەکێتی سۆڤیەت(واتە لە نێوان جەنگی سارد) هەلوێستی ئەمریکا (وەك لەبەلگەنامەنهێنی وئاشکراکان دەردەکەوێ)نەیویستوەخۆ لەکێشەی کورد بگلێنی وزیاتر بنەماکانی ئیستعماری وسایکس پیکۆی لەناوچەکە پیادەکردوە، لەهەمو بەلگەنامەو چالاکیە دیپلۆماسیە ڕاستەوخۆ وناڕاستەوخۆکان دەرکەوتوە: هەرگیز نەگەیشتە ئەو رادەیەی قەناعەتی ئەمریکا بێت کە میللەتی کورد شایستەی مافی چارەنوسە، بەلام کەدەکەوێتە لێواری دۆزەخ بەهانات دێت، دەرت دێنێت لە دۆزەخ بەلام ناتخاتە بەهەشت، ئەو جۆرە سیاسەتەو تێنەگەیشتنی کورد لێی شکستی ١٩٧٥ی لێ هاتە دی، یەکەم گۆڕانکاری بەسەر سیاسەتی ئەمریکا سەبارەت بەکورد لەدوای سالی ١٩٧٩ لەدوای سەرکەوتنی شۆرشی ئیران بەسەرۆکایەتی أ خمینی دێت، کەشا رووخا تارادەیەك کوردکەوتە نێو حیساباتی ستراتیژی، دوای ئەوەی ئیسلامیەکان لە تورکیاش سەرکەوتن ولەسالی ٢٠٠٣نەبونە یارمەتیدەری هێزەکانی ئەمریکا لە کاتی هێرشیان بۆسەر عێراق جارێکی تر تەکانێك بە پەیوەندی کوردو ئەمریکا درابۆ ئاستێکی بەرز، لەگەل ڕووخانی بەعس لە عێراق وگەیشتنە دەسەلاتی ئیسلامیەکان لەعێراق دووبارە تەکانێکی گەورەتربەوپەیوەندیە درا، کەواتە ئەو پەیوەندیە بۆ کورد لە دۆڕاندنی دۆستی فەرمی ئەمریکا هاتوە، واتە دەست بەکاربونی مەدرەسەیەکی ناتەبا لەگەل ئەمریکا وای کردوە ئەو پەیوەندیە دروست بێت، لە ٢٠٠٢ەوە دروشمی جەنگی (یان لەگەلی یان دژمی )لەلایەن ج بۆشەوە جاڕدرا، شکستیەکانی لە ئەفغانستان و لە عیراق و مانەوەی دەولەتی ئیران وەك خۆی بوە هۆی شکستی ئەمریکاوهاتنی ئۆباما، ئیتر واز لەو هەنگاوە هینرا، ئەگینابەردەوامی لەو

سیاسەتە چەوتەی ئەمریکا لەقازانجی کورد بوو، مادام تێکدانی نەخشەی سیاسی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بوو .، واتە: ١ ـ پەیوەندی کوردو ئەمریکا سروشتی نیە، لەو کاتانە سوودمەند دەبێ کە دۆخی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست ناسروشتیە، ستاندەر بونەوەی مەترسێدارەبۆکورد، ڕەنگە هەتا سەری نەبێ ٢ ـ بونی ئەو هێزە ئیسلامیانە بوویتە هۆی ئەو پەیوەندیەو جەژنی بزوتنەوەی کوردایەتیە ٣ ـ ئەمریکا چاکەی لەگەڵ کورد کردوە بە ڕووخاندنی بەعس ولادان لەو ستراتیژەی نزیکەی سەدەیەك بوو ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستی بەستبۆوە.

لەوەی سەروو دەردەکەوێ ئەمریکا نایەت کوردستانت بۆ رزگار بکا، سێبەرێکی گشتیت بۆ دروست دەکا ئەگەر بەرنامەت ووردو زانستی بێت ئەوا سودمەند دەبی، ئەگینا پێچەوانە دەبێت، لەسەر ئەو بنچینەیە سەرەنجامێکی مەنتیقیە کە ئەمریکابگەڕێتەوە سەر پەیوەندی خۆیی و وڵاتانی ناوچەکە، ئەوەش زیاتر بەوە دەبێ ئەگەر (عیراق وتورکیا وئیران) لەو بنەما ئیسلامیانەیان هەلگەڕێنەوە یان بدۆڕێنن

هەروەك بینیمان لەڕووخانی بەعس ئەمریکا چاکەی پێشکەشی هەمولایەك کرد(میلەتانی عیراق، کویت، تەنانەت بۆ ئێران وقاعیدەش سودیان لە رووخانی صدام بینی)، بەڵام چاکەکەی تەواو نەکرد لەگەڵ کورد، هەربۆیەش لەو فەترەیەی کە ڕاستەوخۆ خۆی حوکمی عیراقی کرد(گارنەر وبریمەر)، یاخود لەڕێ ی دۆستەکانی، کەیەکەم سەرۆك کۆمار غازی یاوەر و سەرۆك وەزیران ئەیاد علاوی کێشەکانی کوردی چارەسەر دەکرد، بەپیچەوانەوە هیچ دەستکەوتیك لەوانەی سەروو بۆکورد لەو دوو فەترەیە نەهاتەدی، بەڵکو لەدواتر هاتەدی، لەڕاستیدا بنەچەی کێشەی مادەی١٤٠لە بڕیارِی دژە فڕینی سەرووی هێلی٣٦ دێت، هەرچەندە ئەوکاتی پیاوەتیەکی گەورە بوو لەگەڵ کوردستانیان کرا، بەڵام ڕاستیەکەی سەرووی هێلی ٣٤بوایە ئەو کێشەیە ئێستا نەدەبوو، بۆیە ئەمریکاو ڕۆژ ئاوا خاوەنی ئەو دەستکەوتانەی ئێستا نین بۆ کورد.

سێیەم ـ هیزە عەلمانی و پیش کەوتن خوازەکان: پیش تر لەسەر هەرسێ ئاستی ناوەکی وئیقلیمی و جهانی باسی رەوت و هەلسوکەوتی عەلمانیمان کرد، لەگەڵ هەلوێستەکانیان سەبارەت بە کوردستان، دەرکەوت سەرکردە ئاینیەکانی کورد لەو بابەتە باش تێگەیشتبون، بۆیە کەمتر روویان لەو هیزە بووە، بەڵام لە قوناغی نوێ ی

بزوتنەوەی کورد کە لەدوای ١٩٧٦ دەست پی دەکا ئەو تێگە یشتنانە پیچەوانە بووینەوە، سەرکردایەتی عەلمانی کوردی هاوچەرخ پاگندەی ئەوەی دەکرد کە هێزە عەلمانی و پیش کەوتن خوازەکان دۆستی کوردن، هەروەك لەبەیانی دامەزرندنی (ی — ن — ك) و ئەدەبیاتی هەمولایەك بەردەوام دووبارە بوویتەوە، هەر لەسەر ئەو بنچینەیەش ئەو (بەرەنیشتمانیانە)ی ڕادەگەیەنرا لەگەل هێزە عەلمانیەکان بووینە، کەچی ئەگەر بەووردی سەرنج بدەین دەبینین جگە لەوەی چی بەسەر کورد هێنرا عەلمانی بەرپرسیار بوو ئەوا بەردەوامی مەینەتیەکەش هەرلە ئەستۆی ئەو دایە، ئەوەتا: داگیر و دابەش کورد، سەرکوتی شۆرشەکان، ڤاکتەرەکانی مانەوەی داگیر کەرو پالپشتی داگیر کەر، ئینجا پرۆسەکانی تەعریب ئەنفال کیمیایی ویرانی... هەر هەموی لەئەستۆی ئەوانەیە، تەنانەت ئەو هیزە عەلمانی و مەدەنی و پێش کەوتن خوازانەی دووریش بووینە ئەوا بە ڕاگەیانراو نووسین لایەنگیری ئەو زولمەیان کردووە دژ بە کورد، لەدوای ڕووخانی حزبی بەعسی لە ٢٠٠٣ و دامەزراندنەوەی حکومەتێکی نویێ لە عیراق ئەو پرۆسەیە بە زەق تر کەوتە بەرچاوی میللەتی کورد، دەرکەوت چەندە سەرکردایەتی هاوچەرخی کورد لەو تێڕوانین و پۆلین کردنە بەهەلەدا چووە، هەروەك چۆن (ڤۆلتێر ) شانۆگەریەکی پێچەوانەی (باو)ی کرد تیایدا پیاوە ئاینیەکانی مسیحی چوونە دۆزەخ ئەوانی تر چوونە بەهەشت، لە عیراقیش رێك وا پیچەوانە دەرچوو، هەرچی سەرکردایەتی کورد بە دۆستی پۆلین کردبوو دژ دەرچوو، ئەوەی فەرامۆشیش کرابوو هیزە ئیسلامیەکان بوو کەچی ئەوانە دۆست دەرچوو، باش ترین بەڵگەی ژمێریاری تریش بریتیە لە هەڵبژاردنی مام جلال بەسەرۆك کۆمار وەك یەکەم جار لەمێژووی عیراقی لە١٢/٤/٢٠٠٥ڕێك ئەو نەخشەیە دەردەخا، کە بەو شێوەیە بوو: بەهۆی ئەو هاوپەیمانیەتیەی کورد لەگەل لایەنە ئیسلامیەکانی عیراقی (حزبی دەعوە و مجلس الاعلی..)بە کۆی٢٢٧ دەنگ بەرامبەر ٣٠ دەنگی دژو ١٧دەنگیش غائب مام جلال بوە سەرۆك کۆمار، زۆری ئیسلامیەکانی عەرەب دەنگی (بەلێ)یان دا مام جلال، ئەو ٣٠ دەنگە دژدش زۆربەی عەلمانیە عەرەبەکان بوو، هەلبەتە لەژێر سایەی عروبی عەلمانی وئەمریکی هەرگیز سەرکۆماری کوردت نەدەبینی بۆ عیراق هەروەك لە نارەزاییە بەناوبانگەکەی تاریق هاشمی ئەو ڕاستیە گوزارش کراو وتی: عێراق دەوڵەتێکی عەرەبیە نابێ سەرکۆماری کورد بێت، هەر بەو پالنەرەش (بکر

سدقی)له١١/٨/ ١٩٣٧تیرۆر کرا له ژێر دروشمی عیراقی عەرەبی نابێت کورد حوکمی بکا[٤٠٦].دوایش بەروون تر دەرکەوت هیزە عەلمانی و مەدەنی و ناشیونالیزمی عەرەبی و تورکمانی نەك هەر دۆست نین، بەڵکو تەنها بەوە قایلن کە کوردستان ژێر دەستە بێت و خەڵکیش لێ ی پلە دوو بیت، بە پێچەوانەی خراپەکەی هیزە ئیسلامیەکان لەو پیکهاتانە زۆر نەرم ترن، ئەوەی ئێستا مەترسیە بۆ ئەزمونی کوردستان بریتین لە: بەرەی دیالۆك بەسەرۆکایەتی سالح موتلەگ، لیستی حەدبا بەسەرۆکایەتی ئوسامە نجیفی، لیستی عیراقیە بەسەرۆکایەتی ئەیاد علاوی، بەرەی تورکمانی.. ئەوانەش بریتین لە هیزە عەلمانی و پیش کەوتن خوازەو مەدەنیەکان بە پیّ ی ئەو وەسفەی کەسەرکردایەتی کورد پیشانی دابوو.

نابێ ئەوەشمان لەبیربچێت کە لە بنەچەدا شۆڕشەکانی کوردچۆن دژ بە داگیرو دابەشی کوردستان بوە ئاواش دژ بە عەلمانی بوە، چونکە زانیویانە مەینەتی کورد لە ئەستۆی عەلمانی دایە، مەلا سلیم وشیخ عبدالسلام وئەوەی شێخ سعیدی پیران بە ڕوونتر لە دادگاییەکەی دەردەکەوێ کەلە گۆڤاری (گێرشەم)بڵاوکرایتەوەو دەڵێت: ئێمە دژی داگیرکەروعەلمانیەت شۆرشمان کردوە، بەتایبەتی کەبینیم لە جریدەی(سبیل الرشاد)عبداللەجودت واحمدناوێك نوسیبویان:موسابەلەخۆبایی و عیسابەناوبانگی و محمد بەئەمینی ..هەریەکە ئاینێکیان هێناوە، ئێمەش دەتوانین ئاینێك بهێنین، ئەو جۆرە بانگێشانە لەڕۆژنامەکان تەنیبۆوە ئێمەش شۆرشمان دژ بەوانیش کرد[٤٠٧].کەواتە سەرکردەکانی کورد لە هەوڵی نەپساوە بووینە تائاین لە کوردایەتی جیا نەکرێتەوە، داگیرکەران بەردەوام لە هەوڵی لێکجیا کردنەوەی ئاین لە کوردایەتی بووینە، (ئاین شتێکەو سیاسەتیش شتێکی تر) دروشمی ڕۆژنامەی بەریتانی(تێگەیشتنی نویٚ ) بوو[٤٠٨]، تا میلەتی کورد پەرتەوازە بێت و توانای بەرگری نەمێنێت وبە ئاسانی داگیر بکرێت، لێك جیاکردنەوەی ئاین وسیاسەت وئاین وکوردایەتی لە ئوسولی بەرنامەی داگیرکەربوە تا ئەو

[٤٠٦] العراق فی مذکرات الدبلوماسین الأجانب ص١٢٩

[٤٠٧] دەقی گفت وگۆی دادگاییەکە لە: دراسات فی الحرکة الکوردیة المعاصرة ص٥١٢-٥٢٣

له ژمارەی رۆژی ١٢/کانونی یەکەم/١٩١٨ بە مانشێتەگەورەکەی وا هاتبور – سەرچاوە:کردستان فی سنوات الحرب العالمیة الأولی ص١٨٩

ساتەش، لەو لایەش خۆ پاراستن لە عەلمانیەت یەکێکە لە ئوسولەکانی بزوتنەوەی رزگاری خوازی کوردستانی

چارەم ـ لە پێکهاتەکانی عیراق ( شیعە و سوننە)[٤٠٩]: لەدوای دروست بونی دەولەتی عیراقی ئەو زاراوانەی وەك: کورد و عەرەب شیعە و سوننە بەچەوتی سەری هەلداوە، هەر لەسەرەتادا و لە نیو کۆنگرەی قاهیرە ١٢ ـ ١٩٢١/٣/٢٤ کە عیراقی پی دروست کرا، یەکێك لە پاساوەکانی بەرەی دژ بەکورد مس بیل، برسی کۆکس، ویلسون، بەرامبەر گەلالەکەی چەرچل ئەوەبوو کە ئەگەر کوردستانی خواروو نەخرێتە سەر عیراقی تازە ئەوا ناهاوسەنگیەکی فراوان لەنێوان سوننەو شیعە دروست دەبی، بەتایبەتی تازە شۆرشی (٢٠)کپ کرابۆوە، کە لە لایەن زانایانی شیعەوە سەرپەرشتی کرابوو، بەو شێوە دروست کردنی عیراق و دابەشی کوردستان چۆن گورز بووە لە کوردستان ئاواش لە شیعە، سەرەرای ئەوەش مانای ئەوە نیە هەمو شیعەیەك باش بوبیت و هەمو سونیەکیش خراپ بوبیت، ئینجا پیویستە ئەوەش روون بکریتەوە کە مەبەست لەعەرەبی سوننەی عەقیدە نیە بەلکو سوننەی کۆمەلایەتی، ئەگینا ئەو گوزرانەی لە کوردستان دراوە لەسەر دەستی ئەو پیکهاتەیە لە لایەن ئیسلامی سوننە نەبووە، بەلکو حزبی عەلمانی و ناشیونالیزمی بووینە، هەر بەنمونە حزبی بەعس کە بە سونە دەژمێررێت ئەوە باوەرپەتی: ئاینیان پێ رێگر و تێکدەر و رەجعی بوو، لە وەسیەتەکانی کۆنگرەی (٤)ی حزبی بەعس ١٩٦٠ هاتووە: (یعتبر المؤتمر الرجعیة الدینیة أحدی المخاطر الأساسیة أمام التقدم)

، بەلام بەشێ لە توێژەرەوان پێیان وایە سەرەرای ئەو هەلوێستە ترسناکەی حزبی بەعس بەرامبەر ئاین هەر سونیەکان(وەك زۆرایەتی لایەنگیری بووینە)، بەگشتی ئەو بەراوردانەی خوارەوە هەیە لە نێوان شیعە و سوننە سەبارەت بەکێشەی کورد:

---

[٤٠٩] ئەو دەستەواژەیە بە هەلەیی هاتوە ، دەبێ ئەوە روون کەینەوە کە مەرج نیە هەموو شیعەو سونەیەك وابن ، بەلکو ئەوە باس لە زۆرایەتی دێت .واتە دەسەلاتدار لە نێو ئەوانە تا ئیستا وابوە

١- هەمو ئەو پرۆسانەی دژ بە کورد کراو ن لەسەرەتای دابەشی کوردستان و لکاندنی بە عیراق و لەسەردەمی یەکەم راپەرینی شیخ محمود هەتا ئەنفال و کیمیایی ئەوا ئەو گوزرانە لەلای سوننەی عەرەب هاتووە نەك شیعە.

٢- سوننەی عەرەب لە عیراق زیاتر نوێنەرایەتی سەرخانی سایکس پیکۆو بۆ چوونی جامیعەی عربی و ڕەهەندی عەرەبی لە عیراق دەکا، کە تەیارێکی شۆڤینی و ڕەگەز پەرستە بەرامبەر کورد، کەچی شیعە کەمتر ئەو دریژکراوەی هەیە، ئەگەر هەشیبێت دەگەڕێتەوە بۆ ئیران و هند، کە خانەوادەی ئارین ئەوەندە رەگەز پەرست و دەمارگیرنین، لە جهانی ئێستای ئیسلام لەنێو دوو میللەت رەگەز پەرستی ماوە، کە بۆ خۆشیان بوویتە سەر ئێشەو ماندوو بون، ئەو دوانەش عەرەب و تورکن، هۆیەکەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە وەك (ابن خلدون و د علي وردي) وەسفیان دەکا و هەردوولایان لە بەهای بیابانی جزیرەی عەرەبی و جزیرەی مەنگۆلیا دەرپەڕیون، خاوەنی بەهاو نەریتی دەمارگیری ڕەوەندین، لەسەر ئەو بنچینە قوڵە سونە زیان بەخش بووینە وشیعەش سەلامەت بەرامبەر کورد

٣- هەرلەگەل جەنگی جهانی یەکەم ودەرچوونی فتوای جهادلە١٩١٤/١١/٧ لەلایەن شیخ الاسلامی عوسمانی (سەبری ئەفەندی و٣٠ زانای گەورە) دژ بە پەلاماری بەریتانیا بۆ ناوچەکانی بەسرە، ئەوا یەکسەر زانایانی شیعە و زانایانی کوردستان هاتنەدەست، لەسالانی١٩١٤–١٩١٦بەسوپایەکی هاوبەش لەناوچەکانی شوعەیبە رووبەرووی سوپای بەریتانیا بونەوە، بەڵام دوای لەبەر خیانەتی عەشایرو ئەفسەرەکانی وەك نوری سعیدوعلی جودت ئەیوبی ومولود مخلص وحکمت سلیمان و..کۆمەڵێکیش خۆیان بەدیل کردن دابوو، لەوانە:جعفر عسکری، نوری سعید، یاسین هاشمی، ناجی شوکت، صبیح نجیب، تەها هاشمی، جمیل الراوی، عارف فقطان، عبدالرزاق حلی، سامي الأرفلی، محمد أمین زکی، رشید خوجە.. کە دوای لە پاداشا بونە دەسەڵاتدار، ئەو سوپایە هاوبەشەی کوردو شیعەو عوسمانی شکستی هێنا، سەرکردەی سەربازی عوسمانی (سلیمان عسکری بەگ)خۆی کوشت لەڕکان، لەو کاتیەوە هاریکاری زاناو سەرکردەکانی کورد لەگەل زانایانی نەجەف و کەربەلا هەر هەبووە، لەدەوری سالانی بیست لەگەل (ا. محمد شیرازی) دوای ئەو لەسالانی ١٩٣٠ لەگەل (ا. محمد کاشف الغطاء)، دوای لەچلەکان لەگەل (ا. محسن الحکیم)، دوای ئەوانە لەگەل محمد باقر الصدر و نەوەی ئال الحەکیم، دوای ئەوانەش

